## پێشکەش

ئەم چیرۆکە پێشکەش بە دایکی پیشمەرگە بێت، کە هەمیشە چاوبەفرمێسک لە دڵەخورپێ دان و بە ترس و هیواوە چاوەڕوانی دەنگوباسی سەرکەوتن و سەلامەتی ڕۆڵە خەباتکارەکانیانن.

**گەلاوێژ**

## ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ئەشکەوتی دلێران

خوێنەری بەڕێز، دەمێک بوو حەزم ئەکرد چیرۆکی (بەرەو ئەشکەوتی دلێران) دووبارە چاپ بکەمەوە تاوەکو خوێنەرانی کوردستانی ئازیز بیخوێننەوە.
چاپی یەکەم لەک ۆتایی ساڵی ١٩٨٨دا بڵاوکرایەوە لە سوید و لەندەن و زۆر وڵاتانی ئەوروپا، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوکاتە کوردستانی شیرین لە بارودۆخێکی نالەباردا بوو بەدەست داکیرکەرانییەوە، بۆیە نەئەکرا بگاتە دەستی خوێنەرانی، لەبەرئەوە ئێستە زۆرم پێخۆشە کە چاپی دووەم ئەخەمە بەردەستتان، ئومێد دەکەم کە خەیاڵتان بەرنە ئەوکاتەی ئەم چیرۆکەی لێ پەیدابووە و لەگەڵی گەشتێکی ناو ئەو کەژوکێو و ئەشکەوتە سەربەرزانە و جێ و شوێنی ئەو پێشمەرگەقارەمان و دلێرانە بکەن.
خوێنەرانی بەڕێز، یەکەم چاپی بەرەو ئەشکەوتی دلێران ساڵی ١٩٨٦، مامۆستای نەمر ئیبراهیم ئەحمەد (باوکی هێرۆ) بۆی تایپ کردم بە دەستی خۆی بە تایپێکی سادەی ئەو ساڵانە، هەرچەندە دڵم نەهات کە ئەو نوسینە و تایپکردنەی ئەو بگۆڕم و سەرلەنوێ بە کومپیوتەر و کەرەستەی پێشکەوتوی ئێستا بنووسرێت، بەڵام کە سەیرم کرد زۆر کەموکوڕی تێدایە و لە هەندێ شوێن و سەردێڕ وردەکاری ئەوێت، بۆیە ڕاستم کردنەوە، واشم بە باشزانی کە سەرلەنوێ بنوسرێتەوە و تایپی یەکەمی ببێ بە یادگاری دەستوپەنجەی گرانبەها و ڕەنگینی و تاوەکو ماوم ئەو نووسینەی بخەمە سەرچاوەکانم و خەوی پێوە ببینم.

ئـازیزان، کـاتێ خـۆی کە دەسـتم کـرد بە نووسـینی بەرەو ئەشـکەوتی دلێـران، زۆرم پێچوو، نزیکی ساڵ و نیوێک زیاتر خەریکی بووم، بۆیە کە تەواو بـووم و بڵاوکـرایەوە، بەینێـک سـەرقاڵی نـامە و تەلەفـۆنی پیرۆزبـایی خـوێنەران بـووم، دەزگـایەکی بڵاوکـردنەوەی ئینگلیـزی پەیوەنـدییان پێـوەکردم و هـاتنە لام بـۆ ماڵەوە و گوتیان باسـی کتێبەکەتمـان لە دکتـۆر کمـال میراودەلییەوە بیسـتووە و دەڵێن کە لە کەژوکێوی سروشـتی بێ دەسـتکاری ئەچێت، هـاتووین قسـە لەوە بکەیـن کە بـیکەین بە فیلمـی سـینەمایی. دوای پشـوودانێک سـەیرم کـرد کەوا زۆریـان بیـر ئەکەم، هەروەک خـزم و کەسـانی زۆر خۆشەویسـتم لـێم دوور کەوتبنەوە بۆ شوێنێکی نادیار و خەریک بوو نارەحەت و دڵتەنگ ئەبووم بۆیان، بۆیە کە نامەی پیرۆزبایی شەهید کاک فاضل مەلا مەحمودم پێگەیشت کە تێیدا ئەڵێت: (چیرۆکەکەش هێشـتا، بە لای منەوە، تەواو نەبـووە و خـوێنەر بە تەمـای بەشێک، یان بەشانی تریەتی).

لەبەرئەوەی ئەم داخـوازییەی شـەهید کـاک فاضـلم دەسـتبەجێ پەسـەند کـرد و زۆریش پێـی خۆشـحاڵ بـووم کە بگەڕێمەوە نـاو ئەم خەڵکە خۆشەویسـتانەی بیـرم ئەکـردن، ئیتـر دەسـتم کـرد بە نووسـینی بەرگـی دووەم، ئەگەر چـی زۆر ماندوو بووم و سیحەتیشم هەندێ ناجۆر بوو، بەتایبەتی چـاوم، جگە لە ئەرکـی مـاڵ و منـداڵ و خێـزان، لەگەڵ ئەوەشـدا وازم نەهێنـا و بەرگـی دووەمـیش لە لەنـدەن و ئەوروپـا بڵاوکـرایەوە، کە بـاس لە کەوتـنە دووبەرەکیـی نـاو پـارتی ئەکات و دەستپێکردنی شـەڕی براکوژی لە بینی هەردوو باڵیدا، بـاڵی مەکتەبی سیاسـی،کە ڕۆشنبیر و پێشکەوتوخواز بوون بەشەکەی تری کە بـاڵی عەشـایری بوون، دوای ئەوەش بەرگی سێیەمیشـم نووسـی، کە باسـی لە هەرەس پێهێنـانی شۆڕشـی کوردستان ئەکات لە ١٩٧٥دا، ئەمیش ئامادەیە لە لەندەن بۆ چاپ و بە ئومێدی خـوای گەورە هەردوو بەرگە کە لە کوردسـتانیش بـڵاو ئەکرێنەوە. هەر سێ بەرگەکەش پاڵەوانەکان هەر هەمان کەس و خێزان.

خوێنەری بەرێز، لەگەڵ هەر دێڕێکی ئەم چیرۆکەدا یادگارییەکی شـیرین و لە بیرنەچووی (بـاوکی هێرۆ)ی خۆشەویسـتمی تێدایە و پێوەیە، کـاتێ چەنـد لاپەڕەیەکـم لە چیـرۆکەکە ئەنووسـی، دوایـی بـۆم ئەخوێنـدەوە بـۆ ئەوەی ڕای ئەوم بزانیـایە لەسـەری، هەنـدێ جـار کە زۆر ڕەزامەنـدیی خـۆی دەرئەبـڕی و

دەستخۆشی لێ ئەکردم، سوێندم ئەداو ئەمگوت بە خوا ئەوە لەبەر خاتری من وا ئەڵێت، توخوا ڕاستییەکەم پێ بڵێ و (مەترسە)، بە دڵ پێئەکەنی و ئەیگوت: نووسینی چیرۆکی وا خاتری تێدا نییە، چونکە ئەچێتە بەردەستی خەڵکی خوێندەوار و خەڵکی هۆشیار و ڕۆشنبیر، چۆن لە خۆڕایی ئەڵێن باشە!... ئیتر کە وای ئەگوت منیش دڵنیا ئەبووم. لێرەدا حەز ئەکەم زۆر زۆر سوپاسی گەرمی برای بەڕێز و خۆشەویستم کاکە حەمە ڕەسوڵ هاوار بکەم، چونکە ئەویش ئەزێتی لەگەڵ من کێشاوە و چیرۆکەکەی خوێندووەتەوە و بە سەریدا چۆتەوە کوردییەکەی بۆ ڕاست کردوومەتەوە، چونکە نووسینە کوردییەکەم زۆر تەواو نەبوو، زۆرتر عەرەبییەکەم باشتر بوو، لەبەرئەوەی لە خوراووی عێراق گەورە بووم، بەڵام لام وایە ئێستە و لە دوای نووسینی دە کتێبی چیرۆک وا بزانم نووسینەکە خراپ نییە.
ئیتر زۆر سوپاستان ئەکەم لەبەرئەوەی تووشی ئەم ڕوونکردنەوە دوورودرێژەم کردن.

**گەلاوێژ**
**سلێمانی**
**٢٠٠٠/٩/٨**

**خوشکی گەورە و بەڕێز گەلاوێژ خان**
**پاش عەرزی سڵاو...**

بەرەو ئەشـکەوتی دلێـرانم خوێنـدەوە، بە وردی و قـووڵی.. دێـڕ بە دێـڕ تـا دوایی چیرۆکەکە، خوێنمەوە و لەگەڵی ژیام، جارێکی تر بیرەوەری بەشێک لە منالّیم و سەردەمی لاویم هاتەوە یاد، بیرەوەری سەردەمێکی گرنک لە مێژووی گەلەکەمـان، کە (بەرەو ئەشـکەوتی دلێـران) زۆر جـوان لە ڕوانگەیەکـی نوێـوە وێنەی گرتووە، وا بزانم هە موو کەس خۆیـان یـان خێزانەکەی لەو سـەردەمەدا خەریکی کاری سیاسـی بوون، شـایەتی وردەکاری و سـەرکەوتوویی ئەدەن بە نووسـەری چیرۆک، ئەوەی زۆرتر لە هەمـوو شـت سـەرنجی ڕاکێشـام، دەوری ئافرەتـان بـوو، ئافرەتـانی سـادەی وەکـو دایکـم و پـوورم و کچەکـانی پـوورم، ڕەنگـــدانەوەی ڕووداوە سیاســـییەکان لە ژیـــانی خێزانـــدا و لە پەیوەنـــدییە ئینسانیەکاندا، گەشـەکردنی هۆشـی سیاسـی پیـر و لاو و منداڵی ئەو سـەردەمە، یاخوا دەستت خۆش بێت و قەڵەمت نەڕزێ. هیوادارم کە ئەمە تەنها سـەرەتای بەرهەمە بڵاوکراوەکەتان بیت! چیرۆکەکەش هێشتا بە لای منەوە تەواو نەبوو و خوێنەر بەتەمای بەشێک یان بەشانی تریەتی.

هەندێ سەرنج و پرسیاریشـم هەبوو دەربـارەی چیرۆکەکە، لە دەرفەتێکـی تـردا عەرزتـان ئەکەم بە گشـتی بـۆ مـن مـایەی خۆشـییەکی زۆر بـوو، دەمـێکە شـتێکی وام نەخوێنـدۆتەوە کەوا بە دڵ و گیـان لەگەڵـی بـژیم، کە مامۆسـتای گەورەمان لە پاڵ خۆیدا، گەوهەرێکی تریشی لە ئێمە شاردۆتەوە تۆی بەڕێز وا بەوردی و بەو شـێوە ئەدەبیـیە ڕەسـەنە و خۆمـاڵییە ڕووداوە سیاسـییەکان و ڕەنگدانەوەی کۆمەڵایەتیانت تۆمـار کردووە، جـارێکی تـر پیرۆزباییت لێ دەکەم و هیوای بەردەوامی و سەرکەوتنت بۆ دەکەم.

**لەگەڵ ڕێزو تەقدیری برایانەدا**

**دڵسۆزتان**
**فاضل ملا محمود**

**کتێب بە زمانی کوردی**
**نووسینی– گەلاوێژ بەرەو ئەشکەوتی دلێران**

لە چاپخانەی جەمال تایەر چاپکراوە بە پێی عەرەبی، ٤٠٤ لاپەڕەیە.
تێبینی: لە سوید چاکراوە، سەیری وشەی دوای بکە:
بەرەو ئەشکەوتی دلێران کە باسی ئەو ڕووداوانەی سەرەتاکانی ١٩٦٠ ئەکات کەلە کوردستانی عێراق روویداوە.
ساڵی ١٩٥٨حوکمی هاشمی کەوت، عێراق بوو بە جمهوری... کوردەکان بە چالاکانە لەو ئاڵوگۆڕەدا بەشدارییان کرد... هیوایەکی زۆریان هەبوو بە گەشپێدانی دیموکراسیەت لە عێراقدا و بەدەستهێنانی مافەکانیان و حوکمی تازە. پاش ٢ – ٣ ساڵ کۆماری تازەی عێراق لە هەموو ئەو بەڵێنانەی کە بە گەلی کوردی دابوو پاشگەزبووەوە، بۆیە کوردەکان دەستیان کرد بە ڕێکخستنی جووڵانەوەیەکی بەرگرییانەی بەهێز. کتێبەکە باسی چۆنیەتی لەدایکبوونی ئەو جووڵانەوەیە دەکات. نووسەر بە شێوەیەکی بلیمەتانە دەچێتە ناو ڕووداوەکان و بیروهەستی کۆمەڵانی خەڵک و جەماوەرەوە. ئەمەش لە ڕێگەی باسکردنی ژیانی خێزانێکی کوردەوە، کە لە ناو جەرگەی ساڵی یەکەمی ئەو جووڵانەوە بەرگرییەدا ژیاوە.
ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە هەستی نەتەوایەتی و شوناسنامەی مرۆڤی کورد چ ڕۆڵێک (دەورێک) دەبینێ. لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا پیاو دەوری سەرەکی ئەبینی لە کۆمەڵدا لە هەمان کاتیشدا ژنە گەنجە ڕۆشنبیرەکان، چالاکانە بەشداری ئەکەن لە بزووتنەوەی نەتەوایەتیدا...

بەرەو ئەشکەوتی دلێران، ڕۆمانیکی ئێجگار سەرنج ڕاکێشە و مەزنە، پڕە لە ڕووداو و بەسەرهات کە سەرنجی خوێنەر بە شێوەیەکی وا ڕائەکێشێ کە هەرگیز دەستبەرداری ڕۆمانەکە نەبێت تا ئەگاتە ئەنجام (واتە وازی لێ نەهێنێ لە خوێندنەوەی) لەڕووی زمانەوانیشەوە زۆر دەوڵەمەندە و پاراوە.. سەبارەت بەبێ هاوتای ڕۆمانەکە لە ڕووی ناوەڕۆک و چۆنایەتییەوە و وەزنی ئەدبییەوە کتێبەکە دائەنرێ بە یەکێک لە کتێبە بەنرخەکان و هونەرێکی مەزن و کتێبخانەی کوردی و زمانی کوردی دەوڵەمەنتر کردووە.

**محمدی مهتدی**
**تەرجەمەی نووسینی**
**سویدی**
**لە بارەی بەرەو ئەشکەوتی**
**دلێرانەوە**
**١٩٨٦**
**ستۆکهۆڵم**

## (پێشەکی)

دەربەدەری و غەریبی و دووره ولاتی و تاسه و ئارەزووی بینینی کەسوکار و خزم و ناسیاو
هاولاتی، وایان لێکردم که ئەم چیرۆکه بنووسم تا هیچ نەبێت به خەیاڵ بچمەوه ئەو شاخوداخه
جوانه و ناو ئەو خەڵکه خۆشەویسته.

چیرۆکەکەم به زمانی قسەکردنی ئەو کەسانه نووسیوه که ناویانم هێناوه و باسم کردوون و ناچار نەبوو بم کەلیمەی تازەم بەکار هێناوه، چونکه نەک هەر لام وایه که ئەبێ وابێ، بەڵکو به ڕاستی خۆشم حەز لەو نەوعه نووسین و قسانه ئەکەم، ئەو نوسین و قسانەی که خەجێ و فاته و عەول و قاله و ئاسکۆڵ به باشی لێی تێئەگەن.

جگه لەمه ئەم چیرۆکه به هیچ نەوعێک و جۆرێک هەق و عیلاقەی نییه بەسەر هیچ کەسێکەوه، کەوا ناوی له ناوی کەسێک بچێت که باسی تێدا کراوه و ئەو ناو لەیەکچوونانه تەنیا ڕێکەوته و هیچی تر، چونکه شەخسەکان و ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکه هەموو خەیاڵین، تەنیا له خەیاڵی ئەو ناوچەیه هەڵقولاون کەوا ماوەیەک تیایا ژیاوم، تەنانەت به هیچ جۆرێ هەقی بەسەر خۆشمەوه نییه و هەمووی له زرووف و وەزع و ژیانی ئەو سەردەمەی میللەتەکەمان وەرگیراوه، لەبەر ئەمه

تکایە کەس وانەزانێت کە شەخسەکانی داستانەکە خەڵکی ڕاستەقینەن. نەک تەنیا هەر ئەمە، بەڵکو گوێشم نەداوەتە ئەوەی کە باسی شەڕ و ڕاستییەکانیش لە ڕووی کات یا شوێن یا جۆری ڕوودانیانەوە بە تەواوی وەکو ئەوە بن کە بووە، چونکە من ویستوومە چیرۆک بنووسم نەک مێژووی شۆڕش یاخود بیرەوەری خۆم، بۆیە داوای لێبوردن ئەکەم.
ئیتر هیوام هەیە کە چیرۆکەکەتان بە دڵ بێت و لەگەڵیدا وەکو من بە خەیاڵ بگەڕێنەوە بۆ شار و شاخ و ئەشکەوتەکانی کوردستانی خۆشەویست و سەرێک لە پێشمەرگە دلێرەکانی بدەن.

**گەلاوێژ ١٩٨٦/٢/٢**
**لەندەن**

## ١

دەستی دایە عەباکەی و دای بەسەریدا، بە تورەییەوە پەلاماری تورەکەکەی دا و سۆلێکی کرد بەسەر پێیەوە، بەبێ قسەو بە بێ خواحافیزی کردن لە کەس چووە دەرەوە و دەرگاکەی بە قایمی دا بەیەکا. چەند هەنگاوێک ڕۆیشت و نەختێ ڕاوەستا، عەباکەی بە باشی دایەوە بە سەریدا و تورەکەکەی هەڵگرتەوە و کەوتەڕێ، بەڵام هەموو لەشی ئەکولا، ئەوەندە تەڕە بوو.

کۆڵانەکەی تەواو کرد و گەیشتە سەرجادەکە و سەیریکی ئەم لاو ئەو لای خۆی کرد، ئینجا پەڕییەوە ئەوپەڕی جادەکە گوتی: باشتر ئەوەیە  لە گەڕەکی خۆمانەوە دەست بکەم بە دابەشکردن...

ئاخ چی بکەم؟ بە ڕاستی ئەو خەڵکە ڕەحمیان نەماوە و دڵیان بە کەس ناسوتێت. دە وەرە توخوا ئەمە خوشکە! خوشک وا ئەبێت! بەم قرچەی گەرمایە و بەم نیوەڕۆیە ئەم کیسە زلەی بۆ پڕکردووم لە (نەشرە) و ئەڵێ دەی ڕووناک بڕۆ دابەشیان بکە. چییە وەڵا خانم خۆی کردووە بە شت و خۆی گەورە کردووە، کچەکە چۆتە حیزبەوە! توخوا بەشکم ئێستا پۆلیسێک یان ئەمنێک دیمی ناڵێت ئا وەرە کچەکە ئەو کیسە زلە چییە پێت؟ دەی ئەمجارەش قەیناکە... بەڵام جارێکی تر ئەگەرچی کردووە بۆی نابەم و هەقم نییە بە سەرییەوە!

ڕووناک بەدەمی خۆیەوە ئەیبۆڵاند و لە دڵی خۆیدا ئەم قسانەی ئەکرد، گەیشتە ماڵی یەکێ لەو کەسانەی کە وا سەبری خوشکی پێشتر ناونیشانەکانی پێ لە بەر کردبوو بۆ ئەوەی نەشرەیان بداتێ.

دای له دەرگـاکه و تـۆزێ ڕاوەسـتا... کەس نەبـوو، ئەمجـاره به قـایم تـر لێـی دایەوە، دیسان دەنگ نەبوو.. کەس نەهات دەرگاکەی لێ بکاتەوە. گووتی: ئەی.. دایکم خەڵک بۆ خۆیـان نووسـتوون، هەمـوو ئیسـراحەت ئەکەن، خۆ وەکو مـن نین! سەبری خان وائەزانێ دار و بەردین. ڕاستیان گوتووە (خەڵک سەگ بێت و برا و خوشکی بچوک نەبێت).

لەم قسانەدا بوو گوێی له دەنگی هـاتنه خـوارەوەی یەکێ بـوو له باڵەخـانەکەوە، که زۆر دوور نەبـوو له دەرگـای حەوشـەوە، دەرگـاکه کرایەوە و پووره فەهـیم (به ئــاخ و ئــۆف و وای ئەژنــۆم بــاوکەڕۆ خــۆ هەر نــاتوانم بەســەر پێــوه ڕاوەستم)ەوه هات و گوتی: ڕووناک.. گیان ئەوە خێره وابەم گەرمایه هاتووی؟!

ڕوونـاک چـووه ژوورەوە و دەرگـاکەی به ئانیشـک پێـوه دایەوە، تـوورەکەکەی کــردەوە و دوو بەســتەی ئەســتووری یەکــی به قەد کتێبێکــی دەرهێنــا که له کاغەزی بۆرەوە پێچاوه بوون. گووتی: به خوا پوره فەهـیم له مـاڵی کاکه عەلی برام بوو، ئەویش ئیشی هەبوو به ئۆتۆمبیل تا سەری کۆڵانەکه هێنامی و خۆی ڕۆیشـت. منـیش وا ئەم دوو کتێـبەم بـۆ دڵەخـان هێنـایه لای سـەبری خوشـکم بـوون. بەڵام توخـوا مەیـدەره دەست کەسـەوە له شـوێنێکی چاک بۆی هەڵگره، چونکه وا بزانم یەکێکیان کتێبی دینه و ناوی خوا و پێغەمبەری تێدا نووسـراوە، به قوربانی ناویان بم.

پووره فەهیم هەروەکو دەست بداته شتێکی پیرۆز و موبـارەک لێی وەرگـرت و ماچی کرد، تۆزێ نای به دڵیەوە و گوتی: ئۆ به قوربـانی ناویـان بـم، هەر ئێسـتا ئەچم له شوێنێکی زۆر باش قایمیان ئەکەم تـاکو دڵەگیـان دێتەوە. دایکی بمـرێ نازانم بەم گەرمایه ئەویش چووه بۆ کوێ گوتی، ئیشـم هەیه له مـاڵی کچێکی ڕەفیقم، لەوێشەوە پێکەوە ئەچن بۆ بـازاڕ، گـوایه قوماشـێکی زۆر جـوان هـاتووە بەشی دوو کراسی لێ ئەکڕن!

ڕووناک گوتی: باشه کەواته من به دوعا، با دوا نەکەوم ئێستا دایکم به تەمـامه. پووره فەیـم دەرگـاکەی داخسـتەوە ڕوونـاکیش تـوورەکەکەی چـاک بەسـتەوە و کەوته ڕێ دوای ئەوە له کـۆڵانی مـاڵی فەهـیمه خـان هـاته دەرێ که زۆر دوور نەبوو له جادەکەوە دیسـان خـۆی چاک کۆ کـردەوە و ڕۆیشـت زەردەخەنەیەک گرتـی و گـوتی: ئەم حەماڵییەمـان بەس نییه، وەره ئەم هەمـوو درۆ و بیـانوەش

بۆ هەر یەکەیان بدۆزەرەوە... مێشکمان دەفتەرە دەی با ئەمڕۆیش وا بێت، شەرت بێ جارێکی تر زۆرم لێ بکات بە باوکم و کاکە عەلیش ئەڵێم، بەڵام باوکم بەستەزمانە بڵێ چی، بە خوا دەرەقەتی نایەت. لەوە زیاتر کە تووڕە ببێت و تووشی دڵەکوتێ ببێتەوە، هیچ فایدەی نییە. خۆی نەخۆشیی دڵی هەیە، ئاخر ئەم نەخۆشییەی ئەو دەستی بەستووم، ئەگینا من ئەمەم قبووڵ نەکرد! بە خوا دایکیشم هەر لە سەر ئەو ئەکاتەوە، ئەڵێت: سەبری ئیشی خراپ ناکات بە هەر ئەقڵداری دونیای ئەزانیت، دیسانەوە بیری هاتەوە سەر ئیشەکەی و گوتی: با لەم کۆڵانە بچم باشترە و نزیکتریشە بۆ ئەسحابەسپی. زۆریشم تینووە لە ڕێگا ئەچمە ماڵی ئامە خانی پوورم بەفراوێک ئەخۆمەوە. ئەم کافرە هەرنەشیگوت بەم گەرمایە نەوەکو تینووت بێت ها ئەوە چەند فلسێک با پێت بێت بەشکم سۆدەیە، سیفۆنێک بخۆیتەوە. بە ڕاستی ئەم کچە ویژدانی نییە خۆشم ئەوەندە تووڕە بووم جزدانەکەم لە بیر چوو...

سەرەو خوار بووەوە بۆ ناو کۆڵانەکە، ئەوەندەی پێ نەچوو گەیشتە بەرماڵی ئامە خانی پووری. دەرگاکە کرابووەوە و پەردەیەکی پێوە بوو، با ئەیشەکاندەوە. خۆی کرد بە ژووردا، هەموو لەشی بووبوو بە ئارەق، دەموچاوی سوور بووبووەوە و دەستی سڕ بووبوو، قاچ و سۆڵەکانی هەمووی

بووبوون بە خۆڵ. چووە ژوورەوە سەیری کرد وا لەژێر خانەکە دانیشتوون.. پووری خەریکی چایە، نەسرینی کچی مەجەلەیەکی بە دەستەوەیە و کاکە حاجی باوکیشی شانی داداوەتە سەر سەرینێکی پەڕی زۆر گەورە لە لوولە قەدیمییەکان، کە ڕووناکیان دی هەموو ڕاپەڕین.

پووری خێرا چوو بە پیریەوەو بە پەرۆشێکەوە گوتی: ئای ڕووناک گیان ئەوە چیتە بەم گەرمایە هاتووی؟ ئینشاڵڵا خێرە! ئەوە چییە بە دەستەوە؟ داینێ و بڕۆ بەر بەلووعەکە شڵپێ ئاو بدە بە دەموچاوتەوە. دەی زووکە وای.. دایکت نەمرێت بۆ وات لێ هاتووە؟

ڕووناک چووە بەر بۆرێکە تێر دەمووچاو و قاچوقولی شت و بە چنگ نەختێ ئاوی خواردەوە، تۆزێ سەریشی تەڕ کرد. کاکە حاجی بە پەرۆشەوە جێی بۆ کردەوە و گوتی: وەرە ڕۆڵە گیان، وەرە لای منەوە. نەسرین هەر زوو

مەجەلەکەی فڕێ دا، هاتە لایەوە و  دەستی کردە ملی. دایکیشی چوو پەرداخێ ماستاوی ساردی بۆ هێنا. ئەویش بە دوو قوم خواردییەوە، ئینجا توورەکە و عەباکەی هێنایە لای خۆیەوە و پشوویەکی باشی دا.
کاکە حاجی ڕووی کردە ئامە خان و گوتی: دیارە ئەمە بەزمی سەبری خانە ئەم تلفەی دیسان ناردۆتە کۆلانان. ئامە خان گوتی: بڵێم چی.. بە خوا دە ڕۆژیش ئەبێت سەرم نەکردووە بەماڵیاندا،
بە ڕاستی ئەو کچە ناخۆشی کردووە، کەس ناتوانێ دەم بکاتەوە و نەسیحەتی بکات. کاکە حاجی گوتی: نەسیحەتی چی بێ قەزا بێ، ئەو ئێمە مانان بەبێ ئەقڵ و دواکەوتوو ئەزانێت! ئامە خان گوتی: کەس نامکوژێت خوشکەکەم نەبێت کە وەکو ئەوی لێ هاتووە و هەر لەسەری ئەکاتەوە.
حاجیش سەرێکی بادا و گوتی: خۆ حاجی مەجیدی براشم هەر بووە بە پەڕۆ و حەد و  وجودی نییە قسە بکات، سەبری خان و دایکی هەر ئەیخۆن.
ڕووناک گوتی: دەی مامە گیان دڵی خۆت عاجز مەکە، خۆم ئەزانم ئەم جارە چی ئەکەم. پووری گوتی: پێی بڵێ با خۆی بیانبات و خۆی ئیشەکانی خۆی بکات.
کاکە حاجی سەرێکی سەعاتەکەی کرد و گوتی: وا باشە منیش بکەومە خۆم، چونکە  ئەبێ بڕۆم بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی فریای نوێژی عەسر بکەوم. هەستایە سەر پێ و دەستی دایە کڵاو و جامانەکەی و ملی  ڕێگای گرت.

***

کاکە حاجی تەمەنی ٦٥ساڵ  ئەبوو، پیاوێکی کەڵەگەتی گەنمڕەنگی تۆزێ لاواز بوو، پیاوێکی بە حورمەت و کاسبی ماڵی خۆی بوو. دوکانێکی بچووکی هەبوو لە قەیسەری نەقیب، کووتاڵی ئەفرۆشت. چونکە زۆر  سەر ڕاست و بێفروفێڵ بوو، هەموو لادێی و نەشارەزا، هەر ئەچوونە لای ئەو. بۆیە زۆربەی  زۆری مەعمیلەکانی لادێی بوون.
کاکە حاجی دوو کوڕی هەبوو، نەورۆز و بەختیار، لە سانەوی و متەوەستە ئەیانخوێند. نەسرینی کچیشی تازە بووبوو بە موعلیمە. کچێکی بە حورمەت و فەقیر و بێدەنگی ئێسکسووکی سەر و پرچ جوان بوو، وەکو باوکیشی باڵابەرز بوو. هاوتەمەنی سەبری ئامۆزای بوو، بەڵام لە دڵی خۆیدا وەکو شتێ بەخیلی

پێ ئەبرد کە وا گەلێ باسی ئەکرێ. دایم ئەڵێن میوانی هەیە و خەڵکی لایە و زۆر ئەچێتە کۆبوونەوە و دانیشتنی حیزبییەوە، خەریکە ناو دەرئەکات زۆر جاریش ئەیگوت، بە خوا دایکم من وەکو ئەوم پێ ناکرێت، ئەو دەمی ئەڵێی مەکینەیە. لە هەموو شتێکدا خۆی تێ هەڵئەقورتێنێ و شتێک هەر چەندە ناهەقیش بێت وازی لێ ناهێنێت، تا قسەی خۆی ئەسەپێنێ بە سەر خەڵکدا. ئیتر من چۆن ئەتوانم هەر هێشووی لە دواوە بکەم.

بۆیە هەموو جارێک کە باسی سەبری ئەهاتەوە پێشەوە، نەسرین ئەکەوتە گلەیی لە حاڵی خۆی و لە دڵی خۆیدا ئەیگوت، فەقیر و بێدەنگ لەم زەمانەدا هەر بەش خوراو ئەبن. بە تەواوی بەغیلی لێ ئەهات، بەڵام لای کەس باسی سەبری نەئەکرد. هەر بە خۆی ئەگوت هەمووی خەتای خۆتە، تۆش تۆزی خۆت گورج بکەرەوە بزانە چۆن لەو باشتر ناو دەرئەکەی.

ڕووناک نەختێک پشووی دا و چایەکیشی خواردەوە، ئینجا گوتی: ئیتر ئەبێ بڕۆمەوە. پوری گوتی: کچێ ڕۆڵە، دە تۆزێکیکەش دانیشە با ماندوویەتیت بحەسێتەوە. ڕووناک گوتی: نە پووریێ گیان ئیتر بەسە، وا خەریکە دنیاش فێنک ئەبێ، بڕۆم باشە، ئیشم هەیە. هەستا خۆی کۆ کردەوە و توورەکەکەی هەڵگرتەوە. نەسرین و دایکی تا بەردەرگا چوون لەگەڵی و خواحافیزیان لێ کرد و ڕۆیشت.. ئامە خان گوتی: وەڵڵا ئەگەر ئەم سەبرییە تۆزێ جوانیش بوایە هەر هەموومانی ئەخوارد، بەڵام خوا بەوە ڕەحمی پێ کردووین کە جوانی نەداوەتێ، نەسرین هەڵی دایە و گوتی: بەڵام دایە بیرت نەچێ کە چەند شۆخ و باڵابەرز و سەروپرجێکی جوانی هەیە، دایکی گوتی: ئینجا خەڵک چی لە پرچ بکات ئێوە هەر بە تایەفە پرچتان جوانە، چوونەتەوە سەر دایکی باوکتان خوا عەفووی بکات، سەروپرچی بەناو بانگ بوو. نەسرین لە دڵا زۆری پێ ناخۆش بوو کە دایکی وا باسی سەبری ئەکرد، بەڵام زۆر خرس بوو. قەت شتی وای دەرنەئەبڕی.

## ٢

ڕووناک چوو بۆ ئەسحابەسپی بۆ ئەو ماڵەی کە سەبری پێی گوتبوو. ڕاوەستا لە بەردەرگا و بە مستەکۆڵە لێی دا. هەر زوو دەنگی کوڕێک هات گوتی: باشە.. باشە وا هاتم. بە ڕاکردن هات دەرگاکەی کردەوە و گوتی: ئەوە تۆی ڕووناک خان! زۆر بە خێربێی فەرموو وەرە ژوورەوە.

وەکو شتێک کوڕەکە ئەتوت ئەیزانی کە ئێستا شتی وای بۆ دێت. هەر کوڕە دەرگاکەی پێوەدایەوە، ڕووناک (٣) بەستەی دەرهێنا و گوتی: ها.. کاکە بێستون ئەم کتێبانەم بۆ تۆ هێناوە بە پەلە توورەکەکەی گرێ دایەوە و ویستی بچێتە دەرێ. بێستوون پێی گوت: دە وەرە پشوویەک بدە ئاوێ ساردییەک بخۆرەوە! ڕووناک گوتی: نە کاکە پەلەمە ئەبێ بڕۆم زۆر سوپاس، ئیشم هەیە، ئیتر هاتە دەرەوە، بە شپرزەییەکەوە سەیری دەوروپشتی خۆی کرد و گوتی: دە تو خوا وەرە خۆت مەکوژە! ئینشاڵڵا ڕۆژێک یەکێک لەم کوڕانە پەلامارم ئەدەن و ئابڕوویشم دەچێت، ئێستا بەشکم ناسیاوێک منی دی، ناڵێت ئەوە چی ئەکەیت لە ماڵی ئەم سێ کوڕە عازەبە؟!.

***

دونیا بەرەو فێنکی ئەڕۆیشت خەڵک هەروا خەریک بوون ئەهاتن و ئەچوون و چایخانە و بەردەرگای سینەماکانیش خەریک بوو قەڵەبالغ ئەبوون، هەندێ کەسیش بەردەرگا و حەوشەکانیان ئاوڕشێن ئەکرد. ڕووناک تۆزێ باری سووک بووبوو، بەڵام هێشتا بەشی دوو ماڵی تریشی پێ مابوو.

دووبارە بیری لێ کردەوە و گوتی: خوایە... ئەگەر بگەڕێمەوە دیسان ئەبێتەوە شەڕ و هەرا، تاکە سۆڵ و لنگە قاپقاپ ئەکاتە ماڵە دراوسێ! ئەمە هەمووی قەیناکە، ئێستا من چۆن ئەگەمە مەڵکەندی؟ وەکو ئەو ڕۆژە کە سەگەکە پەلاماری دام، خەریک بوو تورەکە و موورەکە فڕێ دەم لە ترسانا. کە باسم کرد وام بەسەر هات سەبری گوتی: قەیناکا کەرە ئاخر تۆ منداڵی، کەس شوبهەت ناخاتە سەر. بە دەم وای لێ کردم منی گەیاندە بەغدا و خەریکیش بوو بمکات بە دکتۆر و جلی دکتۆریشم لە بەر بکات. کە پێشم گوت بۆچی ئێوە ئەهێڵن هەر کتێب بکەمەوە، ئەمە دوو ساڵە من لە پۆلی شەش ئەمێنمەوە. ئیتر فاییدەی نییە. دەمی سەبری هەموو کەس شارەزای بووە. با بڕۆم دابەشیان

بکەم باشـترە ڕزگـارم بێت. بەڵام ئەگەر جـارێکی تـر هـاتم بـۆ ئەم ئیشـە خـوا بمکوژێ!.

هاتە سەر جادەکە و پەڕییەوە، ڕووی کردە پیرمەسوور لە ناکاو گوێی لە دەنگی ژنێک بـوو بـانگی ئەکرد: ڕوونـاک گیـان ئەوە ئەچی بـۆ کوێ؟ ئێستا خەریک بوو حەمە بنێرم بۆ لای دایکت کە پێی بڵێ جومعە ئێوارەکەی دێم بـۆ لاتـان، تـا بەیانی زوو نانەکەتان بۆ بکەم. ڕووناکیش بە تۆزێ حەپەسانەوە گوتی: ئۆ بـاجی پیـرۆز گیان ئەوە تۆی، چۆنی... چاکی؟! باجی پیرۆز گوتی: بە ساقەت بـم ڕۆڵە، بە بەختـی چـاک بـی. ئەوە بـۆ کـوێ ئـۆغر ئەکەی؟ ڕوونـاک گـوتی: ئەچـم بـۆ ئەو مـاڵە ئاشنایەمان، ئەویش گوتی: دیارە ماڵەکەیان لەم گەڕەکەیە، ڕوونـاک گوتی: بەڵێ ئـا ئەوەتـا لەو سـەرەوە. بـاجی پیـرۆز: دە باشـە خـوات لەگەڵ، بەڵام بییـرت نەچـێ بە دایکت بڵێی. ڕووناک: بە سەرچاو، بیرم ناچێ.

بـاجی پیـرۆز چەنـد هەنگاوێـک ڕۆیشـت و گەڕایەوە گـوتی: ڕوونـاک گیـان بە قوربان ئاگات لە خۆت بێت ئەگەر قەڵەبـاڵغییەک شـتێکی وات دی مەترسـە حەز ئەکەی بـا لەگەڵـت بێم. ڕوونـاک بە پەرۆشـەوە گوتی: قەڵەبـاڵغی چـی؟ بـۆ چـی بـووە خـوا نەکـردە بـاجی پیـرۆزم: تـۆ مەترسـە گیـانە، مـاڵی حـاجی کەریمـی دراوسێتان فەقیرانە لە نیوەڕۆوە پۆلیس و معـاون و موسـەلەحەی دونیایـان بە سەردا داڕژاوە. ڕووناک ڕەنگی هەڵبزرکاو مووچڕکێکی ساردی پیا هـات. لێوی وشک بوو بە شپرزەییەکەوە گوتی: وای فەقیرانە نازانی بۆچی؟ باجی پیرۆز بە ساقە، تۆ مەترسە، هیچی وا نییە و دووریشن لە ئێمەوە. ئێمە هەقمـان چییە بە سەر یانەوە. ڕووناک وەختە بوو دڵی ڕاوەستێت، گوتی: باشـە دەبڵـێ بـۆ وایـان لێ کردن؟ باجی پیرۆز: کچێ ڕۆڵە خەبەریـان لـێ داوە کە وا مـاڵی قاچاخی بـۆ هاتووە. ڕووناکی فەقیر ئاهێکی هاتەوە بەر و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: تو خوا؟... وەڵـڵا سـەیرە.. ئیتـر دەمـی تیکەڵوپێکەڵ بـوو، بە تەواوەتـی نەیئەزانـی کە چی بڵێت. لە پاشان گوتی: دەباشە باجی پیرۆز مـن ئەڕۆمەوە مـاڵێ، تـازە نـاچم بۆ ئەو ماڵەی ئاشنامان، تاقەتی پۆلیس و مۆلیسم نییە، باجی پیرۆز: ئەرێ وەڵڵا ڕۆڵە بە قوربانەکەت بم بچۆرەوە ماڵەوە باشترە!.

ڕوونـاک گەڕایەوە بەرەو مـاڵ، بەڵام هەرچەنـدی کـرد نەئەهـاتەوە سـەر خـۆی ئەوەندە بە قسەکانی باجی ترسـا بـوو، هەر گەیشـتە سـەری کۆڵانەکەیـان کەوتە

ڕاکردن و بەپەلە دای لە دەرگا. سەبری دەرگای لێ کردەوە و بە ڕوویەکی خۆشەوە لێی هاتە پێشەوە و گوتی: ڕووناک ئەوە تۆی! هەی ئافەرین کچی چاک.. باش بوو زوو هاتیتەوە. دەوەرە ژوورەوە دەی..
ڕووناکیش هەروا بە ماتومەلوولی چووە ژووری سەیری کرد گەسک و سەتڵ و سۆندە لەو ناوەدا بڵاوکراوەتەوە و لایەکی حەوشەکە و ژێردار هەنار تووەکە ئاو ڕشێن کراوە وەکو ئەوەی دادە سەبری خەریکی ماڵ پاکردنەوە و گەسکدان بووبێ! سەبری بە پێکەنینەوە گوتی: دەی کچی باش بۆم بگێڕەوە بزانم ئەمجارە چ فێڵێکت لێ کردن و چۆن خۆت دەرباز کرد؟ ڕووناک گوتی: با بچینە ژوورەوە ئەوسا بۆتی ئەگێڕمەوە. ئەمەی گوت و عەباکەی دانا. هێشتا ڕەنگی هەر هەڵبزرکابوو. سەبری لە پڕ چاوی بە پیرە توورەکە کەوت کە هێشتا شتی تێدا ماوە. بە شپرزەیی و تووڕەبوونێکەوە دەستی دایە و گوتی: هەی گیان! ئەمە چییە؟ ئەی بە ملی شکاوت ئەمە چوار سەعاتە لە کوێ بووی؟
ڕووناک: تۆ ڕاوەستە با بۆت بگێڕمەوە. سەبری: دەی فەرموو بیگێڕەوە!
هەی یاخوا داوەشێی. ڕووناک: وەڵڵا هەر خوا ڕەحمی کرد کە نەیانگرتم. لە پیرمەسوور پۆلیس ماڵانیان ئەپشکنی خەڵکیش هەروا خۆیان دوور ئەخستەوە لە ترسا، چونکە چەند ڕێبوارێکیان گرتبوو. منیش پۆلیسێک شوێنم کەوت و گرتمیشی بەڵام باش بوو خوا و ڕاستان لەو کاتەدا کاکە عەبە چاوی لێ بوو. ئەویش لەگەڵیان بوو ئیتر فریام کەوت. لە پۆلیسەکە توڕە بوو گوتی: چیتە بە سەر مناڵی واوە؟ سەبری چاوی زەق بوو گوتی: بە ڕاستی بەختمان بوو و خوا ڕەحمی پێ کردووین لە بەڵایەکی گەورە ڕزگار بووین! تۆزێ سست بوو، ڕەنگی تێکچوو لە جرت و فرتی خۆی کەوت. پاش نەختێ پرسی: باشە نەتزانی ماڵی کێ یان ئەپشکنی و بۆچی ئەگەڕان؟ ڕووناک: بە خوا باجی سەبری! من هەر خەمی کیسەکەم بوو، ئەترسام لە دەستمی بسێنن، بۆیە هۆشم لای هیچی تر نەبوو. لە پیرمەسوورەوە تا گەیشتوومەتە ئێرە ئەوەندە ڕاوەستاوم و پشووم داوە و دانیشتووم، نزیکەی دوو سەعاتم پێ چووە! سەبری بە تەواوی شڵەژاو دەستی دایە کیسەکەی لە مەڕ ڕووناک بیبات بیشارێتەوە، بەڵام هەر زوو پەشیمان بووەوە و گەڕایەوە، کراس و فەقیانەکانی هێنایە خوارەوە و عەباکەی دا بە سەریدا و گوتی: ڕووناک، من تا ماڵی کاک عوسمانی

دراوسێمان ئەچم، توورەکەکەشی هەڵگرت و چوو هەندێ کاغەز و زەرفیشی هێنایە دەرێ، ئەوانیشی تێخست و بردی و ڕۆی.
ڕووناک کە دی کەس لە ژوورەکانی نییە، چووە حەوشە و بانگی کرد: دایە.. دایکە گیان، دەنگ نەبوو! لە بەر خۆیەوە گوتی: دە برۆن دەی. ئەی هەر ئێوە کەیف بکەن و ڕابوێرن و منیش وەک
سەگی پێ سووتا و هەر بیهێنن و ببەن! دە بڕۆ سەبری خان تۆش بیخۆ، زەردەخەنەیە گرتی و گوتی: ئای لەو ئازا و قڕەقڕەکەر و شێری مەیدانە چۆن خەریک بوو، ببورێتەوە لە ترسانا! تۆزی
دانیشت و لە پڕ بیری کەوتەوە کە باجی پیرۆز سبەینێ دێت بۆ نان کردن.. لە دڵی خۆیدا گوتی: نەکا قسەکانیان بۆ بگێڕتەوە! خۆ ئەویش هێندە چەنەبازە لە هیچە حەکایەت دروست ئەکات.
ئینجا وەرە شتێکی دیبێ نەسیحەتی منی کرد بێ کە بگەڕێمەوە ماڵێ. بە خوا تا مانگێکی تر نایبڕێتەوە و هەر باسی ئەکا. هەر چۆنێ بێ پێش ئەوەی دەمی بگاتە سەبری من خۆمی ئەگەێنمێ و پێی ئەڵێم کە باسی نەکات.
ڕووناک لەم باس و خەیاڵانەدا بوو، گوێی لە دەنگی دەرگا بوو، چوو کردیەوە کاک سمایلی ئۆتۆمبیلچی بوو بە بەرچنەیەکەوە، کە ئەمی دی گوتی: ڕووناک خان ئەوە کاک حسەین ئەم بەرچینەیەی بۆ ناردوون و ئەڵێت ڕۆژی شەممە خۆشم ئەگەڕێمەوە، ئیشەکەم خەریکە سووک ئەبێت، ڕووناکیش بە خۆشییەکەوە گوتی: کاک سمایل یا خوا بەخێر بێی دەمێکە دیار نیت. دە فەرموو وەرە ژوورەوە . ئەویش گوتی: سوپاست ئەکەم، بەڵام ئەبێ بڕۆم، چونکە پاسەکەم لە بەر کۆڵانەکەدا ڕاگرتووە خەڵکیشی تێدایە. ئەبێ بیانگەیەنمە گەراج، بەڵام با بەرچینەکەت بۆ بهێنمە ژوورەوە تۆ نایتوانی.. دەستی دایە بەرچینەکە و هێنای لە بەر هەیوانەکە داینا. دەسڕەکەی دەرهێنا و تۆزێ دەمووچاوی پێ سڕی و چاوێکی بە حەوشەکەدا گێڕا و گوتی: ئەوە چییە ئەڵێی لە تۆ بەو لاوە کەسی  تر لەماڵەوە نییە؟ ئەرێ تو خوا خاڵ حاجی چۆنە؟ کاک حسەین دایم دڵی لە لایەتی و هەر ئەڵێت ئەبێت باوکم حاڵی چۆن بێت. ڕووناک: ئۆی بە ساقەی سەری بم یاخوا! بە خوا ئەوەندەی بیر ئەکەم . هەر ماڵەکەی بە جارێ چۆڵ کردووە. باوکم شوکر باشە، دیسانەوە سمایل پرسی ئەرێ ئەوە

داده سـەبری و پـوورە حەپسـەخان لە کـوێن؟ ڕوونـاک: وەڵـڵا تـا ئەم مـاڵەی دراوسـێمان چـوون. سـمایل، دە کەواتە مـن بە دۆعـا زۆر هەواڵـی خـاڵە حـاجی بپرسە و دەستی ماچ ئەکەم. ئەگەر پێم کرا پێش ڕۆیشتن سەرێکتان لێ ئەدەم. ئەوەندەی پێ نەچوو دیسـانەوە لە دەرگا درا، ڕوونـاک گوتی: ئەوە چییە؟ خۆ من هێشتا دانەنیشتوومەتەوە، ئیتر لێیدا چوو دەرگا بکاتەوە...

## ٣

ماڵەکەیان خانوویەکی قەدیمی بوو، حەوشەیەکی زۆر گەورەی بەرد و خۆڵی هەبوو، سەکۆیەکی خۆشی لە ناوەڕاستدا بوو، هەروەها حەوزێکی بچووکیشی تێدا بوو، کە هەر ڕاست لە کارێزەکەوە ئاو ئەهاتە ناوی وەک کانی وابوو، لە دەوروبەری حەوزەکە چەند درەختێکی توو و هەنار و مێوی جوانیشی لێ بوو. ئێواران ژێر دارەکانیان ئاوڕشێن ئەکرد و لاکێش و بەڕەیان لێ ڕائەخست و سەماوەریان لێ دائەنا، کە میوان و خزمیشیان ئەهاتن شەوان تا درەنگ لەوێ دائەنیشتن و نانیشیان هەر لەوێ ئەخوارد، دەرگاکەیان دوو دەروازەیی گەورەی قەدیم بوو، کە لە دەرگایان ئەدرا ، خەڵک تۆزێ پێی ناخۆش بوو، چونکە ئەبوو ئەو هەموو حەوشە گەورەیە ببڕی تا بچێ

بیکاتەوە. جاران بە ڕۆژ هەر کراوە بوو، چونکە گەڕەکەکەیان زۆر ئەمین بوو دەرودراوسێکانیشیان وەک خزمیان لێ هاتبوو. هەر لە دەمێ ساڵەوە پێکەوە بوون و هەر لەو خانووەدا لەدایک بوون و گەورە بوو بوون. بەڵام ئەوەتەی کوڕەکان حزبایەتیان دەست پێ کردووە دەرگاکە هەمیشە دائەخرێت. ئەڵێن هەرکەسیش کە هات ئەبێ بزانن کێیە ئەوجا دەرگای لێ بکەنەوە. هەمیشە ڕووناکی فەقیر ئەبێت ڕابکات دەرگاکە بکاتەوە، لەبەرئەوە هەرچەند لە دەرگا ئەدرا ڕووناک ئەیبۆڵاند و ئەیگوت: کە حالتان وایە دەرگاوانێک بۆ خۆتان پەیا بکەن قاچمان شکا!.

ڕووناک کە دەرگاکەی کردەوە، دایکی خۆی کرد بە ژووردا لەگەڵ کچەکەی عوسمانی دراوسێ یاندا. چینییەکی گەورەی بە هەر دوو دەست هەڵگرتبوو خاولییەکی پاکی پێدا درابوو. هەر لە دوورەوە ڕووناک زانی ئەمە کولیچەیە، چونکە بۆنی حێلی لێ ئەهات. دایکی بە دڵێکی خۆشەوە گوتی: ئۆخەی (نوونە گیان) ئەوە شوکر هاتوویتەوە؟ ڕووناک: بەڵێ دایە گیان دەمێکە هاتوومەتەوە..

ئەی ئێوە ئەمە چیتان کردووە؟ بۆنی شتێکی خۆش دێت! دایکی گوتی: بە ساقە باجی سەبریت ئیمڕۆ میوانی دێت چووم لە ماڵی کاک عوسمان لەگەڵ حەلاو و مناڵەکان تۆزێ کولیچەمان بۆ کردن.

هاتنە هەیوانەکە و ڕووناک قاپەکەی لە دەست کچەکە وەرگرت، دایکی چاوێکی گێڕا و گوتی: ئەی کوا سەبری؟ ئەیەڕۆ.. بزانم هێشتا هەر هیچی نەکردووە!

ڕووناک بە سەرسامییەوە گوتی: چۆن ئەی خۆ ئەو بە منی گوت تا ماڵی کاک عوسمان ئەچم ئەی لای ئێوە نەبوو؟! دایکی: نەوەڵڵا کچم بۆچی چی بووە؟ ڕووناک: نازانم... ئەڵێن ماڵان ئەگەڕێن ئەویش دڵی کەوتە مەراقەوە، وا بزانم چووە هەواڵ و دەنگو باس بپرسێت. دایکی تۆزی ماتبوو.. گوتی ئەمە کێ گوتی؟ کچێ ڕۆڵە ئەوە درۆیە.. ئەبێ کێ ئەم درۆ زلەی کردبێ! ڕووناک: وەڵڵا دایە درۆ نییە من خۆم ئاگام لێ بوو بە چاوی خۆم بینیم لەبەرئەوە زوو هاتمەوە و ئیشەکانیشم تەواو کرد، دایکی تۆزێ شڵەژاو گوتی: دەی ڕووناک قاپەکە بەتاڵ بکە بۆ گوڵەخان با بڕواتەوە دایکی چاوەڕێی ئەکات. هەر (وەکو شتێ ویستی کچەکە زوو بڕوات و گوێی لەم قسانە نەبێت). ڕووناکیش چوو بۆی بەتاڵ کرد، خاولییەکەی بۆ قەد کرد و خستییە ناوی و گوتی: ها گیانە ئێستا دایکت چاوەڕێت ئەکا، خوات لەگەڵ. کە هەر خۆیان مانەوە گوتی: ئێ دە بۆم باس بکە بزانم چی بووە؟ ئەویش عەینی شت چۆن بۆ سەبری گێڕابووەوە، واشی بۆ دایکی گێڕایەوە و ئەمەشی خستە سەر (بەس نەبوو ڕزگارم بوو بەڵام بەو خوایە ڕۆژێ هەر تووشی ئەبم..) دایکی: قەزاوبەڵا دوور نوری محەمەیی شەریف ئینشائەڵڵا چاویان کوێر ئەبێت و کەس ناتبینێت. ڕووناک: یا خوا وا بێت. دایکی تۆزێ ناڕەحەت بوو بەڵام زۆر لە سەبری باشتر بوو، وەک ئەو نەترسا، پاش نەختێ بێ دەنگی گوتی: دەی بە قوربان وەرە با حەوشەکە تەواو بکەین نەوەکو میوانەکان بێت. ڕووناک: میوانی چی؟ بە خوا ڕەنگە هەر یەکەیان ئێستا لە کونێکدا خۆی شاردبێتەوە. دایکی: بۆچی چی بووە؟ قوڕیان بەسەر وا دە پانزە کەسیان گرت قابیلە هەموو شارەکە بگرن کچێ وەرە هەر گوێشی مەدەرێ!.

حەپسەخان چووە حەوشە و سەتڵ و جامەکەی هەڵگرت و چوو بۆ لای بۆری ئاوەکەوە. ڕووناکیش هات بۆ یارمەتیدانی، دایکی گوتی: ئەم بەرچینەیە چییە وا لەم هەیوانە دانراوە؟ بە خوا ڕۆڵە ئەوەندە شڵەژام لەم قسانە هەر نەشمدی. ڕووناک بە خۆشییەوە گوتی: ئۆ لە دەوری گەڕیم ئەوە حسەین گیان بۆی ناردووین. پێش ئەوەی تۆ بێی سمە هێنای. حەپسەخان لەسەرخۆی گوتی: ئۆ لە دەوری سەری گەڕێم خوایە، ئەی نەیگوت کەی دێتەوە؟ ڕووناک: بەرێ وەڵڵا گوتی:شەممە، واتە دووسبەی ئەگەڕێتەوە، گوتیشی کەوا زۆرمان بیر

ئەکات. حەپسەخان لە بەر خۆیەوە گوتی:  ئەی دایکت بمریٚ ئاخۆ حاڵی چی بیٚ. ئیٚستا لە گەرمای ئەو شارەزوورە و بە دیار مەرەزەوە؟ ڕووناک: کویٚر بم یا خوا باجی سەبری سەر ئەکاتە سەری و شەڕی لەگەڵ ئەکات!؟ دایکی: وا مەڵیٚ ڕۆڵە سەبری فەقیر کەی قسەی کردوە؟ هەمیشە  هەر ئەو لە سەبری تووڕە ئەبیٚ.. ڕووناک: هەڵی دایە و گوتی: ئاخر لەبەر کردەوەکانی لیٚ تورە ئەبیٚت، هەموو ڕۆژیٚک هەر لە دەرەوەیە و خەریکی کۆبوونەوەیە، خەڵکیش قسە ئەکەن!! دایکی بە هەڵچوونەوە گوتی: ئەو خەڵکی لەبەر کۆبوونەوە قسەی پیٚ ئەڵیٚن با سەریان بدەن لە بەرد، ئەی ئەگەر سەبری وا نەکات و تۆش بەشی خۆت نەکەیت، من و ئەم و ئەو ئەبیٚ هەر وا دانیشین سەرشۆڕ بین و هەر ئیشیٚکیان دا بەسەرمانا بڵیٚن لە بەیک و ملیان بۆ کەچ بکەین. نەء پیٚویستە خەڵک فیٚر بکەین و هەموو وریا ببنەوە. سەیری وڵاتانی تر بکەین، بە زیاد نەبیٚت بۆچی ئیٚمە چیمان لەوان کەمترە؟! ڕووناک لە دڵی خۆیدا گوتی: کوڕە بابە بە خوا سەبری دایکمیشی گۆڕیوە و مەدەنی کردووە! قوڕ بە سەرمان ئیتر چۆن دەرەقەتی هەردووکیان دیٚن!

خەریک بوون لە حەوشە پاک کردنەوە ئەبوونەوە، کە سەبری هاتەوە، دیار بوو زۆر هیلاک و ماندوو بوو، بەڵام ڕووی خۆش بوو، بە پیٚکەنینەوە هاتە ژوورەوە و گوتی : کچیٚ هیچ نەبوو شوکر بۆ ماڵی قاچاخ گەڕاون، ڕووی کردە ڕووناک گوتی: ئەوە کە تۆشیان گرتووە وایان زانیوە لە ماڵی ئەوان بووی، چونکە هەندیٚ شتیان بڵاوکردبووەوە بەسەر خزم و کەسیانا و دەربازیان کردبوو، بۆیە دوو... سیٚ کەسیان گرتووە کە کیسە سەعات و ڕادوێیان پیٚ بووە، ڕووناک لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەی قور بەسەرم نەبیٚت ئەوە چ زوو وا هەموویت لە بەر کرد؟ سەبری گوتی: دایە گیان تۆ برۆ واز بیٚنە ئیتر من و ڕووناک جیٚگاکان چاک ئەکەین. چۆن بەرەو لاکیٚش و شتەکانیان هیٚنا و خەریکی چا و سەماوەر حازرکردن بوون و چەند کورسییەکیان هیٚنا لە دەوروبەری حەوزەکە.. دایکیشیان چووە سەر سۆکەکە خەریکی جیٚ داخستن بوو. تەختەیەکی گەورەی داریان لیٚ دانابوو و لەگەڵ یەک دوو قەرەوێڵەی یەک کەسی شویٚنیٚکی فیٚنک و خۆش بوو، تا پاییزیٚکی درەنگ لەویٚ ئەنووستن.

سەبری چوو دەست و دەمووچاوی  شت و جلی گۆری و گۆبەرۆک و مێخەک بەنگی کردە مل.
هەروەها دایکی و ڕووناکیش خۆیان گۆڕی.
بوو بە دەوری سەعات شەشی ئێوارە باوکیشیان گەڕایەوە لە بازاڕ و مزگەوت. ڕوونــاک بەخێرهــاتنی کــرد و باوەشــی پێــدا کــرد ، ژنەکەشــی هەروەهــا بە ڕووخۆشــی چــوو بە پیــرییەوە. حــاجی چــاوێکی گێــڕا گــوتی: ئەوە چییە ئەڵێی ئەمشــەو میوانمــان هەیە، تۆزێ مــات بــوو ڕووی کردە ژنەکەیی و بە ئەسپایی گوتی: وا دیارە دیسان دیوەخانی سەبری خانە! ژنەکەی بە نیوە تووڕەبوونەوە گوتی: ئەی خەڵک میوان دەرئەکات! حــاجی گــوتی: نەوەڵا دەریــان نــاکەن، بەڵام ئەبێــت میــوانیش حســابێ بــۆ خاوەنمــاڵ بکــات، ئــێمەیش پیــرین و هیلاکــین و ئەمــانەوێ تــۆزێ ئیســراحەت بکەیــن. حەپســەخان گــوتی: توخــوا ئینجــا چ ڕێگایەکیان لە تۆ گرتووە گەنجن بۆ خۆیان ئەچنە لای یەکتری و ئیشیان هەیە. حاجی سەری بادا و گوتی: ها تەیارە دروست ئەکەن لە قسەی قۆڕ و حیلکە حیلک زیــاتر هیچــی کەیــان نییە، تــا نیوەشــەو دائەنیشــن و نــایەڵن کەس چــاوی بچێتە خەو! حەپسەخان تووڕە بوو گوتی: ئۆی پیاوەکە دیسان وا دیارە بەزمت پێیە دایــم تــۆ بــۆڵەت دێ. ڕوونــاک گەڕایەوە لای دایــک و بــاوکی و گــوتی: بــابە گیــان ئەوە چیتە؟ دایکی گوتی: دیســان بــۆڵە بــۆڵی دەست پێکردووە! ڕوونــاک جوابی دایکی نەدایەوە ڕووی کردە باوکی گوتی: خــۆت نــاڕەحەت مەکە فایدەی نییە، سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: ئەبێ خۆمان ڕابهێنین!.
ئەوەندەی پێنەچوو میوانەکانی سەبری هاتن و هەر لە دوورەوە قاوقیژ دەستی پێ کرد، بە دەنگی پێکەنین و بەخێر هــاتن و وەڵڵا ڕۆحمــان چــوو ئەیەڕۆ ئەو خەبەرەی نیوەڕۆ چی بوو کردیان بە هەرا. حەپسەخان چوو بۆ لایان و بەخێر هــاتنی کــردن و ســەبری بانــگ کــردە ئەولاوەو گــوتی: ڕۆڵە ئەگەر باســی بە نەوعێــک ئەکەن بچــنە ژوورەوە و دەرودراوســێ هەموویــان لە حەوشــەن و لە ماڵن. سەبری گوتی: باشە دایە جــارێ هیچمــان نییە. ئیتــر دانیشــتن شــەوەکەیان وەک زۆر شەوانی تر بە قسە و گاڵتە بردە سەر.
حاجی بەیانی زوو هەستا و نوێژەکەی کرد، بەرچایی خوارد و خۆی کۆکردەوە و کە بڕوات بۆ دوکان. حەپسەخان پێ گوت: چاوت لێ بوو، بێ قەزابی ئێوارێ

هەر لە خۆڕایی خۆت تووڕە کرد، توخوا هیچ نارەحەتیان کردیت؟ ئەویش گوتی نەوەڵڵا بۆچی نارەحەت ئەبم خوا بکا هەروا دیوەخان گەرم بێت، من ئەوەندەم نەماوە نەخۆشیی دڵم هەیە، هاکا بەلادا هاتم، بەڵام ئاخ خۆزگە چاوم لێت ئەبوو کە سەبری چ پەتپەتێنێکی پێ ئەکردی...! قەیناکە هەر لەسەری بکەرەوە و کەتنەکانی بۆ داپۆشە! حەپسەخان قورگی پڕبوو لە گریان و گوتی: خوا نەکا یا خوا مەرگم پێش مەرگت کەوێت و قەزات لە هەموان. ئەگەر تۆ نەبی ئیمە بۆ چی چاکین! حاجی وەڵامی دایەوە و
گوتی: دڵی خۆت عاجز مەکە، بەڵام لەدواییدا قسەکانمت دێتەوە بیر. لێیدا و ڕۆیشت حەپسەخانیش پاش تۆزێ گریان چاوی سڕییەوە. دانیشت لەبەر سەماوەرەکەدا، لە دڵی خۆیدا گوتی: بە خوا جوانیان گوتووە (قسەی حەق ڕەقە).
ڕووناک هەستا و سەبریش دوای ئەو هەستا و نانەکەیان خوارد وماڵەکەیان کۆکردەوە. سەبری گوتی: دایە من تاماڵی ئەو ڕەفیقەم ئەچم، حەپسەخان خۆی تۆزێ گورج کردەوە و گوتی: ڕۆڵە ئەمە کامیانە، ئەی ئەم شەو هەموو پێکەوە نەبوون؟ سەبری بە سەرسوڕمانێکەوە گوتی: ئەمە چییە دایە بزانم کەوتیتە پرس و پرسیار؟ ئەمە کەی وات لێ هات؟ دایکی گوتی: وەڵا ڕۆڵە بڵێم چی خەریکن ناخۆشی ئەکەن ئەی نازانی سبەینێ نان ئەکەین و ئەبێ تۆزێ خۆمان کۆکەینەوە
حسەینیش دێتەوە، سەبری سەری سوڕما لەم گۆڕینەی دایکی. جواب دایەوە و چووە ژوورەکەی.
خۆی کۆکردەوە و عەباکەی گرت بە دەستەوە گوتی: خوا حافیز ئەوەندەم پێ ناچێ زۆر زوو دێمەوە. سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و گوتی: هەی هوو هەی هوو هێشتا سەعات نۆی بەیانییە. دایکی و ڕووناکیش سەیرێکی یەکترییان کرد، ئەویش دەرگاکەی دایەوە بە یەکا و ڕۆیشت. دایکی هەر وا بە ماتی دانیشت و دەستێکی خستە سەر دەستەکەی تری. ڕووناک هاتە لایەوە و گوتی: دایکە بۆ وا عاجزی؟ دایک گوتی: وەڵڵا ڕۆڵە زۆر سەرم سووڕ ئەمێنێ لە چوونە دەرەوە و میوانی ئەم کچە، ڕووناک بە شەیتانییەکەوە گوتی: قەی چی ئەکا دایە باجی سەبری ئیشی خراپ ناکات ڕەنگە ئیشی حیزبایەتییان هەبێ و شەوێ

تەگبیریان کردبێ کە ئەمڕۆ لە شوێنیک کۆببنەوە. دایکی بە ماتییەکەوە گوتی: هیچ ناچێتە ئەقڵەوە ئەمە هیچ حیزبایەتی نییە. چۆن حیزبایەتییەکە ئەم هەموو خۆ گۆڕین و فڕک و هووڕە؟! دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئۆی کوێراییم دایە کە عەزەی برام حیزبایەتی ئەکرد ئەوەی ئەو ڕاست بوو، هەموویان ئەوەندە بە ڕێکوپێکی ئیشیان ئەکرد هیچ کەس ئاگای لە هیچ کارێکیان نەبوو. بە خوا زۆر جار بە هەفتە میوانێکی ئەهات، هەندێکیانمان ئەبردە سەردکتۆر. کەلوپەل و شتمان بۆ ئەکڕین و بەڕێشمان ئەکردن لەدوای چەند مانگێ ئەمانزانی کە ئەمانەن پیاوی قاچاغ بوون،لە برا کوردەکانی ئێرانمان هاتبوون لێرەوە دەربازیان بکەن کە بڕۆن بۆ دەرەوەی وڵات.

ڕووناک دەستی کردە ملی دایکی و گوتی: توخوا دایە گیان مەگری و دڵی خۆت نارەحەت مەکە، بزانین خوا چی ئەکات ئیتر با هەستین ئەمڕۆ نان ئەکەین، نەوەڵڵا باجی پیرۆز ئێوارە دێت و لێرە ئەنوێت تا بەیانی زوو هەستێت، خۆی وای گوت. دایکی گوتی: قەیناکە ڕۆڵە ئەگەر چی پێشم خۆش نییە لێرە بنوێت دەمی زۆر شڕە، حەز ناکەم بەم جرتوفرتەی سەبری بزانێت، بەڵام دەسەڵات چییە ئافرەتی تایەن ئەم شەو لە ماڵان نووستنەی کردووە بە مۆدە. خەڵک زستانان وائەکەن لەبەر بەفر و سەرما کە ناتوانن بەیانیان زوو بگەنە ماڵان کەچی ئەم بە هاوین وا ئەکا! بۆیە ئەترسم شتێکی لە ژێرسەردا بێت. ڕووناک گوتی: نا دایە گیان باجی پیرۆز فەقیرە، هەر ئەو عەییبەی هەیە کە زۆر بڵێیە، بەڵام من هیچ ترسی خراپەی لێ ناکەم. خوانەکردە ئەگەر وا بوایە هەر کاکە حەمەی کوڕی لە ناو ئەبرد. نازانی دایە کوڕێکی چەند پاک و دڵسۆزە! هەموو مەدحی ئەکەن. ئەی نابینی دایم لەگەڵ کاکە علی و کاک حسەینە؟

حەپسەخان و ڕووناک دەستیان کرد بە هەندێ ئیشوکاری ناو ماڵ و ڕووناک گوتی: دایە گیان با ئەمڕۆ شتێکی خۆش لێ نێین لە بەر باوکم گوناحە.. ئەوە چەند ڕۆژێکە چێشتێکی بە دڵی ئەومان لێ نەناوە.

دایکی گوتی: باشە ئەمڕۆ هەر خۆشم قەرارم دابوو کە یاپراخ لێ نێم، دەبچۆ بەشکو تۆزێ گەڵامێوی جوان بکەیتەوە لە مێوەکە، بەڵام هێشتا ڕووناک نەجوڵابوو ئەو گوتی: نەوەڵڵا ڕووناک گیان جارێ بڕۆ کەوا و سوخمە قۆڵدارەکەم بۆ بێنەوە لای وەستا ئەحمەد. لە ڕۆژی شەممەوە ئەڵێ تەواو بووە.

دەستێکی دا لە شان و قۆڵی و گوتی: شەو ساردی کردوە ئەم بەیانییە هەر بە تەواوی سەرمام بوو، کە هەستام بۆ نوێژ. ڕووناک گوتی: باشە دایە گیان هەر ئێستا ئەچم بۆت ئەهێنمەوە، بەڵام تا من خۆم کۆ ئەکەمەوە بیر بکەرەوە بزانە هیچی ترمان پێویستە لە بازاڕ با جارێکی تر نەچمەوە. دایکی گورج گوتی: نەی گیانە هیچ ئیشی کەمان نییە.. بەڵام ئەگەر ئەتوانی سەرێکی پوورە ئامینەت بدە، خۆت ئەزانی ئەوە چەند ڕۆژێکە نەهاتوون و نە دەنگیان بووە، نەوەکا خوانەکردە نەخۆش بن یان شتێکیان بە سەر هاتبێت. ڕووناک گوتی: بەسەر چاو من خۆشم زۆریان بیر ئەکەم. عەباکەی هەڵگرت و لێ دا ڕۆیشت، لەبەر خۆیەوە ئەیگوت (دەمە هەراشەکەی سەبری کەسی پێوە نەهێشتووین).

## ٤

ڕووناک لە پێشا سەرێکی ماڵی پووری دا و پێی گوت کەوا دایکی بیریان ئەکات. ئەویش گوتی: وەڵڵا خۆشم دام نابوو کە ئەمڕۆ بێین بۆ لاتان. ڕووناکیش گوتی: توخوا پووریێ گیان هەمووتان وەرن! نەسرین لە هەیوانی باڵەخانەکەوە قیژانی گوتی: ئەی چۆن نایەین بە خوا تاقمان لێرە نامێنین! ڕووناک گوتی: یا خوا بەخێر بێن. لێی دا چوو بۆ ماڵی وەستا ئەحمەد. باش بوو ژنەکەی لە ماڵ بوو کەوا و سوخمەکەی دایکی وەرگرتەوە و پارەکەی دایە و خواحافیزی کرد. هاتە دەرەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی ئەوە چۆن بوو دیسان نەیانگوت بە خوا تەواو نەبووە وەکو جارانی تر! ماڵی ئاوا بێ هەرجارە بیانوویەکی تازەی ئەدۆزییەوە، جارێ ئەیگوت نەخۆش بووم، جارێ ئەیگوت مەکینەکەم شکابوو، جارێ ئەیگوت چووم بۆ لادێ بۆ سەر تەعزێ. ئیتر خەیات هەموو وەهان! بەڵام وا شوکر ئەمجارە بەختم باش بوو. ڕووناک کۆڵانەکەی بڕی و خەریک بوو بگاتە سەر جادەکەی بەر مزگەوتی گەورە، کە سەیری کرد لە جاران قەرەباڵغتر دێتە بەر چاوی، بە تایبەتی جگە لەوانەی لەم لاو لادا سیان، سیان و چوار چوار وەستابوون، کۆمەڵێکی بیست، سی کەسیش لە دەوری چەند کەسێ کۆبووبوونەوە دەنگە دەنگیان بوو. ڕووناک گوتی: یا حافیز دیسان چی قەوماوە! ئاخۆ ئۆتۆمبیل کێی شێلا بێ؟ بە ڕاستی ناخۆشیان کردووە، ڕۆژ نییە ئەم ئۆتۆمبیلچییە ڕەزا قورسانە یەکێ نەکەن بە ژێرەوە، هەرکەس هەستا و دوو عانەی بوو ئۆتۆمبیلێکی کڕی. هەروەک شێت لەناو ئەم کۆڵانە و بەسەر ئەم جادە قەرەباڵغانەدا کەوتە جرتوفرت بێ ئەوەی زۆریشیان بە تەواوی بزانن لێخوڕین چییە! ڕووناک بەپەلە خۆی گەیاندە کۆمەڵەکە، کە سەیری کرد دوو، سێ عەسکەر سەرو تێلایان بەدەستەوەیە و دوو لادێییان داوەتە پێش خۆیان کە هەر یەکە بارێ داریان پێیە و چەند مریشک و کەڵەشێرێک بەسەر بارەکەوەن. ئیتر ئەوە عەسکەرەکان هەر ئەماڵن بە سەر و گوێلاکی لادێییەکانا، ئەوانیش نازانن چی بکەن لەوە بەولاوە کە خێراتر بڕۆن. خەڵکەکەش کە بە دوایانەوەن کەسیان ناوێرێ دەم بکاتەوە و بڵێ ئەو چییە و بۆ لێیان ئەدەن! هەندێ سەرشۆڕ ئەکەن و ئەڕۆن. هەندێ هەر بۆڵەبۆڵیانە و هەندێکیش وەختە بگرین لە داخانا. ڕووناک زۆر تریان لێیان چووە نزیکەوە

هەندێ جار ئەهاتە لای کەرەکانەوە و جاروباریش لە پشت عەسکەرەکانەوە ئەڕۆیشت، چاوی پڕ بووبوو لە فرمێسک و دڵی لە خەفەت. حەزی ئەکرد ئەگەر بە دەستی بوایە ئەم بەردی بدایە بە ناو شان و تەوقی سەری ئەو دوو عەسکەرەدا، کەوا دەکەن لەو لادێییە هەژارانە، بەڵام چی بکات هەر بە دارێک ئەیکوژن، دە باشە ئەوا ئەم هیچ، ئەی نابێ ئەو خەڵکە نەختێ غیرەتیان هەبێ؟! چۆن هەروا سەیر دەکەن و ئەم زوڵمە قبوڵ ئەکەن. هەر نقەش ناکەن! وای خوایە خەڵکی چەند ترسنۆک هەن! هەر کەسە لەبەر دەستکەوت و ئیش و کاری خۆی، ئەو هەموو غەدرە قبووڵ ئەکات و خۆی سەرشۆڕ ئەکات، ئاخ خۆزگە ئێستا هەر هیچ نەبێت تفێکی زۆر قایمم لێ بکردنایە و ڕامکردایە.. چی بکەم ئاخۆ چی لەو بەسەزمانانە ئەکەن؟ بەدەم ئەم خەیاڵانەوە و لە داخ و تووڕەییدا ئاگای لە هیچ نەما بوو کاتێ بە خۆی زانی خەڵکەکەی لێی دوور کەوتبوونەوە. ئەویش گوڕی دایە خۆی و زۆر بەپەلە ڕۆیشت تا گەیشتەوە سەریان کە سەیری کرد، دی وا یەکێ لە لادێییەکان خوێن بە سەرو چاوی دێتە خوارەوە، ئیتر ڕووناک دنیای لە بەرچاو تاریک بوو گوتی: تەواو... بە خوا ئەگەر من شتێک لەم سەگبابانە نەکەم خۆم ئەکوژم، ئینجا بۆ بە خۆڕایی لە داخانا خۆم بکوژم! با شتێکیان لێ بکەم جا ئەوانە بمکوژن! چاترە!

بەم بیرەوە ئەم جارە بە ئارەزوو خۆی دوا خستەوە و وردە وردە دەڕۆیشت تا پێشی کەوتن، گەیشتە لای شوێنێکی قەرەباڵغترەوە، سەرووی ماڵی شێخ لەتیف. دیار بوو لادێییەکانیان بەرەو حامیە دەبرد . لەو ناوەدا چەند دوکانێکی لێ بوو هەندێ منداڵ سەبەتەیان دانا بوو، میوە و شتی وایان ئەفرۆشت. ئیتر ڕووناک دەستی دایە بەردێکی باش لە کۆمەڵەبەردی بەردەمی ماڵێک کە خەریکی تەعمیرات بوون تۆزێ دانیشت بە بیانووی پێڵاوەکەیەوە کە گوایە قاچی ئەگرێت. بەردەکەی خستە ژێر عەباکەیەوە و بوخچەی کەوا و سوخمەکەی دایکی جوان گرێ دا و خستییە بن هەنگڵی چەپییەوە عەباکەی لە خۆی پێچا و بەپەلە شوێنیان کەوتەوە، بەڵام تۆزێ شڵەژا و گوتی: ئا ڕەسم بمگرن و باوکم لە ترسانا و لە داخان بمرێت. ئەگەر هات و نەشیانگرتم ئێستە ئەم خەڵکە فەقیرە ئەکوژ . باکیان چییە لای ئەوان هەموو کورد دوژمنە! بەڵام ئەیچۆن هەروا بزانن کە ئەمە هەقی خۆیانە، کە بە ڕاست و بە چەپا خەڵک

بگرن و بکوژن و کەسیش قسە نەکات، نەوەکو خەڵکی تریش تووش ببن! کوڕە دەخوای ئەکرد چاویان دەرئەهات خەڵک کەوابێ حورمەت و سەرشۆڕ ژیا هەربمرێ باشترە!.
جارێکی تریش خۆی گورج کردەوە و پێی هەڵگرت تا گەیشتە شوێنێک کە دوو سێ کۆڵانی بەسەرەوە بوو. لەسەری کۆڵانێکدا بۆیان وەستا هەتا خوا هێزی دابوایە بەردەکەی هاویشت بۆ عەسکەرەکان، ڕاست دای بە کاژەڵەی سەری یەکێکیان دا و یەکسەر خۆی کرد بەناو کۆڵانەکەدا. تۆزێ ڕای کرد، بەڵام کە دی کەس دووی نەکەوتووە خاوی کردەوە. بە تایبەتی کە چاوی بە پیرێژنێ کەوت لە بەردەرگایەکی کراوەدا دانیشتبوو. پیرەژنەکە کە ئەمی بەو حاڵە دی بانگی کرد:
ئەوە چیتە کچە... بۆ وا ڕات کرد؟ ڕووناکیش بە شپرزەیی گوتی: قوربانت بم پووری گیان بمشارەوە! هەتیوێکی سەرسەری شوێنم کەوتوە زۆر ئەترسم! پیرێژن هەر زوو پاڵێکی پێوە نا بۆ ژوورەوە و گوتی : ئەیەڕۆ!! بڕۆ کچم بڕۆ ژووری مەترسە با ئەو سەگبابە بێت بزانە چۆن هەر دوو چاوی دەرئەهێنم! ڕووناکی کردە ژوورەوە و دەرگاکەی داخست.
پیرێژنەکە ژوور و هەیوانێکی بچووکی هەبوو لەگەڵ حەوشەیەکی بچکۆلە. ژنە چوو کاسەیەک ئاوی بۆ هێنا و گوتی: وای بمرم یا خوا.. ئەوە بۆ وات بەسەر هاتووە؟ ڕووناک کەوا و سوخمەکەی دایکی دەرهێنا و بە هەناسەبڕکێوە گوتی: بە خوا پووری من چووبووم ئەم کەوا و شتانەی دایکم لای خەیات بهێنمەوە. کاتێ بە خۆم زانی هەتیووێکی ئاگر تێبەربووی نەدیوو نەناسیوم بە شوێنەوەیە ئیتر ئەوە هەر ئەیوت (ئاخ گیان ئەوە ئاوڕێک نادەیتەوە... دە ڕاوەستە با بتگەمێ) و زۆر قسەی ناشرینتریشی تێکەڵ ئەکرد، چونکە هەر قسە بوو خۆم لێ کەڕ کرد، بەڵام کە گەیشتە ئەم چۆڵاییە خەریک بوو پلامارم بدات، منیش ڕام کرد.
پیرێژن گوتی: دەک حەواڵە بە خوا بن ئەم خوێڕی و لاتولووتانە واز لە کچی خەڵک ناهێنن. خۆ کەسیش نییە غیرەتی هەبێت پێیان بڵێن هەتیووینە بۆ وا ئەکەن؟ بە خوا چەند ڕۆژێ لەمەوپێش دیسان هەر لەم کۆڵانەدا هەتیووێک خەریک بوو پەلاماری کچێک بدات، بەڵام باش بوو خوا و ڕاستان باوکی

ئەبووبەکری، منی بەسەردا هات و کچەکەی نەجاتدا، چەند تف و نەعلەتی لە هەتیووەکەش کرد...

ڕووناک کزومات دانیشت، بەڵام هەر دەنگێگ ئەهات دائەچڵەکێ و ئەیگوت: ئای پووریێ بە قوربانت بم بۆ کوێ بچم؟! پووریێش بە دڵسۆزییەوە ئەیگوت: کچێ ڕۆڵە.. بە قوربانت بم مەترسە.. کێ حەددی هەیە دەستت بۆ بهێنێت! بەم حاڵە نیو سەعاتێکیان بردە سەر. ئینجا ڕووناک نەختێ هاتەوە سەر خۆی و گوتی: ئەی پووریێ گیان چۆن بڕۆمەوە؟ بە خوا ئێستا دایکم خۆی ئەکوژێت وا ئەزانێت شتێکم لێهاتووە! پیرێژنەکە گورج گوتی: دڵت هیچ نەکات کچم پێم بڵێ ماڵەکەتان لە کوێیە من خۆم ئەتبەمەوە و تا نەتدەمەوە دەست دایکت دەستت بەر نادەم. ئەگەر ئەتەوێ هەستە با بڕۆین... بە خوا ئەوەی دەستت بۆ بەرێت دەستی ئەبڕم، قوڕ بە سەریان حەی بۆچی شاری بێ ساحێبە! ڕووناک هەستایە سەر پێ و بە ترسێکەوە گوتی: یا خوا بە قوربانت بم پووریێ گیان! ژنە چوو عەباکەی هێنا و پێڵاوەکانی لە پێ کرد و سەر و سەربەست و دەسماڵەکەی چاک کرد. عەباکەی دا بە سەردا و گوتی: دەی با بڕۆین پیاوم ئەوێت هەر بە لاتا تێ پەڕێت! ڕووناک بە شپرزەییەوە گوتی: لە دەورت گەڕێم پووریێ گیان مەمبەرە سەرجادە با هەر بە کۆڵانا بڕۆین، پووریێ گوتی: باشە گیانە. ڕووناکی پێش خۆی خست و لە کۆڵانەکەی پشتەوە کەوتنەڕێ هەر کۆڵانە و کۆڵان تاکو گەیشتنە سەر جادەکەی بەر مزگەوتی گەورە، لەوێدا ڕووناک گوتی: ئیتر ئەگەر بەجێم بێڵی ناترسم خوا جەزات بداتەوە پووریێ گیان، پیرێژنەکە گوتی: بە ڕاستە؟ ئەترسم لەبەر منت بێ با بێم لەگەڵت تا لای ماڵەکەتان. ڕووناک گوتی: نە بە خوا ئیتر ئەم ناوە هەموو خزم و ناسیاوی خۆمانن و کاکە عەلیشم دوکانەکەی ئەوەتا لای ئەو گەراجەوە. ئیتر تۆیش بگەڕێرەوە با لەمە زیاتر هیلاک نەبیت. پیرێژنەکە گوتی: نە کچم هیلاکی چی من فێری ئەم هاتووچۆیەم.. باشە کەواتە بڕۆ لە پەنای خوادا بیت. بە دەم ئەم قسانەوە دەستی کردە ملی و ڕووناکیش دەستی ئەوی ماچ کرد و لێک جیابوونەوە و هەریەکەیان بەرەو ماڵی خۆیان کەوتنە ڕێ.

***

هێشتا ڕووناک سێ چوار هەنگاوی لە کۆڵانەکەی خۆیان نەبڕی بوو دایکی بەقیژە و پەرۆشـێکی زۆرەوە ڕای کرد بۆی و گرتییە باوەش و کەوتە ماچ کردن و بە قوربان و بە ساقە بوونی. کە نەختێ هاتەوە سەرخۆی گوتی: ئەوە بۆ وا دواکەوتی؟ خۆ من هەر وەختە بوو شێت ببم. قسەکانی خۆتم بیرکەوتەوە گوتم: هەبێت و نەبێت شتێکی بەسەر هاتووە، ئەوە بۆ یەکیش هاتبوومە دەرێ کە حەلاو و گولاڵەی کچی بنێرم بۆ ماڵی پوورت و دوکانی کاکە عەلیت کە بگەڕێن بە دواتا. باش بوو خوا ڕەحمی کرد دڵی ئەوانیشم نەخستە مەراقەوە.. پێشم بکەوە بۆ ژووری... ڕووناک کە هێشتا هەر پەشۆکا بوو، بەپەلە خۆی کرد بە ماڵدا و پاش ئەوەی هەناسەی هاتەوە بەر خۆی و گوتی: دایەی گیان چ بکەم بەختەکەم وایە! ڕۆژ نییە من بچمە دەرێ و شتێکم بەسەر نەیەت!
دایکی کێشای بە سنگی خۆیدا و گوتی: وەی دایکت کوێر بێ! بڵێ بزانم ئەمڕۆ تووشی چی بوویت!
ڕووناک گوتی: دیسان لە دەشتاییەکەی لای ماڵی وەستا ئەحمەدەوە خەریک بوو سەگێک پەلامارم بدات. منیش زۆر ترسام ئیتر ژنێک بردمی بۆ ماڵی خۆیان تا هاتمەوە سەر خۆم ئەوسایش خۆی لەگەڵم هات تاکو بازاڕ. حەپسەخان گوتی: وای ڕۆحی دایکت دەرچێ ڕەنگت هەڵبزرکاوە! یا خوا کەوا و سوخمەکەم بە میرات کەوێت. بەس نەبوو نەیگرتوویت خوا ڕەحمی پێ کردووین! ڕووناک گوتی: خوا نەکا دایەی گیان موبارەکت بێ و بە لەشی ساغ لە بەری بکەیت. تۆ چی بکەیت.. دایک بە دڵ پێوەبوونە و گوتی: دە بڕۆ شڵپێ ئاو بدە بە دەم و چاوتدا و نەختێکیش پاڵ کەوە.
ڕووناک پاش دەموچاو شتن چووە ژووری پشوویەک بدات.

## ٥

هێشتا ڕووناک جێگەی گەرم نەبووبوو لە دەرگا درا. خەریک بوو خۆی بکا بە نووستوو، بەڵام کە دی دایکی خەریکی یاپراخ پێچانەوەیە بەزەیی پێدا هاتەوە، هەستا و لەبەر خۆیەوە گوتی: دەی بانۆش لە سەر دەی بیٚ! کە دەرگای کردەوە باجی حەلاوی دراوسێ یان بوو بەخێرهاتنی کرد و دایکیشی لە دوورەوە گوتی: یا خوا بەخێر بێیت خۆم خەریک بووم بێم بە دواتا نەختێ یاپراخم لەگەڵ بپێچیتەوە.

ڕووناک بەر لەوەی بچێتەوە ژوورێ بیری کەوتەوە بە دایکی بڵێ کەوا ئێوارێ ماڵێ پووری بە خاو خێزانەوە دێن بۆ لایان، دایکیشی گوتی: یا خوا بەخێر بێن. باش بوو قسەت کرد، کەواتە حەلاو زەحمەت نەبێ تۆ جارێ نەختێ گەڵای ترم لەو مێوە بۆ بکەرەە، ئەترسم یاپراخەکەمان کەم بێت و بەشمان نەکات! ڕووناک هەر چەندی ئەکرد لە ترسا خەوی لێ نەئەکەوت هەر مێشکی لای ڕووداوەکە بوو، ئەیگوت: ئەبێ چی قەوما بێ؟ ئاخۆ چییان بەسەر ئەو منالٚ و دوکاندارانە هێنا بێت! یا خوا ملم بشکێ بۆچی وام کرد، بۆچی خۆم پێ نەگیرا. منیش وەکو ئەو خەڵکە سەری خۆمم شۆڕ ئەکرد و ئەڕۆیشتم هەقم چی بوو بەسەر ئەم چەشنە ئیشانەوە. من لای خۆم هەمیشە گلەیی لە سەبری ئەکەم کە بە قسە سیاسەت ئەکات کەچی خۆم کەوتمە عەسکەر کوشتن! لە پڕ بیری کەوتەوە ئێستە باجی پیرۆزیش دێت. ئینجا وەرە باسی بێتە سەر و بەترش و خوێوە هەموو درۆکانم ئاشکرا بکا بە خوا خۆشە! وەڵڵا مەگەر سەر هەڵگرم ئینجا بە دەنگێکی نەختێک بەرز گوتی: ئەرێ دایە ئەوە هێشتا باجی سەبریم نەهاتوتەوە؟ دایکی وەڵامی دایەوە و گوتی: نەوەڵا ڕۆڵە هێشتا هەر نەهاتۆتەوە، ئیتر لەبەر حەلاو نەیوێرا قسەی تر بکات، بەڵام زۆر دڵی لێی پڕبوو.

مەنجەڵێک یاپراخ خرایە سەر ئاگر. حەوشە پاک کرایەوە و جێ ڕاخرا و سەماوەر و کەلوپەلی چا ئامادە کرا. ئەوجا حەلاو ئیزنی خواست کە بڕواتەوە ماڵی خۆیان ڕووناکیش کە گوێ لێ بوو دایکی ئەو ی بەڕێ کرد، لەسەر خۆ هەستا و چوو ئاوێکی کرد بە خۆیدا و خۆی گۆڕی و لەگەڵ دایکی بۆی دانیشت چاوەڕوانی میوان بکەن. ئەوەندەی پێ نەچوو ئامە خان و نەسرین خان هاتن. دوای دەست کردنە مل و ماچومووچ بەخێرهاتنێکی زۆر دانیشتن.

حەپسەخان پرسی ئەی ئەوانی تر کوان؟ خوشکی گوتی: حاجی و کوڕەکان دوایی دێن. ئەوەندەی پێ نەچوو سەبریش هاتەوە و هەت بەخێرهاتنی کردن و دەستی کردە ملیان و چووە ژوورەوە. ئامە خان پرسیی، ئەرێ ئەوە سەبری لە کوێ بووە؟ حەپسەخان گوتی: وەڵڵا چوو بووە ماڵی ڕەفیقێکی ئیشیان هەبوو؟ ئامە خان بە ترسێکەوە گوتی: ئەم ئیشە هەر تەواو نەبوو! لە دەرگا درا. ڕووناک چوو بیکاتەوە چونکە ئەزانی وەختی هاتنی باجی پیرۆزە، گورج دەرگاکەی کردەوە و کە دی ئەوە پێشی لێ گرت و بە ئەسپایی وەک پاڕانەوە پێ گوت: باجی پیرۆز گیان بە قوربانت بم نەکەی باسی دوێنێ بۆ دایکم بکەی زۆر لەو پۆلیس ئەترسێ لەوانەیە هەر ناوی بەرێت خوا نەکردە دڵی بوەستێت باجی پیرۆزیش گوتی: نە گیان چۆن پێی ئەڵێم، هەر قەت باسیشی ناکەم بە تایبەتی کە ئەمڕۆ شتی وا قەوماوە لای ماڵی شێخ لەتیفەوە ئەوەی دوێنێ لە چاویدا سەیران بووە! ئیتر چووە حەوشەکە بۆ لای حەپسەخان و خوشکی و سەلامی. دانیشت و دانەنیشت گوتی: وای پەنا بە خوا چی قەوماوە ئەمڕۆ ناشێ نەتانبیستبێ! حەپسەخان لە دڵی خۆیدا گوتی: دیسان ڕادیۆ و تەلگراف هات سەرمان گێژ کات! بێ ئەوەی لێی بپرسن چی قەوماوە گوتی: وەڵڵا ڕۆڵە یەک قیامەت و حەشر بوو نەبێتەوە. ئەمڕۆ قوڕ بەسەرێکیان لە ژێر دارا کوشت.. ڕووناک مووچڕکێکی ساردی بە لەشدا هات و گوتی: ئێ.. تو خوا دەبیلێ بزانین چی بووە؟ باجی پیرۆز عەباکەی گرمۆڵە کرد و لە تەنیشت خۆیەوە دایناوە گوتی: ئامە خان گوتی: ئەیەڕۆ خوا نەکا چی بووە؟ باجی پیرۆز نەختێ گەرووی پاک کردەوە ئینجا گوتی: ئەمڕۆ چەند عەسکەر دوولادێی ئەگرن، ئەیانەوێ بیان بەن بۆ حامییە، ڕۆڵە لە ڕێگا نازانم منالێک، پیاوێک، بە تەواوی نازانرێ کێ بووە، بەلام ئەڵێن پیاو بووە چونکە منال ناتوانێت شتی وا بکات.. هەموو بە پەرۆشەوە گوتیان ئێ.. چی بووە؟ چی کردووە؟ بۆ خاتری خوا! گوتی: وەڵڵا بەردێکی کێشاوە بە سەری یەکێک لە عەسکەرەکاناو سەری کردووە بە دوو لەتەوە! ئیتر بە جارێک بە لۆری عەسکەر دارڕژاون بە سەر ئەو ناوچە قوڕ بەسەرەدا و کێیان بەر دەست کەوتبێ گرتوویانە و بردوویانن بۆ حامییە، هەتا گەیاندووشیاننە ئەوێ دایان ڕزاندوون بە دار و بە شەق و بە قۆناغە تفەنگ، ڕووناک دەست و قاچی سارد بوونەوە و هێزی تێدا نەما. هەر

له شــوێنەی کە ڕاوەســتا بــوو دانیشــت. دوای نەختــێ هەســتایەوە و  چــووە ژوورەوە، بەڵام جێــی بە خــۆی نەدەگــرت. زۆر بــێ ئــارام و هەراســان بــوو نەشیئەوێرا خۆی بە ناڕەحەت پیشان بدا. لە پڕ دایکی بانگی کرد گوتی: نوونە گیــان ئەوە لە کــوێی! وەرە وا بــاجی خەریــکە ئیشــمان بــۆ ئەکــات تــۆش یارمەتییەکی بدە، ڕووناک بە داماوییەکەوە گوتی: باشە دایە وا هاتم، کە چوو زۆر ناڕەحەتی پێوە دیار بوو، ڕەنگی پێوە نەمابوو هەر چەند بە زەردەخەنەی دەستکرد نەیویست خۆی تەبیعی پیشان بدات، بەڵام هەر کەڵکی نەبوو. دایکی گوتی: ئامەی خوشکم.. چاوت لە ڕووناکە ڕەنگی چی لێ هاتووە! پووریشی گوتی: ئەرێ وەڵڵا ئەوە نوونە گیان بۆ وا ڕەنگت پەڕیوە؟ دوور بێ نەخۆش نەبێ، دایکی گوت: ئەمڕۆ خوا ڕەحمی پێ کردووە. سەگێک خەریک بووە بیگرێت لە دەشتەکەی لای ماڵی وەستا ئەحمەدەوە. بەخێرێ ناردبووم کەوا و سوخمەکەم بۆ بهێنێتەوە، پووری زۆری پێناخۆش بوو کێشای بە خۆیدا و گوتی: بە خوا ڕۆژێک شتێک بەسەر ئەم تلفە ئەهێنن.

سەبری هاتە دەرەوە ، سەلام و چاک و چۆنی لەگەڵ باجی پیرۆز کرد و گوتی: ئەوە چی بووە چی قەوماوە؟ گوێم لە باسێک بوو باجی پیرۆز ئەیگێڕایەوە باجی پیرۆز گوتی: ئۆ بە ساقەت بم ڕۆڵە چۆنی، سەبری وەڵامی دایەوە و گوتی: خۆش بی یاخوا کوڕت نەمرێ. تو خوا بۆم باس کە بزانم چی بووە، باجی پیرۆز ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە و ئەوەندەی تریشــی خســتە ســەر، ســەبری بە نــاڕەحەتییەوە گــوتی: وای ماڵیــان کــاول بــێ بە خــوا کــافر و بێناموسن. یا خوا کەس نەکەوێتە بەردەستیان.. بەڵام ئەو هەتیووەش حەواڵە بە خوا بێت کەوا بەردی تێ گرتوون ئەوان خۆیان لەبیانوو ئەگەڕێن. لە پاشا یەکێ ئەقڵی بێ وا ڕاستەوخۆ پەلاماریان نادات. ئەبێ خەڵک بزانێ چی ئەکات؟ دایکی گوتی: ڕۆڵە خەڵک غیرەتی هەیە، هەندێ کەس شتی وا ئەبینێت چاوی تاریــک ئەبێــت و تــرس و بیرکــردنەوەی لا نــامێنێ، بە تــایبەتی جەهێڵەکــان! ڕووناکیش لای نەسرینی کچی پوورییەوە دانیشتبوو خۆی ئەخلافان بە چا خواردنەوە گوێی لەم قسانە ئەگرت و وەکو بێ هۆش وابوو.

لە دەرگا درا نەسرین ڕاپەڕی گوتی: خۆم ئەچم ڕووناک گیان تۆ بێ تاقەتی مەچۆ. زوو بە ڕاکردن چوو دەرگاکەی کردەوە باوکی و دوو براکەی و مامی پێکەوە کریان بە ماڵا.

لە پـاش خۆشـی و چـۆنی و بەخێـر هـاتنێکی گەرم پیاوەکـان چـوونە بەرەو ژووری دانیشتن. پاش نەختێ حاجی مەجید گوتی: دایکی عەلی هەستە ناوی خوای لێ بێنە چیمان هەیە بۆمان تێکە. لام وایە هەموومـان برسیمانە، ژنەکەی هەستایە سـەر پێ و گوتی: یاپراخێکی خۆش بە دڵی هەمووتانم لێناوە. کاکە حـاجیش هەڵـی دایە و گـوتی: کەواتە تـا زوو بۆمـان دانێیـت درەنـگە. هەمـوو دەسـتیان کـرد بە پێکەنـین. حەپسـەخان گـوتی: وەی بەسـەر چـاو. دەی کچینە هەستن بکەونە خۆ.

ئیتـر کچەکـان چـوون خەریکـی قـاپ و سـینی دانـان و نـان تەڕ کـردن بـوون. سەبری چوو ماستاویان بۆ بکات. باجی پیرۆزیش مەنجەڵی چێشتەکەی هێنایە بەردەمی حەپسەخان و سینییەکی گەورەی مسی بۆ هێنا و مەنجەڵێ یاپراخیان قڵـپ کـردەوە نـاوی. بـۆن و بەرامەی شـویت و گەڵامێـو و تەڕەپیـاز بە هەڵموهاڵاوەوە بڵاو بووەوە بەو ناوەدا، حەپسـەخان گوتی: وەی دایکت بمرێ حسـەین.. چەنـد حەزی لە بنـی مەنجەڵـی یـاپراخ ئەکـات، بەڵام گـورج بیـری کەوتەوە کە میوانی هەیە، خوشکی و مێردەکەی و خوشکەزاکانی لەوێن، جوان نەبوو کە وای گوت. بۆیە قسەی بەسەردا هێنا و بە دەنگێکی نەختێ بەرز بانگی کرد: بەخە گیان.. وەرە ئیشێکم پێتە، بەختیاریش بەپەلە هاتە بەردەمی و گوتی: فەرمـو پـوورێ گیـان... چییـە؟ ئەتەوێ مـن یـاپراخەکە بەش کەم بەسـەریانا؟ پووریشی بە پێکەنینەوە گوتی: نە گیانە بەشـەکەی باوکت و مامت بەرە بۆیان، کە بەشی ئەوانی نارد بانگی کردە ئەوانی تر کە بێن هەر کەسە بەشی خۆی بە دڵی خۆی بەرێت. خۆشی بە سـەر سوڕمانێکەوە گوتی: ئەوە چییە بۆ کوێ ئەچی؟ ئەویش گوتی: ئەم دوو یاپراخە ئەبەم بۆ حەلاوی دراوسێمان. تو خوا زۆری ئەزێـت لە گەڵ کێشـاوم ئەو هەمـوو یـاپراخەی لەگەڵ پێچـاومەتەوە ماڵەکەیشی بۆ پاک کردومەتەوە. ڕوونـاک هەستا و گوتی: دایە تۆ دانیشـە مـن ئەیبەم بۆیان! سەبری هەڵی دایە و گوتی: دەنانەکەتـان بخۆن ئەوسا یەکێکمـان بۆیان ئەبەین. دایکی گوتی: کچم تا ئەوسا خۆیشیان نان ئەخۆن ئیتر بە کەڵکی چییان دێت! ئێستا باشە کە هێشتا نانیان نەخواردووە. نـانێکی تیریی دا بەسـەر قاپەکەدا، ڕووناکیش لە دەستی وەرگرت بردی بۆیان کە گەڕایەوە دایکی گوتی: وەرە بە سـاقە نـانەکەت تەواوکە، ڕوونـاک بە کەساسـییەکەوە گوتی: وەڵڵا دایە

تێرم خواردووه ئیتر هیچم پێ ناخورێ. پووری به پێکەنینەوه گوتی: ئەترسم تۆش بتەوێ خۆت لاواز بکەیت! ئەم بەزمەی داهاتووه هەموو کچەکان یەکی کاغەزێکی پێیه به خێرێ ئەبێ به مسقاڵ و به تەرازوو نان بخۆن! ڕووناک گوتی: نەوەڵڵا پوورێ گیان من شتی وا ناکەم، من بێ خواردن هەڵناکەم بەڵام ئێستا دڵم نایبات.

نەسرین هاته قسه و گوتی: وەڵڵا هەر ئەوەی ماوه ڕێجیم بکات، خۆی بووه به داسک و دەرزی دایم ماشەڵڵا بەڕێوەیه. به دەست هەموویانەوه و هەر ئەیهێنین و ئەیبەن بۆ ئەم لاو ئەولا! وەکو شتێ نەسرین ویستی بەم جۆره دەری بڕێ کەوا سەبری زۆر ئەینێریت بۆ ئەم لاو ئەولا، بەڵام سەبری هیچ قسەی نەکرد خۆی تێنەگەیاند.

نان خورا و قاپوقاچاغ هەڵگیرا. نەسرین مەسینه و لەگەنی برد بۆ باوک و مامی و ئاوی کرد به دەستیاندا. باجی پیرۆز حەجەتەکانی کۆکردەوه له خۆیەوه گوتی: جارێ چایەک ئەخۆمەوه ئینجا

ئەیانشۆم. سەبریش گوتی: به خوا نابێت، خۆم و نەسرین ئەیانشۆین. باجی پیرۆز ڕاپەڕی و گوتی: بەو مەرقەدی حاجی کاک ئەحمەد و بەو غەوسەی مالی له بەغایه پەنجەی بۆ نابەن، جارێکی تر دانیشتەوه بۆ چا خواردن. سەماوەری سپی وەرشا و ئەبریسکایەوه لەبەر گلۆپ و سیرەی ئەهات. سینی و پیاڵه و شەکردانی جوانی هەموو ڕێک و پێک دانرا بوون. حەپسەخان زۆری حەز له پیاڵه و ژێرپیاڵه و قۆری چاک و قەدیمی و جوان ئەکرد و چاو سەماوەری به ناوبانگ بوو!

دەنگی دەرگا ئەهات ئەمجاره سەبری ڕاپەڕی و دەرگای کردەوه و وا دیار بوو له جوابی یەکێکدا بوو، که گوتی: بەڵێ باوکم له ماڵه و مام و ئەوانیش لێرەن. لەپاش ئەم قسانه ئەفەنییەکی (٤٥-٥٠) ساڵەی لاوازی دەموچاو درێژی لووت بارێکی سوور و سپی سەر نیوه ڕووتاوەی چاو کوتوکوێر پێش سەبری کەوت ڕووی کردە لای پیاوەکان سەلامی کرد. ئەوانیش له بەری هەستان و بەخێرهاتنیان کرد و لا خۆیانەوه دایان نیشاند.

ڕووناک بەو حاڵه شڕەوه که تێدا بوو، که چاوی به پیاوەکه کەوت نوقورچێکی ئەسپایی له نەسرین گرت و گوتی: ئەمە چییه! ئەڵێی سەعه فەنی چاوباشقاڵ

خەیاڵی داوەتە ماڵی ئێمە وا دیسانەوە هات! سەبریش کە هاتەوە لای دایکی و ئەوان  گوتی: یا خوا بە ملی شکاو بێت. ئەم چاو باشقاڵە چی هێنای! دایکی بە ئەسپایی گوتی: سەبری ئامان.. بێدەنگ بە عەیبە میوانە! ڕووناک بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی: ئەو ڕۆژە چوو بووم گۆرەوی بۆ باجی سەبریم بکڕم، ژنێک لە دوکانەکەی بوو، چووم بە سەردا تفی لێ ئەکرد و پێی ئەگوت: ئەی بێشەرەف چۆن نوقوورچم لێ ئەگریت بە بیانووی ئەوەوە کە باقی پارەکەم ئەدەیتەوە، بە خوا ئێستا بەو تاکە پانی بەرزە هەموو دەموچاوت پڕ ئەکەم لە خوێن. بە زۆر ژنەکەیان بردە دەرەوە ئەویش ئەتگوت نە بای دیوە و نە باران. نەسرینیش گوتی: ئەو ڕۆژە منیش لەگەڵ ئەختەر خان و دڵخواز، کچەکانی کاکە مەلای دراوسێمان چوو بووین بۆ بازاڕ، دوایش گوتمان با سەرێکی کۆگاکەی سەعە فەنیش بدەین بزانین چی تازەی بۆ هاتووە. دوو سێ شتمان داوا کرد و بۆی دەرهێناین، کاتێ ئێمە خەریکی هەڵبژاردن بووین دەنگی ئوتۆمبیلێکی زۆر هات لە جادەکەوە وا دیار بوو بووکیان ئەبرد. ئەو ئەوەندەمان زانی سەعە فەنی بە ڕاکردن چووە دەرەوە دوکانەکەی بە سەر ئێمەدا بەجێ هێشت. ئێمەش هەر وا سەیری یەکتریمان ئەکرد ئەمانگوت ئەیەڕۆ.. خۆ ئەم پیاوە هەروەکو گا بەلەسە بوو! دوای ئەوە هەموو ئوتومبیلەکان تێپەڕ بوون هاتەوە ژوورێ و هەموو لەشی پێئەکەنی و بە شڵەژاوی گوتی: هەموو ئافرەت بوون ئافرەت....!

ئامە خان بە ئەسپایی گوتی: کچێ ڕۆڵە وس بن.. پیاوەکە گوێی لێ ئەبێت. لە بەر خۆشییەوە گوتی: زۆر پیاوێکی بەدخووە ئەگینا خۆ ژنەکەی خۆی ئەڵێی بووکەشووشـەیە و بە قەد کچیشـیەتی! سـەبری پرسـی: ژنـی چەنـدەمینێتی!. حەپسەخان هەر ئەیویست باسەکە پێ ببڕێتەوە ڕیزێ چای تێ کرد و بانگی کرد: بەخە گیان وەرە ئەم چایانە بەرە بۆ پیاوەکان کچینە ئێوەش ئەوە چایەکانتان.. هەر کەس چای خۆی هەڵگرێ.

ئامە خان گوتی: ئەرێ حەپسەی خوشکم... ئەوە بۆ ئێمەش وەکو ئەم عالەمە ناچینە شوێنێک سەیرانێ بکەین بۆ خۆمان؟ هەمیشە لە کونی ژوورەوە خزاوین. خوشکی گوتی: وا دیارە ئێمە لە چارەمان نووسراوە کە گوێمان لە خەبەرێک بێت و لە دڵماندا ئەخورپێت. ئامە خان بەدەم چا تێکردنەوە گوتی: قسەی ڕاستت ئەوێ خەتای خۆشمانی زۆر تێدایە دەوەرە با بۆ هەفتەیەک

بچـــین بـــۆ قەرەداخ، خەڵکـــی وا ئەچـــن بـــۆ ســـەیرانی قەرەداخ و قـــۆپ کە ناسیاوێکیشیان لەو ناوە نییە. کەچی ئێمە خوا عەمر درێژیان کات، جووتێ ئامۆزاشـــمان لەوێـــیە و ماڵیـــان هەیە و حاڵیـــان باشـــە و هەمیشـــەش گلەیـــی نەچوونمان لێ ئەکەن، جارێک سەرێکیان لێ نادەین. دەدەی با مناڵەکان بەرین و بڕۆین. حەپسەخان گوتی: زۆر چاکە با سبەینێ حسەین گیان بێتەوە ئینشائەڵلا ئەویش ئەبەین و ئەڕۆین. کە ناوی حسەینی هێنا نەسرین سوور هەڵگەڕا و گوتی: کەی دێتەوە...! سبەینێ؟! حەپسەخان بە خۆشییەوە گوتی: ئا گیانە سبەینی دێتەوە بە قوربانی هەردووکتان بم. نەسرین بە شەرمێکەوە گوتی: خوا نەکا پووری گیان وا مەڵێ.

لە پڕ گوێیان لێ بوو کە باوکی نەسرین و سەعە فەنی کوڕەکان قڕەقڕیانە و ئەڵێی مشتومڕیانە لە سەر شتێک حەپسەخان بە پەرۆشیەوە گوتی: ئا نەختێ بێدەنگ بن کچینە با بزانین ئەم دەنگە دەنگەیان لە چییە، کە گوێیان گرت سەعە فەنی ئەیگوت: تێناگەم ئێوە بۆ ئەوەندە تووڕە ئەبن هۆ من کفرم نەکردووە، ئەڵێم ئەم هەتیوانە شێت بوون، بۆ دانانیشن؟ لە چییان کەمە بۆ ئەم عالەمە ئەدەن بە کوشت؟ هەر ئەمڕۆ لە ناو بازار سەری سێ عەسکەریان شکاندوە، دە دیارە کە ئەوانیش وایان لێ ئەکەن خۆ بێدەنگ نابن.

کاکە حاجی و بەختیار و نەورۆزی کوڕی پێکەوە هاتنە جواب، تا کاکە حاجی گوتی: ڕۆڵە ئێوە بێدەنگ بن جارێ با من قسەکەم بکەم، ئینجا گوتی: چۆن سەعە فەنی ئێستا ئەو خەڵکە هەروا لە خۆڕایی وایان لەو عەسکەرانە کردووە؟ خۆ شێت نەبوون دیارە ئەبێ ئەو بێناموسانە کارێکی وایان کردبێ کە خەڵکەکە ئیتر خۆیان پێ نەگیرابێ، نەورۆز هەڵیدایە و گوتی: جارێ ئەوانە تۆ باسیان ئەکەیت هەتیوو نین و لە سەری باوکی ئەو کەسانەش زیاترن کەوایان پێ ئەڵێن. مامی نەختێ بە توندی گوتی: وس بە کوڕم، لەسەرخۆ.. لە تۆ گەورە ترە. وس بە بهێڵە باوکت قسەکەی تەواو بکات، بەختیار لەبەر خۆیەوە گوتی: بەڵێ.. وانەکەن، بچن وەکو تۆ لە دووکان دانیشن و وەکو ژن کرێم بدەن لە دەموچاویان، چاوبڕکێ لەگەڵ کچ و ژنی خەڵک بکەن، پارە بدەن بە بێوەژنی قوڕ بەسەر بە قەرز و بە سێ قات لێیان وەربگرنەوە، باوکی و سەعە فەنیش

هەر قڕەیان  بوو. ئەوەندە بە توندی قسەیان ئەکرد کەسیان گوێیان لە قسەی ئەوی تریان نەبوو.
سەبری گوتی: دایە بیانگەرێ.. بە خوا ئەترسم مامم بیکا بە شەڕ. دایکیشی گوتی: جارێ ئێوە بێدەنگ بن تا بزانین چی ئەڵێن ئەوسا ئەگەر پێویست بوو ئەچم. کە گوێیان گرت کاکە حاجی ئەیگوت: مەسەلەکە وانییە وەکو تۆ ئەڵێیت. ئەو دوو لادێییە قوڕبەسەرانە هیچ گوناهێکیان نەکردووە، چەند مریشک و کەڵەشێرێک بە سەر بارەکانیانەوە بووە، عەسکەرەکان گوایە ویستوویانە مریشکەکانیان لێ بکڕن، بەڵام ئەوان تێ نەگەیشتبوون لە قسەکانیان و کوڕێکیان کردبوو بە تەرجوومان. لادێیەکان گووتوویانە مریشکەکان نافرۆشین هێناومانن بۆ دیاری، ئیتر قوربەسەرانە هەر ئەوەندەیان زانیوە کەوا ئەیاندەنە بەر دار و شەق و زلە. جا ئەمە ویژدانە ئەمە دینە، سەعە فەنیش گوتی: ئەی سەگبابی وا کە مریشک نافرۆشێت بۆچی هێناویێتی؟ حاجی مەجید کە تا ئێستا هەر قسەی نەکرد، چونکە ماڵی خۆی بوو، وا دیار بوو ئیتر خۆی پی نەگیرا بە تووڕەیییەوە قیڕانی گوتی: بۆچی بە زۆرە؟ ماڵی خۆیانە و نایفرۆشن، لەگەڵ ئەوەشدا پێ یان گوتوون و ئەیانبەن بە دیاری!
حەپسەخان ئیتر چاری نەما هەستا و لێ یان چووە پێشەوە و گوتی: ئەرێ باوکم، برام.. ئەوە چیتانە، ئەو قڕەقڕەتان لە چییە؟ سڵاواتی لێ بدەن و ئێوە بۆ وا خۆتان تووڕە کردووە، ئەو قوڕبەسەرانەی گیراون ئێستا خوا ئەزانێ چییان بە سەر هێناون، ئەم قڕەقڕە و شەڕەی ئێوە چی لە حاڵی ئەوان ئەگۆڕێ! سڵاواتی لێ بدەن ئیتر بەسە! ئەوانیش تۆزێ بێدەنگ بوون، بەڵام باجی پیرۆز گوتی: ڕەبی جوانەمەرگ بن و خوا هەقیان لێ بکاتەوە بۆ خاتری فەخری عالەم! سەبری بە تووڕەیییەوە گوتی: تو خوا باجی پیرۆز بەسە تازەی مەکەرەوە. سەعە فەنیش هەستایە سەر پێ و گوتی: شەو درەنگە منیش بە دوعا. حاجی مەجید گوتی: دە جارێ زووە نەختێکی کە دانیشە، با باسی کاسبی و بازاڕ بکەین، ئێمە هەقی ئەم باسانەمان چییە؟ سەعە فەنی گوتی: نەوەڵڵا حاجی بڕۆمەوە باشترە شەو درەنگە بە دوعا ؟ ئەوانیش هەموو خوا حافیزیان لێ کرد. کاکە حاجی بێدەنگ بوو تا چووە دەرێ، ئەو تفێکی بە دوادا هەڵدا و بە ڕقێکەوە گوتی: دەک داوەشێت پیاو تو خوا ئەمە پیاوە دینی هەیە! خۆ من لە

هیچا نیم بەڵام با لە هیچیشا نەبم، ئەی ئینسان نیم؟ ئەی پیاو نیم؟ باشە تۆ کەوا هیچ چاکەت نییە، نانەجیب، خراپەشت نەبێت!؟ دەستی دایە جامانەکەی کردیەوە و جارێکی تر بەستیەوە و گوتی: دانیشتووە جنێو ئەدا بە برا کوردەکەی خۆی و لە سەر ئەو عەسکەرە بێناموسانە ئەکاتەوە! حەپسەخان هەڵی دایە و گوتی: دەی کاکە حاجی گیان گوێ مەدەرێ دەستت خۆش بێت تۆش چاکت پێ کرد. سەبری ڕووی تێ کرد و گوتی: شتی وا چییە دەم خەنە دەمی. ئەمان میکرۆبن.. میکرۆب!! ئامە خان گوتی: دەی منالینە هەستن با ئێمەیش بڕۆینەوە، ئەمان ئەبێ زوو بنوون بەیانی نان ئەکەن. حەپسەخان گوتی: دە هێشتا زووە جارێ ئامە خان گوتی: نەوەڵڵا با بڕۆینەوە. خوشکی گوتی: باشە ئەی ئەڵێی چی! نەسرین گیان ئەمشەو لای ئێمە بنوێ بەیانی ئیشمان زۆرە. ئینجا بە زەردەخەنەیەکەوە ڕووی کردە نەسرین و گوتی: سبەینێ حسەین گیانیش دێتەوە. ئامە خان کردی بە پێکەنین و گوتی: زۆر باشە با لێرە بنوێت لام وایە خۆیشی لە خوای ئەوێت. نەسرین بە لالووتی و تووڕەییەکی دەست کردەوە پشتی کردە دایکی و گوتی: ئۆ دایە.. هەر لە چەشنە گاڵتانە واز ناهێنیت.. دڵیشی کورکەی ئەهات لە خۆشیانا. نەسرین مایەوە و ئەوانی کەش خواحافیزیان کرد و لێیاندا ڕۆیشتن. دوای ئەوان ئەمان کەوتنە شت کۆکردنەوە و ماڵ پاک کردنەوە. هەر لێ بوونەوە ڕووناک گوتی: من نەختێ بێ تاقەتم ئەچم ئەنووم.. ئیتر بەرەو دوا خەڵکی چوون بنوون.

## ٦

ڕووناک هەر ئەم دیو ئەو دیوی ئەکرد لە ناو جێگەکەیدا و هەرچەندی ئەکرد خەوی لێ نەئەکەوت. بیری لەو کەسانە ئەکردەوە کە بەر چنگی ئەو عەسکەرە دڕندانە کەوتوون، وەک سینەما دیمەنی ئازاراوییان ئەهاتە بەر چاو، لەبەر خۆیەوە گوتی: باوەڕ ناکەم لادێییەکان تا ئێستا مابن.. مەعلوم هەر زوو کوشتوویانن. ئەی خوایە گیان بۆ لەو کاتەدا من بەو شوێنەدا تێپەڕیم! دەک ملم شکێ چەند چاو قایم بووم. هەق نەبوو من شوێنیان بکەوم بەشکەم بگیرامایە. بە خوا هەر ئابڕوویان ئەبردم و خوا ئەزانێ باوک و برا و خوشک و کەسوکاریشیان چی لێ ئەکردم! بەڵام ئەی چۆن؟ ئاخر ئەوان بۆچی لەو فەقیر و هەژارانە بدەن؟ خۆ بە ڕاستی هەر ئەت وت سوالکەرن جل شڕ و پینە پیناوی. خۆ یەکێکیان ئەژنۆی لە شەڕواڵەکەیەوە دیار بوو! وای کە دڵم پێیان سووتا! ئاخۆ

چەند دڵیان خۆش بووبێ کە گەیشتوونەتە شار پاش ئەو هەموو ئەزێت و هیلاکییە. خوا ئەزانێ ئەو دارانەیان لە کوێوە هێناوە، چەند هەتاو لێی داون و چەند گەرمایان بووە ئەبێ ڕێگەیان دوور بوو بێ... بۆیە تێشووبەرەیان پێ بوو. بەڵام تێشووبەرەی چی کوێراییم دایە.. کە عەسکەرە دڕندەکان لێیان سەندن کردیانەوە و بەو ناوەدا بڵاویان کردەوە، تەنیا دوو سێ نانی ڕەقیان تێدا بوو لە گەڵ هەندێ بۆڵە ترێ. لاوازەکەیان کە سەر ئەژنۆی شەڕواڵەکەی دڕابوو هەر پانزە، شانزە ساڵ ئەبوو.. دایکی بمرێ، ڕووناک دەستی کرد بە گریان و بە ئەسپایی سەری کرد بە ژێر لیفەکەیەوە هەناسەیەکی بە هەنسکەوە هەڵکێشا و گوتی: ئاخ خوایە.. پێشینان لە خۆیانەوە نەیانگوتووە، ڕۆژ ئەچێت و قەزا ناچێت، ئەگیانە من لە کوێ و ئەم بەزمە لە کوێ، خۆزگەم بەیانی دایکم پێی گوتم بچم جلەکانی بۆ بهێنمەوە جارێ گەڵامێوەکەم بۆ بکردایەوە، ئەوسا بچوومایە بۆ جلەکانی. نە تووشم ئەبوو بە توشی ئەوانەوە نە ئەم کارەشم ئەکرد... دەی هەر چۆنێ بێ تازە لە دەست چوو.. بەدەم ئەم بیرانەوە هەر ئەم دیو ئەو دیوی بوو، جار جارەش کە چاوی ئەچووە خەو خەوێکی ناخۆشی ئەبینی و ڕائەپەڕی و خەبەری ئەبووەوە.. ئاشکرایە ئەم کوڕ و کچ و خەڵکانە ناهەقیان نییە کە وا ئەکەن. خۆ هار نەبوون لە خۆڕایی خۆیان بدەن بە کوشت و بە هەڵواسین، وەک باس ئەکەن لە دەمێکەوە ئەم کوردە هەژارە هەر حاڵی

وایە.. هیچ دوور نەڕۆین، کوێربم یا خوا، وەکو دایکم باسی ئەکات ئەوسا کە من زۆر منداڵ بووم  خاڵم هەر خەریکی خەبات بووە و چۆن ڕۆژێک دابوویان بە سەر ماڵەکەیاندا و تایپ و نەشرە و زۆر شتی دیکەی یاساغیان لا دۆزی بووەوە و گرتبوویان. لە پاشان بە گوللەی وێڵەوە بن، ئیعدامیان کردبوو لەگەڵ چەند کەسێکی تردا. نەنکیشم هەر بەو داخەوە ئەمرێ و دایکم و پووریشم ئێستەش کە ئەم هەموو ساڵە بە سەرا تێپەڕیوە کەس ناوێرێ ناوی بەرێ لایان... هەر چۆنێک بێ تازە من نابمەوە بە ڕووناکەکەی جاران، ناشمەوێ ببمەوە! ئینجا لەبەرئەوە لەمەولا باجی سەبریم هەر ئیشێکم پێ بکات بە سەر چاو بۆی ئەکەم. هەر شتێکم بداتێ بە دڵ بۆی بڵاوئەکەمەوە و قەت ئیتر بۆڵەبۆڵ ناکەم بشمگرن چش. خۆ من لەو خەڵکە زیاتر نیم کە ئەگیرێن. لە پاشان بۆچی گوایە منیش ئەتوانم وەکو ئەو کچە بکەم کە ئەو ڕۆژە باجی سەبری حەکایەتەکەی بۆ خوێندمەوە؟ بۆچی کچە کورد چی لە وان کەمترە؟ کچە کوردیش ئەتوانن هەموو ئەو فرمانانە جێبەجێ بکەن وەکو ئەوان و  لەوان باشتریش زۆر سەیرە! چۆن وا ڕەئم گۆڕا؟خۆ هەمووی هەر دوێنێ بوو کە وەختە بوو زەندەقم  بچێ کە باجی سەبری بەیاننامەکانی دامێ بیبەم بۆ ئەو ماڵانە!! عەیب و شوورەیی! با بۆم ڕاوەستن بۆ لەمەودوا...

ئیتر  ڕووناک هەر خەیاڵ بڵاو بوو و نەیزانی چۆن و کەی  خەوی لێ کوتبوو... بەڵام بەیانی هەر زوو لە دەنگی سڵاواتی باجی پیرۆز و خوڕەی ئاو و باسی هەویر و داری وشک و تەنوور  داخستن خەبەری بووەوە. هەستا و تۆزێ دانیشت لە سەر جێگاکەی تا خۆ کۆکردەوە و جێگاکەی هەڵگرت چوو دەموچاوی شت و چووە لای دایکی کەوا لەبەر سەماوەرەکە دانیشتبوو. باوکیشی لەولاوە نانی بەیانی ئەخوارد. کە چاوی بە ڕووناک کەوت گوتی: گیانە ئەوە بۆ وا زوو هەستای؟ ڕووناک گوتی بابە گیان ئەی نان ناکەین؟ باوکی گوتی: هەی شەیتان خۆ تۆ نازانی نان بکەیتەوە. دایکی گوتی: چاکی کرد زوو هەستا، بە ساقەی بم بەر دەستیمان ئەکات.

حاجی خواحافیز لێ کردن و گوتی: ئێستا گوشت و شتەکانت بۆ ئەنێرمەوە بە تۆفەدا. هیچی ترتان ناوێت؟ حەپسەخان گوتی: نەوەڵڵا هەموو شتێکمان هەیە شوکر زۆر سوپاس.

که سەبری و نەسرین هەستان و نانیان خوارد باجی پیرۆز دەمێک بوو لە هەویر شێلان بوو بووەوە و تەنووری داخستبوو. پنە و تیرۆک و کەوڵ و شتەکانی حازر کرد بوو.
نەسرین زۆر دڵی خۆش بوو بەوەی کەوا حسەین ئەو ڕۆژە ئەهاتەوە، چونکە لەو کاتەوە کە ئەموستیلەی کردبووە دەست و لێی مارە کرد بوو ڕۆشتبوو بۆ شارەزوور و ئیتر چاوی پێی نەکەوتبوو، بۆیە لە سەر ئاگر چاوەڕێی ئەکرد، بەڵام ڕووی نەئەهات دەری ببڕێت. سەبریش کە هەر لە دوێنێوە کزومات بوو، کە هەستاش لە خەو هێشتا هەر ماتەمینی بەری نەدابوو. دایکی چرپانی بە گوێی ڕووناکدا و گوتی: نوونە گیان تو خوا تۆش وا نایەتە بەر چاوت سەبری لە دوێنێوە کە هاتۆتەوە زۆر مات و خەمبارە؟ ئاخۆ چی لێ قەوما بێ! ڕووناک کە کەوتبووەوە خەیاڵی دوو لادێیەکە و ئەو خەڵکانەوە کە بە هۆی ئەوەوە تووش بوو بوون، بە گوێدا چرپانەکەی دایکی هێنایەوە سەرخۆی و بە ناچاری لە بەر دڵی ئەو گوتی: بڵێم چی دایە گیان ڕاستت ئەوێ منیش نەختێ عاجزی ئەبینم! حەپسەخان گوتی : دە بزانە ناتوانی لێی دەربێنی، ڕەنگە بە تۆ بڵێت چاوت لێیە ئەم بەیانییە هەر نەیگوت: ئەڕۆم ئیشم هەیە! ڕووناک گوتی: ئاخر ئەزانێت کە نان ئەکەین! دایکی بە پێکەنینەوە گوتی: هەی نوونە گیان بۆچی سەبری کە ویستی بچێتە دەرێ نان کردن و شتی وا ئەزانێت! چییە ئەڵێی تۆش هۆشت لای خۆت نییە؟ ڕووناک بە پێکەنینێکی دەستکردەوە و بە ئەسپایی گوتی: نا دایە گیان دڵت لای من نەبێت زۆر چاکم. بۆ سەبریش ئەچمە بنجوبناوانی بزانم چییە. بەڵام تۆ بڵێیت لە گەڵ کابرا بەینیان تێک نەچوو بێ؟ دایکیشی بە ئەسپای گوتی: تۆ بڵێیت؟! نا باوەڕ ناکەم من ئەوە بێت. ئیتر بێدەنگ بوون، بەڵام هەر زوو ڕووناک کەوتەوە گێژاوی بەسەرهاتەکەی دوێنێی خۆیەوە و هەر بە خۆی ئەوت، تازە هەر چییەک بکەم ئیشانەی کە کراون و ئەو خەڵکەی گیراون و کوژراون وەک خۆیان لێ نایەتەوە، بەڵام شەرت بێ قەت ئەم ڕووداوەم لە بیر نەچێتەوە، هەتا ماوم و هەتا بتوانم هەق لەو زۆردارانە بکەمەوە وەیشش.. چۆن ئەتوانن ئەو سەر و ملە کەچە خوێناوییە ئەو دوو لادێییە بیر بچێتەوە! ئەوە من هەر دوو کەسم دیوە ئینجا خوا خۆی

ئەزانێت چەند سەدان و هەزاران خەڵکی بێ تاوانی تر وەها لەوەش خراپتریان لێ کراوە و ئەکرێت!

ئەم خەیاڵ و لێکدانەوانە بە لای ڕووناک خۆشیەوە بۆ کچێکی ١٥ - ١٦ساڵەی وەکوو ئەو شتێکی سەیر بوو. هەرچەندە دەوروبەری ئەو شارە و ئەو ماڵەی ئەوی تێدا گەورە بووبوو، هەر ئەبوو بەو لایەدا ڕای کێشێت.

***

حەپسەخان هەستا چوو بۆ لای باجی پیرۆز، حەلاوی دراوسێشیان لە گەڵ خوشکی و نەسرین هاتنە سەر تەنوورەکە. هەریەکەیان لە بەر پنەکەی خۆیدا دانیشت و دەستیان کرد بە نان کردنەوە.

پاش نیوە سەعاتێ حەپسەخان گوتی: نەسرین تۆ ئەبێ زوو هەستیت چونکە ئەبێت توزێ ماڵەکە ڕێک خەین و شتێکی خۆش لێ نێین بۆ حسەین گیان، لای عەسر ئینشائەڵڵا دێتەوە. نەسرین وەڵامی دایەوە و گوتی: نە بە خوا پووری گیان تۆ خۆت بچۆ بە لای ماڵەکەوە خۆت بە نان کردنەوە ماندوو مەکە، پووری گوتی: ئۆی نەسرین گیان ماندووبوونی چی خۆ کوڵ ناکێشم.. هەر خۆم حەز لەنان کردنەوە ئەکەم، ئەشمەوێ نەختێ شان و قۆڵم بجووڵێنمەوە وەکو ئەڵێن، ڕیازەیە ڕۆڵە، پێکەنی و گوتی : با قەڵەو نەبم ، نەسرین بە زەردەخەنەوە گوتی: ئینجا تۆ کوا قەڵەوی! بە خوا ماشائەڵڵا لە هەموومان جوانتری، بە خۆی گوت ئەوە چییە بە سەر لووتمەوە، تا پووری بە چاوەوە نەبێت، پووری گوتی: ئەرێ ئەوە باسی کێ ئەکەیت؟! ڕۆڵە جوانی چی.. من چیم پێوە ماوە! باجی پیرۆز هەڵی دایە گوتی: وای چۆنت دڵ دێت! بۆ لە تۆ جوانتر و شەنگوشۆختر هەیە؟! حەپسەخان گوتی: دە باشە دایکم دڵم خۆشکەن.

ئەمانە هەر وا بۆ خۆیان قسە و گاڵتەیان ئەکرد و پێئەکەنین کە تۆفە بە کۆڵێکەوە کردی بە ماڵا. کۆڵەکەی دانا و بەخێر هاتنیان کرد. تۆفە ناوەشکێنەیەکم بۆ بکەن؟ باجی پیرۆز گوتی: وەی بەسەرچاو تۆفە گیان هەر تۆ و کولێرەبەڕۆن! تۆفە گوتی: چاوت خۆش بێ یاخوا، بەڵام من نەمگوتووە کولێرەبەڕۆن ئەڵێم ناوەشکێنە، حەپسەخان: هەرچی تۆ ئەڵێیت بەسەرچاو! تۆفە چاوی گێڕا و گوتی: ئەوە کوا نوونە خان؟ دیار نییە هەر خۆیم لێ ئە شارێتەوە. بە دەنگێکی بەرز گوتی: بە خوا بچی بۆ ئاسمان ئەبێ پاکەتەکەم بۆ

بکڕی، خۆت مەشارەوە لێم! ڕووناک هاتە دەرەوە و پێکەنی و گوتی حەواڵ بە خوا بێ، من کەی تۆم دیوە تا خۆمت لێ بشارمەوە!؟ نەختێ ڕاوەستە وا ئەچم بۆتی یەنم، حەپسەخان پێی گوت: دەتۆ تۆزێ دان بە خۆتا بگرە تا کولێرەکەت ئەبرژێت وا ڕووناکیش چوو پاکەتەکەت بۆ بهێنێ. تۆفە دانیشت و دانەنیشت گوتی: ئەوە سەبە کوا؟ با بێ چایەکمان بۆ لێبنێت، ژنەکان دەستیان  کرد بە پێکەنین و گوتیان: هەی گیان زۆری پێیە و کەمی دەرئەخات، دوایی تۆفە وەکو چاوی تازە بە نەسرین کەوتبێ و گوتی: هەناسە تەمەڵ.. ئەوە تۆش نان ئەکەیتەوە؟! نەسرین پێکەنینێکی وا گرتی خەریک بوو تیرۆک و نانەکەی لە دەست بکەوێتە خوارەوە، کە کوڵی پێکەنینی نیشتەوە گوتی: تۆفە جەرگ کون من تەمەڵم؟! تۆفە گوتی: ئەی نەء ئەو هەموو فەرش و قاڵییە تۆ چنیوتن! ژنەکان هەموو دایانە قاقای پێکەنین. سەبریش هاتە دەرەوە گوتی: ئەوە چییە تۆفیق بەگ چی ئەفەرمووی؟ تۆفە گوتی: زۆر چەقە چەق مەکە بڕۆ دەی چایەکم بۆ لێنێ تا بە ناوەشکێنەکەمەوە بیخۆم، سەبریش پێکەنی گوتی: ئەمر ئەکەی بەگم! تۆفە دانیشت، پاکەتەکەی ڕووناکی بە دەستەوە بوو، کردییەوە جگەرەیەکی دەرهێنا و حەپسەخان گوتی: تۆفە گیان بۆچی لە ئێستاوە جگەرەکەت دەرهێنا هیچ نەبێ ڕاوەستە تا دوای نان و چایەکەت. سەرێکی بادا و نەختێ بێ دەنگ بوو ئینجا گوتی: ئۆف لە دەست ئەم جگەرەکیشانە. تو خوا ئەم دووکەڵە پیسە بۆ ئەکەن بەو سنگە پاکەیانا! ئەڵێی نازانن کەوا چەند بۆنی هەناسەی خەڵک ناخۆش ئەکات، سەرەڕای ئەوەی منداڵی دوێنێ ئەکێشن، بەیانیان ئەڵێی پیرە مێردن ئەکۆکن عەمری جگەرە نەمێنێ. سەرم لەوە سوڕ ئەمێنێ کە ئەو هەموو خراپەیەشی باس ئەکرێ و ئەو نەخۆشییە کوشندانەشی لێ پەیا ئەبێت کەچی ئەم خەڵکە چاویان ناترسێت و هەر ئەکێشن! تو خوا جگەرە نانە، ئاوە ئاخر چییە؟ دە وەرە ئەو هەموو پارە جوانەی خۆت بدە و ئەو دەردو بەڵایەی پێ بکڕە! تۆفە سەیرێکی حەپسەخانی کرد و گوتی: تازە بە پیری پێمان تەرک ناکرێت. ئیتر زۆریش قسە مەکە! حەپسەخان پێکەنی و گوتی: ئێ باشە بزانە دوایی چیت بە سەر دێت، تۆفە گوتی: بە خوا قەت لەمە خراپترم بە سەر نایەت. بە شەو ناهێڵم کەس بنوێت ئەوەندە لە دەهۆڵی کۆکە ئەدەم بۆیان! دوای ئێستێک ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: کوڕە ئەوەندە خەم زۆرە ئەگەر

جگەرە نەکێشین هەر شێت ئەبین. خۆ گوێتان لێ بووە دوێنێ چییان لەو دوو لادێییە قوربەسەرە کردووە؟ ئێستاش کەس نازانێ دوێنێ دوای ئەوەی کە بران بۆ حامییە چییان بە سەر هات! بەیانی عومەری عەسکەرم لە مزگەوت چاو پێکەوت، ئەی وت تا سەعات یەک و دووی شەویش هەر لێیان داون و ئەوانیش هەر هاواریان کردووە، ئیتر دەنگیان نەماوە. زۆریشی هەوڵداوە بزانێ کە چییان بەسەر هاتووە، بەڵام پێی نەکراوە زۆر ترساوە نەوەکا بزانن کە نارەحەتە بۆیان و ئەویش تووشی بەڵایەک بکەن، گوتی: وا بزانم یەکێکیان هەر زوو لە ژێر دارا مرد بوو، بەڵام بە قسەی ئەو عەسکەرەش کە بەردەکەی پیا کێشرا بوو، یەک سەر براوە بۆ خەستەخانەی کەرکوک و ئەڵێن زۆر لە خەتەرایە.

تۆفە دوو سێ مژی لە جگەرەکەی دا و گوتی: بە خوا لە سەرێکیشەوە ئەڵێم ئەوە گوناحە خۆ ئەم عەسکەرە بە کەیفی خۆی نەهاتووە، بە خوا بەعزێکیان ئەوەندە منالن بۆ دایک و باوکیان ئەگرین.

هەموو ئەهلی ئەو خوارەوەن، ئەوانیش قوربەسەرانە بە زۆر کراون بە عەسکەر. نەسرین هەڵی دایە و گوتی: ئۆە.... ڕەزایان مرێ تو خوا ئەوەنە لە سەریان مەکەرەوە دەمودان کەلاوە! خۆیان ئەگەر داخ لە دڵ و بێناموس نەبن بۆچی ئەو خەڵکە وا یەکسەر ئەدەنە بەردار و شەق. خۆ عبدولکەریم قاسم بە ژوور سەریانەوە ڕانەوەستاوە دەست بە دەمانچە! بڵێ دەی وا بکەن ئەگینا ئێستا گوللەیەکتان پێوە ئەنێم!! خۆیان نائینسان و داخ لە دڵن لە کورد. تۆفە دەستی بەرز کردەوە و گوتی: وس بن موفەتیش قسەی کرد، کچێ نەسە تەمەڵ تۆ ئەو شتانە لەکوێ ئەزانێ! بە خوا ئەو ڕۆژە لەگەڵ عەلی بە قەمەرەکەی چووین دوو سێ برادەرمان بە ڕێ کرد تا ئەو لای سەرچنار. بەو خوایە چەند عەسکەرێک چاویشیان لێمان بوو قسەیان نەکرد و گوتیان: کاکە روح لا تدربال. کە ژنەکان گوێ یان لە عەرەبییەکەی تۆفە بوو هەموو پێکەنین. باجی پیرۆز گوتی: شکور عەرەبیش ئەزانێ کاکە تۆفە! ئەویش گوتی: ئەی چۆن! ئەی عەسکەر نەبووم وەختی خۆی!

سەبری چای بۆ هێنا لەگەڵ کولێرە ناوشکێنەکەی و تۆفەش دەستی کرد بە خواردن. حەپسەخان پرسی: ئەرێ تۆفە ئەوە عەلی هیچ دەنگی نەبوو؟ ئاخۆ

کەی ئەگەڕێتەوە.. زۆر دڵم لە لایەتی! تۆفە شانێکی هەڵتەکاند و گوتی: من هەر ئەوەنــدە ئەزانــم کە دوێنــێ شــتەکانی گەیشــتن و هەموویمــان داگــرت. شاگردەکانییش هەروا خەریکن. حەپسەخان گوتی: بە قوربانە خافڵیان نەکەیت! تۆفە بە بزەیەکەوە گوتی: بە خوا بزماریش ئەژمێرم کە چەند دانەیە خەمی منت نەبێ.

حەپسەخان لە سەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی: ئیتر نەوبەهار خان بێ و بگاتە بەغا کێ ئەیگێڕێتەوە سلێمانی! تۆفە گوتی: دەی دیسان دەست بکە بە قسە خۆشــەکانت، نەوبەهــاری فەقیــر بڵــێ چــی؟ کــوڕەکەی خــۆت ئیشــەکەی تەواو نەبووە، حەپســەخان گــوتی: بە خــوا کــوڕەکەم ئیشەکەشــی تەواو بێت، ئەو تــا هەموو بازاڕ دووکانی بەغا نەگەڕێت نایەتەوە. تۆفە گوتی: دە جەحێڵە و لەگەڵ مێردی خۆیەتی با بۆ خۆیان نەختێ بگەڕێن، تۆ بۆچی پێت ناخۆشە؟ خۆشت کەم نەگەڕایت لەگەڵ کاکە حاجی. پاش ئەم قسەیە هەستایە سەر پێ و گوتی: درەنگە... لەبەر دووکانەکەی کاکە عەلی بڕۆمەوە باشە. خوا حافیزی لێ کردن و ڕۆیشت. بەڵام ژنەکان هێشتا هەر بە قسەکانی پێ ئەکەنین، حەپسەخان لە هەموویان زیاتر.

***

## ٧

نیوەڕۆ بوو حەپسەخان بە ژنەکانی گوت: هەستن ئیتر با بچین پشوویەک بدەین و شتێکیش بخۆین. نەسە گیان تۆش هەستە بەسە ئیتر بچۆ بە لای ئیشی خۆتەوە، بە ئەسپایش پێی وت: گیانەکەمی جارێ بچۆ ئاوێک بکە بە خۆتدا هەموو لەشت بووە بە ئارد. ئەویش بێدەنگ ڕووی کردە حەمامەکەیان.

ڕووناک و سەبریش کە ئیشەکانی ماڵیان تەواو کرد، چوونە ژوورەکەی سەبری دانیشتن بەبێ دەنگ. پاش نەختێک ڕووناک گوتی: باجی سەبری ئەوە چییە وا لە دوێنێوە ماتەمینی دایگرتوویت و عاجز دیاریت؟!. سەبری گوتی: نا هیچ عاجز نیم ماتەمینیش دای نەگرتووم! چییە بۆ ئینسان ئەبێ هەر تریقەی پێکەنینی بێت؟!. ڕووناک نەختێک بێ دەنگ بوو، لە پاشا بە ماتەمییەکەوە گوتی: باجی گیان نە واش و نە واش ، تۆ زۆر ماتی، منیش وەختە دڵم شەق بەرێت ئەترسم لە گەڵ کاکە شیروان عاجزیتان بوو بێت! سەبری نەختێک سەری داخست و گوتی: نەء شتی وا نییە، بەڵام تۆ ئەم قسانە لە کوێ ئەزانی؟! ڕووناک گوتی: ئاخر تۆ زۆر ماتی، تو خوا تو سەری باوکم، تو سەری حسەین و عەلی ئەگەر پێم نەڵێیت. سەبری بە تووڕەییەوە گوتی: هەی موبارەک نەبێت ئەوە تۆ موحاکەکەم ئەکەی! تووڕە بوونەکەی وا ڕووناکی عاجز کرد کە هەر زوو هەستی بە هەڵەی خۆی کرد و پەشیمان بووەوە و هەستا هات بەلایەوە و دەستێکی هێنا بە سەریدا و گوتی: ئەرێ وەڵڵا شەرمان بوو شەیتانی مەیموون تۆ چوزانی؟ ڕووناک گوتی: ئاخر ئەزانم چونکە هەر کە لەگەڵ کاک شیروان تێک ئەچێت ئەوەندە عاجزیت پێوە دیار ئەبێت. سەبری بە ماتییەوە جارێکی تریش دەستی بە سەر ڕووناکدا هێنا و گوتی: دەی گوێ مەدەرێ هەستە با بچین بە لای چێشتەکەمانەوە دەستی گرت و ڕۆیشتنە دەرەوە.

***

نزیک ئێوارە حەوشەکەیان ڕازاندەوە. سەبریش قبووڵی و بامێیەکی جوانی لێ نابوو، خۆی گۆڕیبوو نەسرینیش هەر چاوی لە دەرگاکە بوو. هەر کە تەقەی ئەهات دڵی دائەخورپا وای ئەزانی حسەینە. باجی پیرۆزیش کوڵ و بارەکەی پێچایەوە کە حەپسەخان بۆی دانا بوو، هەر لە کراس و سوخمەوە تا دەستەوارە نان و کولێرە بەڕۆن و زۆر شتی تر و نەشیهێشت بڕواتە تا لای

ئەوان شێو بکات. ڕووناکیش هەروەها هەندێ جار دڵخۆشی خۆی ئەدایەوە و شەرت و قەولی ئەبەست لەگەڵ خۆی. هەندێ جاریش ڕووداوەکەی بیر ئەکەوتەوە ترسی لێ ئەنیشت و ماتی دایئەگرت.
لە دەرگایان دا باجی پیرۆز چوو کردیەوە و لەپڕ قیراندی: ئۆخەیش شوکر حسەین گیانە هاتەوە! حەپسەخان بێنە مزگێنییەکەم! هەموو ڕایان کرد بە پیرییەوە و دەستیان کردە ملی، نەسرین نەبێ لە شەرما تۆزێ خۆی قورس ڕاگرت و دوا کەس بوو هات بەخێرهاتنی کرد. حسەین زۆر بە خۆشییەوە جوابی دایەوە. نەسرین سوور هەڵگەڕا نەیزانی چی بڵێت. حسەینیش زۆر حەزی ئەکرد بێتە نزیکییەوە تاوەکو تێر سەیری بکات، بەڵام ڕووی نەئەهات چاوی تێ ببڕێت لەبەر دایکی و خوشکەکانی. خۆ باجی پیرۆزیش کە بانگی ئەکرد کچێ نەسرین وەرە بچووە تەنیشت حسەین گیانەوە زۆرت بیر ئەکات، یا کە بە حەپسەخانی ئەگوت ئەری ئەوە کەی ئەیکەیتە باخەڵییەوە، دەی زوو شاییەکەمان بۆ بکە، هەردووکیان لە تەریقیدا سوور هەڵئەگەڕان و سەریان دائەخست. نەک هەر ئەوە تەنانەت نەسرین لێشی توورە بوو.
بەڵام لە ڕاستیشا ئەتوت لە کانگای دڵی ئەوانەوە قسە ئەکات. خۆ حسەین هەر لە دڵی خۆیا دەستخۆش و دەمخۆشی پێ ئەگوت. بەڵام حەپسەخان هەر خەریکی ماچ کردنی حسەین بوو و قسەی بۆ ئەگێڕایەوە باسی عەلی برای و خزمانی بۆ ئەکرد. لەپڕ قسەکەی بڕی و گوتی: هەستە بە ساقەت بم ئاوێ بکە بە خۆتا.
حسەین گوتی: دایەی گیان پیش هاتن خۆم شتووە و جلی پاکم لە بەر کردووە. ئەوە بەخێرێ ڕەنگی حەمامەمە! حەپسەخان پێکەنی و گوتی: بە خوا حسێن ئەوەندەی تر ڕەش و دێز بوویت، هەروام ئەزانی مانگێکە خۆت نەشتووە. سەبری خوشکی گوتی: دەڵێی گەر حسەین هەرچییەک بکات هەر قۆز و ڕەزا سووکە. ئەو پیاوە جوانی ناوێت جوانی بۆ ژن باشە. حەپسەخان گوتی: لە دەوری گەڕێم بە خوا کوڕی من زۆر پیاوە و زۆر تەبیعەت پیاوە. حسەین هەڵی دایە و گوتی: دەی دەی هەڵم دەن. ها کچێ نەسە تۆ چی ئەڵێیت. هەستایە سەر پێ و دەستی خستە ناو پشتێنەکەیە و چاوێکی گێڕا بە دەوری خۆیا و گوتی: دە دەی تۆش قسەیە بکە بزانم قۆزم وەکو سەبری ئەڵێت یا

ڕەش و دێزم وەک دایکم ئەڵێت؟! نەسرین بە پێکەنینێکی شەرماوییەوە گوتی: هەر دووکیانیت. هەموویان دەستیان کرد بە پێکەنین ڕووناک نەبێ کە بێدەنگ لە سەر کورسییەکە دانیشت بوو. حسەین چووە پشتییەوە. ڕاوەستا و هەردوو پرچە هۆنراوەکان گرت و بە ئەسپایی تۆزێ ڕای کێشا و گوتی: ها... نوونە شەیتان تۆ بۆ قسە ناکەیت. ماچێکی کرد و گوتی: بەو خوایە زۆرم بیر ئەکردی. ڕووناکیش ڕاپەڕی و هەستا هەر دوو دەستی کردە ملی و تێر ماچی کرد. هەر دانیشتەوە شێوەی دوو کەسەکەی دوێنێی هاتەوە بەر چاو، کە ئەوانیش دیارە دایک و خوشکیان هەیە و ئەوانیش وا خۆشەویستن لای کەس و کاریان و ڕەنگە هەر ئێستا چاویان لە ڕێگا بێت بۆیان. دوور نییە گەورەکەیان ژن و منالیش چاوەڕێی بکەن.

***

لە نان خواردن و چاو میوە و هەموو شتێک بوونەوە. نەسرین گوتی: ئیتر دەبێ من بڕۆمەوە، حەپسەخان ڕاپەڕی و گوتی: نا لە دەورت گەڕێم ئەم شەویش لێرە بە. مامی گوتی: ڕۆیشتنی چی! سەبری هاتە قسە و گوتی: مەڕۆ بەیانی پێکەوە ئەچینە دەرێ منیش ئیشم هەیە. حسەین لە بەر باوکی ڕووی نەدەهات قسە بکات. نەسرینیش هەر (بە خوا و ئاخر چۆنی) بوو. لەدواییدا وەک لە خوای ویستبێ چووە لای کچەکانەوە بێدەنگ دانیشتەوە. حسەین پرسی: ئەرێ بابە گیان ئیش و کارت لە چیدایە؟ باوکی گوتی: بە خوا ڕۆڵە خراپ نییە. بەڵام ڕۆژ نییە شتێک نەقەومێت لە ناو بازاڕ و ئەمن و عەسکەر بەزمێک دانەمەزرێنن. هەر نەشرەیە بڵاو ببێتەوە، ئەکەونە ناو بازاڕ و دووکان و خەڵک ئەگرن. حاجی زەردەخەنە گرتی و گوتی: ئەمە بە خێرێ (حیزب) ئیجازەی هەیە و بە ئاشکرا ئیش ئەکات! ئەی ئەگەر وەکو زەمانی نووری سەعید نهێنی بوایە چیان لەم خەڵکە ئەکرد؟! دەستێکی بە ڕیشیدا هێنا و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: بە خوا ئەم حیزب ئیجازە دانەش بە خۆشی خۆیان نەبوو. چاریان نەبوو تازە هاتبوونە سەر حوکم و دوژمنیان زۆر بوو. ئێستا وا خۆیان گرتەوە ئیتر بیانوو بە کورد ئەگرن و ئەوەتا کە وتوونە لێدان وەکو هەراکەی دوێنێی لادێییە هەژارەکان! بە کورتی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە ئینجا بە ماتییەکەوە گوتی: خۆ ئێستا کوڕم کە یەکێ ئەمرێ دۆست و ناسیاو و

خـزم نـاوێرن لەگەڵ تەرمەکەی بچـن بـۆ سـەر قەبـران. چونکـو سـبەینێ هەر ئەوەندە ئەزانن چەند کەسێکیان لێ گرت وەڵڵا دوێنێ لەسەر قەبران قسـەیان بە حکومەت گوتووە! حسەین ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: نازانم ئەمیللەتەمـان تـاکەی هەروا ئەبن و لە هەموو لایەکەوە هەر خەریکی کوشتن و بڕینیان ئەبن. بـاوکی گـوتی: لە هەمـوو شـی ناخۆشـتر ئەوەیە کە کەس نییە بڵـێ بـۆچی وایـان لـێ ئەکەن. لە هەر قـوژبنێکی دنیـادا یەکێـک ئەکوژرێـت، یـا دوو کەس لە کـاتی مەلەکردنـدا نـوقم ئەبـن، یـا یەکێک ئەچـێ بـۆ شـاخەوانی و ئەکەوێتە خـوارەوە هەموو غەزەتە و ڕادیۆی دنیا شـەو و ڕۆژ باسیان ئەکات، بەڵام بەم دەسـت و بەو دەست کورد لە ناو ئەبەن و ئەیانکوژن کەچی کەس هەر باسیشـی ناکات، نەخوازەڵا ئەوەی کە ئەم زوڵم و زۆرە ویژدانیان بجووڵێنێت، هەر هیچ نەبێ بە قسـە لە سـەرمان بکەنەوە! حـاجی نەختێک بێدەنگ بـوو ئینجـا سـەری بـادا و گـوتی: کـوڕە خۆشـمان خـراپین. ئەگەر حکومەتیش نەمانکوژێت خۆمـان یەکتـر ئەکوژین، ئەی ئەم جاشـانە کورد نین؟ کوڕە هی وا هەیە کە ئەڵێیت ڕۆژبـاش گـاڵتەت پـێ ئەکـات و ئەڵێـت: کەوش و کەڵاش و بـاوک باپیریـان بیـر خۆیـان ئەبەنەوە حسەین گوتی: وەڵڵا بابە گیان ئەبێ خۆمـان لەسـەر خۆمـان بکەینەوە. خۆمان ئەبێ شـت بین و ئەبێ یەک بین.. هەتـا ئـاوا چەنـد پـارچە بین و یەکتـر بکوژین ناگەین بە هیچ ئاواتێک. بە پێچەوانەوە ئـاواتی دوژمنەکانمـان دێنینـە دی و هەروا بێ هێزو لاواز ئەبین. حاجی باوکی گوتی: جا کوڕم خـۆ قەدیـم بە درۆ نەیـانگوتووە (بـرا لە پشـت بـرا بێت مەگەر قەزا لە لای خـوا بێ) بە خـوا ئەگەر هەموو یەک بووین و ئەم شەڕ و ئاژاوە و یەکتری کوشـتنەمان لەنـاوا نەمێنێت، دەسـت ئەکەیـن بە چـاوی هەموویانـا و ئەگەیـن بە ئـاوات. حسـەین گـوتی: زۆر ڕاست ئەفەرمووی. ئەوسا خەڵکیش حورمەتمـان ئەگرن و باسیشـمان ئەکەن و حسابیشـمان بـۆ ئەکەن، بەڵام ئەقڵـی مـن تەنیـا هەر بەیاننـامە بڵاوکـردنەوە و موزاهەرەکردن هیچ نـاکەین بە هـیچ . پێویسـتە ئێمەش دەسـت بکەینەوە ئەگینـا نەک هەر ناگەین بە ئاوات لەناویشمان ئەبەن.

خوا لێ خۆش بوو فایەق بێکەس ئەڵێ:

داری ئازادی بە خوێن ئاونەدرێ قەد بەر ناگرێ

سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ

پیاو ئەبێ بۆ سەندنی حەققی لە مردن سڵ نەکا

هەر (بڕووخێ)! بەس نییە، تاکو نەسەنرێ نادرێ

حەپسەخان گەیشتە سەریان، قسەکەی پێ بڕین و ڕووی کردە مێردەکەی و گوتی: پیرەمێرد دە واز لە کوڕەکە بێنە و ئەو خەفەتانەی مەدەرێ. پەلی حسەینی گرت و گوتی: دەی هەستە وەرە بۆ لای ئێمە. حسەین هەستایە سەر پێ و دەستێکی دا لە ڕوومەتی دایکی و گوتی: حەپسەخان تۆ چیتە بە سەرەوە؟ دیسان حەپسەخان ماچی کردەوە و گوتی: وەرە تۆزێ لای کچەکانیش دانیشە. حاجیش هەستایە سەر پێ و گوتی: ئیتر کوڕم من شەو باش، هیلاکم ئەچمە سەر جێگاکەم پاڵ ئەکەوم حسەین گوتی: کەواتە دایە ئێوە وەرنە ئێرە. کچەکان و حەپسەخان هاتن. دوای تۆزێک حەپسەخان گوتی: بە خوا من هیلاکم بە قوربان ئەمڕۆ نانمان کردووە ئەچم پاڵ ئەکەوم. شەو باشی لێ کردن و ڕۆی، ڕووناک و سەبریش هەر یەکەیان بە بیانوویەک هەستان و ڕۆیشتن هەر وەکو بیانەوێ حسەین و نەسرین بە تەنیا بهێڵنەوە. حسەین گوتی: ئای خۆ هەموویان ڕۆیشتن. نەسرینیش گوتی: با ئیتر بڕۆم منیش هیلاکم. حسەین دەستی گرت و گوتی : دانیشە کچێ بۆ کوێ ئەچی، ئەوان بۆیە هەر کەسە خۆیان دزییەوە و ڕۆشتن تاکو ئێمە بە تەنیا پێکەوە بین. نەسرین گوتی: تو خوا لە بەر مامم عەیبە نەوەکو چاوی لێمان بێت. حسەین دەستی گرت و ڕایکێشا و گوتی مامت چووە سەر جێگاکەی و چاوی لە کەس نییە و ئەگەر چاویشی لێ بوو بۆچی ئێمە چی ئەکەین تا عەیب بێ؟ ئەی حەڵاڵی یەکتر نین بەدەم قسەکردنەوە بێ ئەوەی دەستی بەر بدا ڕاست بووەوە و هات لە سەر کورسییەکەی تەنیشتییەوە دانیشت. نەسرین لەپڕ هەستا و گوتی: نە... بۆ خاتری خوا، هەموو بە خەبەرن و ئاگایان لێمانە ئەیوت و دەستی خۆی ڕاپسکان لە ناو دەستی حسەیندا و چوو بۆ لای سەبری کە لە تەنیش جێگای ئەوەوە جێگای نووستنی بۆ داخرا بوو حسەینیش هەستا چووە سەر جێگای خۆی و لە بەر خۆیەوە بۆڵاندی و گوتی: تو خوا کچی واتان دیوە هەر ئەڵێی پشیلەی سرکە! بە ڕاستی دونیا بێشەیە هەموو نەوعێکی تیایە، کچی وەکو نەسرینیش هەیە و کچی وایش هەیە سوار لە زین دێنێتە خوارەوە! ئیتر چاری نەما پاڵکەوت و خەریکی نووستن بوو.

## ٨

بەیانی دوای چا خواردنەوە حاجی ڕۆیشت. حسەینیش لەگەڵ نەسرین خۆیان ئامادە کرد بچنە ماڵی ئەوان، بۆیە حسەین بە دایکی گوت ئەوان لە ماڵی مامی نان ئەخوات و بۆ نیوەڕۆ چاوەڕێی نەکەن. سەبریش هەروا بە ماتی و عاجزی چوو خۆی گوڕی و هات بە دایکی گوت کە نەختێ ئیشی هەیە ئەیەوێ بڕواتە دەرێ دایکی بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: باشە خوا حافیزت بێت، بەڵام تو خوا تو سەری خۆشەویستت پێم بڵێ بۆ وا مات و کزی؟ لە دوێنێوە دڵم کەوتۆتە مەراقەوە و ماوەشم نەبووە کە لێت بپرسم سەبری تۆزێ ماتبوو لەدواییدا چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و بە گەروویەکی پڕ گریانەوە گوتی: بە خوا دایە چیت لێ بشارمەوە لەگەڵ شیروان تێک چووین، بە ڕاستی زۆر خراپ بووە خەریکە ئیشەکەشم لێ تێک ئەدات، زۆر وشک و ڕەقە لە گەڵ ڕەفیقەکانم وا ئەزانێ هەر ئەو هەیە لەم دونیایەدا. دوێنێ لە بەر چاوی دڵە خانی باجی فەهیم وا دەستی با دام وەخت بوو قۆڵم لە بن دەربهێنێ و تا بەردەرگاش دوام کەوت ئەیگوت هەر ئێستا ئەچم بە باوکت ئەڵێم و کە کاکە عەلیشت هاتەوە بەویش ئەڵێم. کە لێشم پرسی چی بووە ئاخر چیم کردووە؟ نابێ خۆشم بزانم؟ گوتی: ئەی ئەوە هیچ نییە کە یا هەر بە کۆڵانانەوەیت و ئەچیتە لای ئەم و ئەو، هەمیشە لە ماڵا نیت یان میوانت هەیە کەسیش نازانێ خەریکی چین! دایکی گوتی: ئێ کەواتە ئەوە بۆیە شەوێ نەهاتبوو سەرم سوڕمابوو گوتم ئاخۆ بوچی دیار نییە، لەگەڵ ئەوەشا گوێ مەدەرێ کچم شیروان کوڕێکی زۆر لێوەشاوە و پیاوە هەر ئەوەیە کە تۆزێ توندە تەبیعەت و قسەشی لە ڕووە، هیچ لە دڵی خۆیا ناهێڵێتەوە. حەپسەخان زۆری پێ خۆش بوو کە شیروان وای کردووە، لە دڵی خۆیا گوتی: ئۆ بە قوربانی بم دە برۆ دەی وەکو ئەڵێن: (دین سز ئیمان سزی گەرکە) ئنجا لەسەبری پرسی: ئێستا بۆ کوێ ئەچیت؟ با ڕووناک لەگەڵت بێت نەوەکو تووشی شەڕ بیت لەگەڵ شیروان حەز ئەکەیت مەڕۆ دەرەوە ئەمڕۆ، بزانە ئەو چی ئەڵێت سەبری بە ماتیەوە گوتی: بە خوا خۆشم دوو دڵم نەوەکو ئەو شێتە بێتە شوێنی کۆبوونەوەکەمان دیسان کەتنێکی تر بکات؟ ئاخ خۆزگە ئەو ڕۆژە ئاگات لێ بوایە ئەو کابرایە چی پێ کردین. وەکو شێت ئەینەڕان بەسەرمانا ئەیوت ئێوە بۆ شایی و کەیف و

ڕابواردن هاتوون، یا بۆ خەباتکردن و کراسی شیفۆن و سوخمەی پوولەکە ڕێز لە بەر ئەکەن و خۆتــان ئەڕازێنــنەوە، هەر وەکــو دەوری بەرد تەماشـــای ژن ئەکات زۆریشی ڕق لە دڵەخانی پوورە فەهیمە، ئەڵێت: زۆر بەدەم خەڵکەوە پێ ئەکەنێت نازانم ئەو هەمـوو قاقـای پێکەنینەی لە چییە و هەزار قسـەی ناشـرینی لای من پێ گوتووە، منیش خۆم پێ نەگیرا و گوتم: خۆ بەزینـدوویی نامـانخەنە قەبرەوە، ئەی ئەتەوێ کراسی گوێنی لە بەر بکەین و هەر بگرین؟ ئەویش گوتی نە گـوونییە و نە شـتی وا تەنکـیش کە هەمـوو سـنگ و مەمکتـان بە دەرەوەیە، حەیای جل کوردیتان برد، دەتو خوا دایە ئەمە قسەیە یەکێکی وەکو ئەو بە منی بڵێ؟ جلوبەرگی من چ بێ حورمەتییەکی تیایە خۆ من گوێ نادەمە ئەو قسانەی، بەڵام جوان نییە بۆ خۆی و پێم ناخۆشە ئەم جۆرە قسانە بکات، لای خۆی ئەو لاوە و خوێندەوارە بە خێرێ، حەپسـەخان گوتی: ڕۆڵە بە زۆری ئەو جەهـێڵانە وان، ئەوەندە شتی خراپیان دیوە و بیستووە لە هەمـوو شـتێ ئەسـڵمێنەوە. کچـم خۆ تۆ ئاقڵێ ئەبێ قسەکانی شـیروانت پـێ خـۆش بـێ، چـونکە دیـارە دڵـی لاتە و خۆشـی ئەوێیت و نایەوێت کەس پێت بڵـێ بەری چـاوت کلـی پێوەیە، ئەگەر بە تەنگ تۆوە نەبوایە هەقی چی بوو بە سەرەوە ئەویش وەکو ئەوانی تر بۆ خـۆی سەیری تۆ و ئەوانی تریش ئەکرد، ئینجا بزانە کە چەنـد کـوڕێکی بە نـامووس و بە حورمەتە. دوای ئەوەش کچی خۆم خەڵک حورمەتی خۆی و نامووسـی خۆی نە بۆ باوک ئەپارێزێ و نە بۆ برا و نە بۆ مێرد، یا دەزگیران، خەڵک بۆ خـۆی و نەفسی خۆی حورمەتی ڕانەگرێت، لای هەموو کەس سـووک و بـێ نـرخ ئەبێت. لەبەرئەوەی تۆ عـاجز مەبە لە قسـەکانی شـیروان مەعلووم ئەمـڕۆش هەر سـەر ئەدات. تاقەت ناگرێت دوو ڕۆژ لە سەر یەک نەتبینێ. بۆیە ئەڵێم نەچیتە دەرەوە باشـترە، سـەبری گـوتی: باشــە دایە نــاچمە دەرەوە خــۆ ئەمــڕۆ هــیچ ئیشــێکی ئەوتۆشمان نییە. بەس ئەبوو تۆزێ پارە کۆ بکەینەوە بۆ خێزانی ئەو گیراوانەی براون بۆ موسڵ، قەی ناکات منیش نەچـم کچەکانی تـر ئیشـی خۆیـان ئەکەن.. باش بوو هەفتەی پێشوو کوتاڵێکی باشیان بۆ کۆکردنەوە هاوڕێکانم چووبوونە قەیسەریەکەش لە مامم بەشـی چـوار کراسـێ کوردەواری جوانیـان وەرگرتبوو. سـەریان لە دووکـانی باوکیشــم دا بـوو، بەڵام پارەیـان لەو وەرگرتبـوو خـۆی

گوتبووی سابوون و شەکر و چاتان ئەوێت یا پارە، ئەوانیش گوتبوویان پارە، من نەچوو بووم هەر دڵەخان و دوو کچی تر چووبوون.
ڕووناک کە تا ئەوسا هیچ قسەی نەئەکرد ، جاربەجار نوقمی خەیاڵ ئەبووەوە و جاربەجاریش گوێی لێ ئەگرتن هەڵیدایە و گوتی: تو خوا باجی سەبری لەمەولا ئیش بە منیش بکە، منیش چیم پێ بڵێن بۆتانی ئەکەم. سەبری پێکەنی و گوتی: هەی لە نوونە ئەوەیە لە کەیەوە وا ئازا بوویت! خۆ تۆ هەمووی پێری بوو کە بە شەڕ و فەرتەنە دوو سێ نەشرەت بۆ بردم! ڕووناک گوتی: ئەوسا جیا بوو، ئێستا منیش حەز ئەکەم خزمەت بکەم. سەبری گوتی: هەی ئافەرین کچێ بەڵام یەکەم شت ئەبێ لای کەس قسە نەکەیت کەشتێکت برد بۆ یەکێک؟ زەردەخەنەیەک گرتی و گوتی: ئەی گیان ئەڵێی لەگەڵ یەکێکی ناشییا قسە ئەکەم، خۆ تۆ لە فێڵ و پێنە پەڕۆکردن و درۆی ڕێکوپێکا گرەوت لە هەموان بردۆتەوە! ڕووناک قسەکەی پێ بڕی و گوتی: سابەو خوایە من هیچ حەز بە درۆو فێڵ و شتی وا ناکەم و زۆریشم ڕق لە خەڵکی فێڵباز و درۆزنە، بەڵام بۆ ئەم ئیشە هەموو فێڵ و درۆیەک ئەکەم بۆ ئەوەی فەرمانەکەشم جێبەجێ بکەم و خۆشم دەرباز بکەم. دایکی زۆر پێ خۆش نەبوولە دڵا کە ڕووناک وای گوتوو سەبری ئافەرینی کرد چونکە ڕووناک نەک هەر منداڵ بوو زۆر جوانکیلەش بوو، ڕۆژ بە ڕۆژیش تا ئەهات جوانتر ئەبوو. لەبەر سەبری قسەی نەئەکرد و لە دڵی خۆیا گوتی: دوایی نەسیحەتی ڕووناک ئەکەم ئەترسم لەو ڕێگاوبانە تووشی شتێک ببێت. بە تایبەتی باسی ئەو ڕۆژە و گرتن و پۆلیسی لە بیر بوو، هەروەها هیی ئەو ڕۆژەی ناردبووی بۆ ماڵی وەستا ئەحمەدی خەیات، کە لە گەڕانەوەدا سەگ پەلاماری دابوو، وەک ڕووناک خۆی بۆی گێڕابووەوە، حەپسەخان کە ئەم ڕووداوانەی هاتەوە بیر وەکو شتێک ڕووناکی لا بووەوە بە منداڵەکەی جاران. ئەو کاتەی کە ئەچووە دەرێ بە بست تۆفەی لێ دوور نەئەکەوتەوە بەڵام ئێستا تۆفە لە کوێ ئەوەی پێ ئەکرێ، بە تایبەتی لەوەتەی عەلی کوڕی خەریکی دووکان و کاسپییە، پێویستی زۆر بە تۆفە هەیە وەکو ئەمیندار بە دیار دووکانەکەوەیە. ئەگینا خۆ فەقیرە تۆفە ڕۆحی لە سەر سەری هەموویانە و هەموو ئەو منداڵانە لە سەر کۆڵی ئەو گەورە بوون. ئەم بیر کردنەوەیە خەیاڵی حەپسەخانی بردەوە بۆ سەردەمی منداڵی و ئەو ماوە

دوورودرێـژەی خـۆی و خوشـکی لەگەڵ تـۆفە پـێکەوە ژیـاون. لەو ڕۆژەوە کە دایکی و باوکی مرد بوون و باوکی ئەمیش هێنا بوویە ماڵی خۆیان و ئەویش و دایکیشـی وەک کـوڕی خۆیـان تەماشـایان ئەکـرد، ئەمـانیش وەک بـرا لە گەڵـی ئەجوولانەوە. نەسـرین لەگەڵ حسـەین بەرەو مـاڵی خۆیـان ئەڕۆشـتن قسـەکانی حسـەینی ئەوەنـدە پـێ خـۆش بـوو تـا ئەیتـوانی خـۆی دوا ئەخسـت بـۆ ئەوەی درەنگتـر بـگەنەوە مـاڵەوە. حســەین باســی ڕابـواردنی ئەو مــاوەیەی خــۆی ئەگێڕایەوە کە لە شارەزوور بوو. چەند بیری کردەوە و چۆن ڕۆژ و سەعاتی ژمار دووە تا هاتۆتەوە و چۆن کاغەزەکانی ئەوەندە خوێندۆتەوە، زۆریانی هەر لە بەر کردوە و دوێنێ ئەگەر شەرمی لە دایکی و باوکی نەکردایە هەر لەوێوە باوەشـی پیـا ئەکـرد و تێروپـڕ مـاچی ئەکـرد. کە گلەیـی ئەوەیشـی لـێ کـرد کە هەمـوو چـوون بنـوون و ئەمانیـان بە تەنیـا جـێ هێشـت ئەو کـاتەش نەیهێشـت ماچی بکات، نەسرین لە دڵی خۆیا ئەیگوت: ئەی ئاگات لە دڵی من نەبوو! بەو خوایە کە دەستت ئەگرتم وەختەبوو منیش باوەشـت پیا بکەم.. بەڵام گوتم نەء شەرم و حەیا و ڕەوشـت و خووی بەرز لە هەمـوو خۆشـییەکی دنیـا بە نـرخ و گرانترە، بۆیە باشتر ئەوەیە کە ڕاوەستین تا ئەچینە ماڵ و حاڵی خۆمـان ئەوسـا هەقی هەمووی ئەکەینەوە.

***

هێشتا سەبری و دایکی قسەیان ئەکرد کە دەنگی دەرگا هات و ڕووناک ڕاپەڕی کە بچێ بیکاتەوە بەڵام سەبری گوتی: نا گیانە تۆ مەچۆ خۆم ئەچم ڕەنگە یەکێ بـێ ئیشـی بە مـن بـێ! سـەبری دەرگـاکەی کـردەوە لـووتی بـوو بە لـووتی شیروانەوە. تۆزێ حەپەساو وای هەست کرد کە دەست و قاچی ئەلەرزن، بەڵام نەء ڕەنـگە لە خۆشـی ئەوە بـێ کە چـاوی بە شـیروان کەوت، هەر چۆنێـک بـێ نەیئەزانی چییە و بۆچی دڵی وا خوربا. بەبێ قسە شیروان پێشی کەوت و چوو بەرەو هەیـوانەکە بـۆ لای حەپسـەخان و ڕوونـاک. حەپسـەخانیش کە چـاوی پـێکەوت هەسـتا و لە دوورەوە گـوتی: یـا خـوا بەخێـر بێـت بە ڕاسـتی بیـرم ئەکردی، ئەوە چەند ڕۆژە لە کوێ خۆت شـاردۆتەوە لێمـان؟ شـیروانیش گوتی: ئەوە چی ئەڵێیت حەپسـەخان مـن خـۆم بشـارمەوە؟ نە بە خـوا هەر وا نەختـێ ئیشم هەبوو. ئەمەی گوت و دانیشت. سەبرس تـۆزێ خـۆی دوا خسـت لە هـاتنە

لایان و دوایـیش بە بیـانووی ئیشـەکەیەوە چـووە ژوورەکەی خـۆی و لە درزی پەردەی ژوورەکەیەوە سەیری شـیروانی ئەکرد بزانێ چی ئەکا و چی ئەڵێت.. شیروان گوتی: ئەوە کاکە حسەین؟ ئەڵێن هـاتۆتەوە؟ حەپسـەخان بە خۆشـییەوە گوتی: ئەرێ بە خوا شوکر شەوێ هـاتەوە؟ چـوو سـەرێکی مـاڵی پووری بدات، داخم ناچێ نەیزانی تۆ دێیت ئەگینا نەئەڕۆیشـت. شـیروانیش هەر دەسـتی خـۆی هەڵئەگلۆفت ئەتگوت ئەیەوێ شتێک بڵێت بەڵام نەیئەزانی چۆن دەست پێ بکا. پا ئێستێک حەپسەخان گوتی: چی ئەخۆیتەوە شـیروان گیـان؟ ئەرێ سـەبری ئەوە تۆ چیت لێ هات؟ وەرە ڕۆڵە چایە شتێک بێنە بۆ شیروان پاش نەختێ سـەبری هات سینییەکی پێ بوو پەرداخێ شـەربەتی پرتەقاڵی لەسـەر بـوو بێدەنگ بۆی ڕاگرت و بە چـاوێکی پڕ خۆشـی و گلەییەوە سـەیرێکی کـرد، کە دی جـووڵەی نەکرد بە نازێکەوە پێی گوت: دە هەڵگرە هەڵگرە... پیرەمێرد!

هەمیشە ئەڵێ هەموو ئاڵەت و بەهـاراتی هندسـتانت خـواردووە ئەوەندە تـووڕی! ئەویش بە زەردەخەنەوە گـوتی: بێنە هەی ئـاقڵی لەسـەر خـۆی ماسـتی مەیـوو! دەسـتی بـرد پەرداخەکەی هەڵگـرت. حەپسـەخان زۆر دڵـی بەم چەشـنە ڕازوگلەیانە خۆش بوو لە دڵی خۆیا گوتی: وا دیارە هەراکەیـان ئەوەنـدە توونـد نەبـووە وەک سـەبری گێڕایەوە. شـیروان قـومێکی لە شـەربەتەکەی دا و گـوتی: مـن بۆ لای تـۆ نەهـاتووم دڵـم نەهـات دڵـی مـامە حـاجی عـاجز بکەم هـاتم لای حەپسەخان شکاتت لێ بکەم! سەبری دیسانەوە گوتی: شـکاتم لـێ ئەکەی! ئەرێ تۆ پێم ناڵێیت من چیم کردووە؟ شیروان بە مۆنییەکی دەست کردەوە و دەسـتی برد بۆ گیرفانی و بەرباخەڵی و گوتی: زۆر چاک ئەزانـی چیت کردووە، چونکە ئەمە یەکەم جار نییە پێت بڵێم، بەڵام هەمـوو قسـەکانم لەم گـوێیەتەوە ئەچێتە ژوورێ و لەو گـوێیەت دێـتە دەرەوە. زەرفێکـی دەرهێنـا و بە ئەسـپایی گـوتی ئەمەش باشە! حەپسەخان تۆزێ شڵەژا و دڵـی داخورپـا و هەر سـەیری دەسـتی شیروانی کرد و بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەکرد بزانێ چی ئەڵێت و ئەو زەرفە چییە. سـەبری کە هەسـتی کـرد دایکـی شـڵەژاوە ڕووی تـێ کـرد و گـوتی: دایە گیان شکاتی ئەم ئاغایە و ئەو قسانە بوون کە بۆم گێڕایتەوە ئینجـا ڕوی کـردە شیروان و گوتی: دەی بزانم چیت پێیە لە باسـی جل گۆڕین و چـوونە دەرەوە زیاتر. دە بڵێ دەی، شیروان کە قەڵمی بە دەستەوە بوو بێدەنگ شـتێکی لە سـەر

زەرفە کە نووسی. سەری هەڵبڕی و سەیرێکی سەبری کرد و گوتی: ئەی باسی ڕووناکی فەقیر کە هەموو ڕۆژێک ئەی نێرێت ئەم کۆڵان و ئەو گەڕەک نەشرەت بۆ بڵاو کاتەوە، تاکو لە کۆبونەوەکانا خۆتی پێوە هەڵکێشی بێ ئەوەی باکی ئەوەت ببێ کە ڕۆژێک ئەم منداڵە تووشی بەڵایەک ئەکەیت؟ ئەی ئەم باسەت بۆ حەپسەخان کردووە؟ حەپسەخان ئاهێکی پیا هاتەوە و بە زەردەخەنەوە دەستی دا بەیەکدا و گوتی: ئۆە ئەم وردە بابەتانە هیچ نین هەمووی چاک ئەکرێن.
شیروان قومێکی لە شەربەتەکەی بەردەمی دا و بە شەرمێکەوە گوتی: حەپسەخان گیان لام وایە کە گواستنەوەی سەبریش زۆری درێژە کێشا ئیتر هەقی خۆیەتی کە بگوێزرێتەوە، بۆیە ئەڵێم هەتا دوو هەفتەی تر ئەویش جێبەجێ بکەین باشترە! حەپسەخان پێکەنی و گوتی: لەمەدا لە گەڵت نیم دوو هەفتە زۆر کەمە هەر خۆمان پێ حازر ناکرێ.. شیروان سەری داخست و گوتی: باشە لەبەر خاتری تۆ با سێ هەفتەی تر بێت. سەبری خۆی گورج کرد و گوتی: ئای ئای بزانم بە کەیفی خۆتان ڕۆژ دائەنێن و هەڵی ئەوەشێننەوە بێ ئەوەی من ڕەئێکم هەبێ لە مەسەلەکەدا ، چییە بۆچی حوکمی قەرەقوشە یا دەوری بەردە؟! شیروان گوتی : دەوری بەرد بێت یان کفتە بارین بێت ئەوە ئەوهایە. سەبری لە سەرێکەوە دڵی زۆر خۆش بوو کە شیروان پەلەیەتی و زۆر بە تەنگەوەیە، بەڵام لە سەرێکی تریشەوە ئەترسا لەوەی کە شیروان زۆر زاڵە و لەوانەیە کە ئیتر چوونە ماڵی باوکیشی بە حساب و بە پرس و پرسیار بێت. ئەویش فێر نییە خۆ ئەگەر ڕۆژی دووسێ جار نەچێتە دەرەوە بۆ ماڵە دراوسێ و خزم و ئاشنا و سەرێکی ناو بازاڕ و دووکانی قوماش نەدات هەر شەق ئەبا! لە بەهانەیەک ئەگەڕا کە ئەو دوورتر خاتەوە، بۆیە گوتی: جارێ جل و شتم تەواو نەبووە، ماڵەکەشتان بۆیە و تەعمیراتی ماوە! شیروان گوتی: تا سێ هەفتەی تر هەمووی تەواو ئەبێت، ئەوە لەسەر من. حەپسەخان بە مەلوولێکەوە گووت: بە خوا بڵێم چی وا بزانم سێ هەفتەش کەمە تا تۆزێ خۆمان کۆ ئەکەینەوە. هەندێ ماتبوو وەکو شتێک بەر چاوی کە ئەوە بوو بە ڕاست خۆ وا سەبری ئیتر ئەڕوات و بەجێیان ئەهێڵێت، جێگای زۆر دیار ئەبێت و هەر ماڵەکە بێ قرەقری ئەو ناخۆشە ئنجا چی بکات؟ شیروان پەرداخە

شەربەتەکەی تەواو کرد و بە دڵێکی خۆشەوە هەستایە سەر پێ و گوتی: ئیتر بە خواتان ئەسپێرم منن ئەڕۆم، بەڵام ئێوارەش سەر ئەدەمەوە بۆ لای حسەین و چاوێکیشم بە مامە حاجی ئەکەوێت. دوای ئەو سەبریش ژوورەکەی بەجێ هێشت بە ماتییەکەوە.. حەپسەخان دڵگیر و چاو پڕ لە فرمێسک بە تەنیا لە ژوورەکەدا بوو، کە ڕووناک هاتە ژووریَ بە پەرۆشییەکەوە گوتی: دایە گیان ئەوە بۆچی ئەگریت؟...

دایکیشی گوتی: وەڵا ڕۆڵە بۆ باجی سەبریت ئەگریم، ئەو کوڕە پەلەپەلیەتی ئەبێ تا سێ هەفتەی تر بگوازرێتەوە، ڕووناک قورگی پڕ بوو لە گریان، بە دەسرەکەی چاوی خۆی شاردەوە و گوتی: بە خوا ناخۆشە.. زۆر زۆر بیری ئەکەین.. لێرەدا سەبری هاتەوە بۆ لای دایکی و ئەویش تۆزێ مات بوو گوتی: باشە دایە بۆچی تۆ ڕازی بوویت بە (٣) هەفتە؟ من حەز بە پەلەپەل ناکەم! خەریک بوو ئەویش بگری، گوتی: من بیرتان ئەکەم ناتوانم لێتان جیاببمەوە، حەپسەخان چاوی خۆی سڕی و گوتی: قەینا بە ساقەت بم خۆ ناچی بۆ شام و شیراز هەر لە شارەکەدای و دائیم پێکەوە ئەبین، با بچیتە سەر ماڵ و حاڵی خۆت باشترە ، ئینشائەڵڵا بەختیار ئەبن و زۆر بە خۆشی ئەژین. هەموو کەسێ وایە بەڵام وردەوردە ڕایەن. شکور بەس نییە لە شارێکین فەقیری وا هەن کە شوو ئەکەن ئەچنە شارێک یا وڵاتێکی تر و یەکسەر لە دایک و باوکی خۆیان و برا و کەسوکاریان دوور ئەکەنەوە. بەڵام ئێمە ئەتوانین هەموو ڕۆژێ پێکەوە بین. ڕووناک گوتی: بەو خوایە هەر لەگەڵ باجی سەبریم ئەچم ناتوانم بێ ئەو لێرە بژیم لە ئێستەوە بیری ئەکەم!.

***

## ٩

سێ هەفتە تەواو بوو ژوور و ماڵ حازر کرا بۆ بووکێ، دایک و باوکی شیروان سەریان قاڵ بوو خوشکەکانی هەموو هاتبوون، ئەوەی لە بەغدا ئەژیا لەگەڵ مێردەکەیا و ئەوەی تریان لە کەرکوکە و هاتبوو خۆی و مێرد و منداڵەکانی، دوو پووریشی لە هەڵەبجەوە، ئیتر ماڵەکە زۆر قەرەباڵغ بوو بوو خزمێکەشیان هەر بەڕێوەبوون.

خانووی ماڵی باوکی شیروان زۆر گەورە بوو، گەلێ ژووری تیا بوو، حەوشەیەکی گەورەی هەبوو باخێکی خۆشی پڕ گوڵ و دار و درەخت و مێوی تیا بوو.. دیار بوو وەختێ خۆی لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگەکان بوون، ئەگەر چی ئێستا ئەو پارە و حاڵەیان نەمابوو، بەڵام دیسان لە چاو دەوروبەرەکەیانا، تێروتەسەل دیار بوون. شیروان کوڕی بچووکیان بوو. زۆریان خۆش ئەویست، کوڕە گەورەکەشیان ژن و منداڵی هەبوو لەگەڵ ئەوان نەئەژیا، دایکی شیروان حەزی ئەکرد کچێکی جوانتر لە سەبری بۆ بهێنێ، بەڵام شیروان کەسی کەی نەچووە دڵەوە لە سەبری زیاتر، کە بە دڵ خۆشی ئەویست، بۆیە زۆر تەقەڵای دا تا دایکی ڕازی کرد.

ڕۆژی شایی هات، حەوشی ماڵی زاوا پڕبوو لە خەڵکی زۆر، ژن و کچ بە جلی ڕەنگاوڕەنگی کوردی و سەرولاگیرە و مێخەکبەنگ و ملەلیرە و بازنە و گۆی زێڕەوە کۆمەڵ کۆمەڵ ڕاوەستا بوون قسەیان ئەکرد و کوڕانیش دەور و خولیان ئەدان، ئەوەندەی پێنەچوو دەهۆڵ و زوڕنا جۆشی سەند، چەند کوڕێکی دەستی خوشک و کچی خزم و دەستگیرانی خۆیانیان گرت و کەوتنە هەڵپەڕکێ، ئیتر پەت پسا، هەر کوڕ و کچ بوون ڕایان ئەکرد و دەستیان ئەگرت و هەڵئەپەڕین. تەپەی پێ و هاڕەی مێخەک و ملەلیرە و خشەی کەوا و سورمەو دەنگی بازن و گۆ. بۆنی گوڵاو و ئارەق و خەنە و سپیاو و سووراوی هەڵپەڕکێکەران، هەل هەلەی بەین بەینی خزم و کەسی زاوا هەمووی تێکەڵ بوو بوون. هەڵپەڕکێ و شاییەکەیان وا گەرم کرد تەنانەت ئەوانەی دەستیشیان نەگرتبوو لە جێی خۆیانەوە ئەیانژەنی.

_ سەربانی دراوسێکانیشیان پڕبووبوو لە سەیرکەر کە سەیری شایی و هەڵپەڕکێکەیان ئەکرد بەتایبەتی کوڕی هەرزەکار و بە کۆمەڵ و دووان و سیان پێکەوە ڕاوەستا بوون پێ ئەکەنین و باسی هەڵپەڕکێکەرەکانیان ئەکرد:

_بە خوا ئەمەیان زۆر جوانە ئەوەی بەینی کراس شین و کراس سپێکە.

کوڕ بە خوا هەمووی هەر سووراو و سپیاوە لە نزیکەوە وا نییە، ئەوی کە ئەیگوت دە تو خوا سەیری ئەم دەڵەورچە ناکەن چۆن هەڵئەپەڕێت؟ ئەوی کە جوابی ئەداییەوە مردووت مرێ هەڵپەڕکێ ڕیازەیە با تۆزێ زەعیف بێت. لەپڕ یەکێک کە ئەیگوت تو خوا سەیری ئەم کراس سەوزە بکەن ئاخر خانم کە نازانیت هەڵپەڕیت ئیتر بۆچی دەستت گرتووە؟ لەو لاوە یەکێکی تر ئەیگوت چاو چاو ئەم کچ عەرەبە چۆن بای ئەدات، ماڵ کاولە وائەزانێت ڕەقسی عەرەبییە، بە جارێک دەستیان ئەکرد بە پێکەنین. یەکێکی کە هەڵی دایە و ئەیگوت خۆزگە لێی ئەگەڕان بە تەنیا تۆزێک بای بدایە... ئەوی تر ئەی پرسی بە ڕاست ئەوە کچی کێیە وا هاتۆتە ئەم شاییە؟

کچی موحاسیبی ئەشغالە ماڵیان وا لەسەری کۆڵانەکە.

_هەتیوو تۆ لە کوێ ئەیناسیت؟

_ئینجا کێ هەیە باوکی نەناسێت ئەوە شەش مانگ نابێت هاتۆتە سلێمانی ئەڵێن دزی وا هەر نەبۆتەوە، کل لە چاو ئەفڕێنێ.

***

سینی دانرا بە قاپی پڕ لە پلاو و سڵقاو و فاسۆلیای وشک و پلە گۆشت و دەستە نانی تیرییەوە. خەڵکەکەیش چوار و پێنج لە دەوری دانیشتن و کەوتنە خواردن. ئیتر ئەوە هەر منداڵ بوو قیرەی ئەهات و هەر ژن بوو ئاشتی ئەکردنەوە یا ئەیقیڕان بە سەریا غەڵبەغەڵبێک بوو نەبێتەوە.

_وامەکە ڕۆڵە بە گوللەی وێڵەوە بیت.

_ئاگات لە خۆت بێت دەستت چەورە جلەکانم پیس نەکەی.

_ئۆە پەنا بە خوا دەبڵێ ئەم هەموو منداڵانەتان بۆ هێناوە؟

_دە بەسە بیکەن بە خاتری خوا ئەو منداڵانە بێدەنگ بکەن کەڕ بووین.

_ئۆە ئاگرت تێبەربێت خۆ ماستاوەکەت پیا ڕشتم.

_کوڕ ڕۆڵە تۆزێ دان بە خۆتا بگرە با نانەکەمان بخۆین ئەڕۆینەوە.

_باشە، باشە، بەڵام نابێ بووکەکە بێت ئەوسا بڕۆین.
_ئۆخەیش دەنگی هۆڕینی ئوتومبێلە، بووک هات.
_کچێ بووکێ چی تا بە هەموو شەقام و کۆڵانەکانی شارا نەیگێڕن چۆن ئەیهێننە ماڵەوە، خوا ئەزانێ ئەمە هۆڕینی ئۆتۆمبیلی کێیە!!
دوای نان خواردن بووکێش گەیشتە جێ، ئۆتۆمبیل شوێن یەک کەوتبوون، هۆڕینی ئۆتۆمبیل و چەپڵە لێدان و تەپ و تۆزی گەڕەک و کۆڵان سەری لە ڕێبوار تێک دابوو، هەندێ ڕاوەستا بوون سەیریان ئەکرد، هەندێ لە ژێرەوە ئەیان بۆڵاند و جنێویان ئەدا و سەریان ڕائەوەشاند و ئەیانگوت: ئەوە خۆ شارەکەیان شێواند ئەرێ ئەوە شایی ئەم هەرایەی بۆ چییە؟ ئەوی تر ئەیگوت: کوڕە باوکم خەڵک ژن ئەهێنێت و شوو ئەکات ئیتر ئێوە ئەم قڕەقڕ و جنێو و بۆڵەبۆڵەتان لە چییە!؟ هەقتان چییە بەسەریانەوە خۆ بێ شەرعییان نەکردووە؟ خوا لێیان پیرۆز بکات....
حەپسەخان بە تەنیا لەو ماڵە چۆڵەدا مابووەوە. ڕووناک و ئامە خانی خوشکی و نەسرین و هەموو خزم و دەرودراوسێ یان لەگەڵ بووک ڕۆیبوون هەر زوو چووبوون بۆ شاییەکە. ئەویش ماتومەلوول هەر ئەسووڕایەوە و لە هیچ شوێنێک ئۆقرەی نەئەگرتوو ئەچووە ژوورێ کراسەکەی سەبری هەڵواسرا بوو، ئەهاتە دەرێ سۆڵەکانی لە بەردەرگای ژوورەکەدا ئەدی، چاوی بە هەر شوێن و شتێک ئەکەوت ئەیهێنایەوە بیر، ئەتگوت ساڵێکە لێی دوور کەوتۆتەوە ئەوەندەی بیر ئەکرد.. لە دڵی خۆیا گوتی باوکی حسەینیش وا دیارە دڵی تەنگە بۆیە تا ئێستا نەهاتووەوە مەعلووم خۆی ئەخڵافێنێ تا تاریک دایەت ئەوسا دێتەوە.. هەڵئەساو ئەچووە دەرگای حەوشەی ئەکردەوە و چاوێکی بە کۆڵانەکەدا ئەگێڕا و ئەگەڕایەوە و توند دەرگاکەی پێوە ئەدایەوە و لەبەر خۆیەوە ئەیگوت: ئەیەڕۆخۆ هەموو ڕۆشتوون بۆ شایی، کەسێک نییە بێ بەلامەوە بڵی ئەم ژنە بە تەنیا ماوەتەوە، مات و خەمبار، بابچین نەختێ دڵی بدەینەوە.. کێ ئاگای لە کێیە..؟ ڕەنگە وا بزانن ئەمڕۆ خۆشترین ڕۆژمە!! دیسانەوە ئەچووە ژێر درەختەکان دائەنیشت وەک وڕێنە بکات ئەیگوت: دایکم بۆیە خەڵک کە کچیان ئەبێ پێ یان ناخۆشە. ئاخر ئا ئەوەتا کچ گەورە ئەکەیت بە خوێنی جگەر بە هەزار قوڕ بەسەری و دەردەسەری و شەونخونی بە

دیارەوە ئەکێشێ تا پێ ئەگات و لە خەم ئەڕەخسێ ئەوسا لەپڕ یەکێک دێت و پڕی پیا ئەکا و ئەیبات بۆ خۆی... جا ئینسان چۆن پێی ناخۆش نابێ کە کچی ئەبێ؟! ئەوەتا ئێستا ماڵی ئەوان ئاوەدان ئەکا و وا منیش ماتومەلوول و کزۆڵە دانیشتووم لێرە بە تەنیا. حەپسەخان هەموو خراپییەکانی سەبری بیر چووبووەوە تەنیا چاکەکانی لە بەر چاو مابوو! دیسانەوە گوتێ: ئەگینا فەرقی کور و کچ چییە؟ هەردووکیان هەر جەرگن ئۆف ماڵی جەرگ بە قوڕ گیرێ. لێرەدا لە دەرگایان دا، گوتی: ئۆخەی ئەلحەمدولیلا ئەوە چۆن بوو؟ بزانم کێیە؟ کە چوو دەرگای کردەوە حسەین کردی بە ژوورا و حەپسەخان دڵی خۆش بوو، حسەین زانی دایکی گریاوە و چاوی سوورە و نارەحەتە، خۆشی لە کانگای دڵیا هەر وا بوو، بەڵام نەیئەبردە سەر خۆی، بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی ها حەپسەگیانم ئەوە چییتە؟

دایکی بە مەلوولی گوتی: وەڵا ڕۆڵە زۆر جێی سەبری دیارە.

_دایە چ زوو؟ خۆ هێشتا نەگەیشتووەتە جێی خۆی، وابزانە چۆتە دەرەوە و نەهاتووەتەوە وەکو هەموو جارێکی کەی.

_خۆ ڕاست ئەکەی، بەڵام هەر چۆنێ بێ ئەوسا ئەمزانی کە ئێستا یا نەختێکی تر دێتەوە، بەڵام ئەم جارە ئەزانم کە بە یەکجارەکی ڕۆییوە و مەگەر بۆ سەردان بێتەوە لامان، بۆیە دوور لەسەری ئێوە ماڵەکەم هەر بە تەواوی لا چۆڵ بووە...

_دەی دایە گیان گوێ مەدەرە ئەو چەشنە خەیاڵاتە. پێم بڵی بزانم چیمان هەیە بیخۆین؟

لەگەڵ ئەم قسانەدا دەستێکی کردە ملی دایکی و ماچی کرد دایکیشی خۆی لە دەست ڕاپسکان و بە دەنگێکی نەختێ بەرز گوتی:

_ئەیەڕۆ حسەین خۆ ئەوە بۆنی ئارەقت لێ دێ؟

_دایە ئەوە نەختێ ڕام کرد ئارەقم کردەوە!

دایکی دەستی گرت بە دەم و لووتی خۆیەوە و پێکەنی و گوتی:

کوڕە من ئەڵێم تۆ ئارەقت خواردۆتەوە ڕاکردنی چی؟ ئێستا باوکیشت یەتەوە و سا خوا بمان پارێزێت. ئامان کوڕم نەچیتە نزیکییەوە بەو خوایە پێ بزانێ ئەیکا بە فەرتەنەیە نەبێتەوە.

خەمت نەبێ دایە ئەوە ئەزانم

باشە ئەی بۆچی خواردتەوە، بەزمەکەی جاردیت بیر چووەوە؟

بە خوا دایە نیوەڕۆ لەسەر دەعوەت بووم، لەوێ چەند دۆست و برادەرێ کە دەمێکە نەمدیون زۆریان لێ کردم منیش دڵم نەشکاندن  هەروا دوو قوومم خواردەوە، ئەگینا تۆ خۆت ئەزانی کە من ئەوەندە حەز لە خواردنەوە ناکەم بە تایبەتی بە ڕۆژ.

ئۆە ڕەزای مرێ ئەو شتە پیسە وا خەڵک هۆگری بوون ڕۆڵە خۆ خوا، بە قوربانی بم بە خۆڕایی حەرامی نەکردووە؟ ئەمان لەم قسانەدا بوون حاجیش هاتەوە وە و بە ماتی کردی بە ژوورا، بەڵام کە دی ژنەکەی نارەحەتە خۆی نەختێ گەشاندەوە و بە بزەیەکی دەست کردەوە گوتی ها دایکی عەلی لە چییای؟ ژنەکەی بە کزییەوە گوتی: وەڵڵا ئەبینم دەورمان زۆر چۆڵ بووە.

گوێ مەدەرێ، دۆعای خێری بۆ بکە، باش بوو چووە ساماڵ و بەختی خۆی. سبەینێ کوڕەکەی تۆش ژن ئەهێنێ دیسان ماڵەکەمان قەرەباڵغ ئەبێتەوە، لە پاشا گلەیی چی ئەکەیت تۆ خۆشت ئەوەتا داگیر کردووە بۆ کوڕێکت و وا خەریکی کچی یەکێکی کەشی بۆ کوڕەکەی کەت ئیتر بۆچی گلەی لە خەڵک ئەکەیت؟ دنیاکە خۆی وایە و خوا وا وای کردووە.

قسەکەی تۆ ڕاستە، بەڵام وەکو خۆت ئەزانی ماڵە خەزورانی زۆرن و کوڕەکەش خۆی توورە و ترۆیە ئەترسم حاڵی باش نەبێت.

لە سەبری مەترسە.. بە هەتوویە هەموویان وەک ئەمووستیلە ئەکاتە پەنجەیەوە، یا ئەگەر من نەدەن و ناحەزی پیشان بدن وەک مشک ئەیانخاتە کونەوە.. لەگەڵ کوڕەکەش یەکتریان خۆش ئەوێ بۆیە هەر زانی لە گەڵ دایک و باوکی هەڵناکەن ماڵ ئەگوێزنەوە و ڕزگاریان ئەبێ.

ئەمانە لەم قسانەدا بوون ڕووناک و پووری و نەسرین لە شایی هاتنەوە.. ڕووناک و نەسرین بە جلوبەرگ و خشڵ و خۆڕازاندنەوە ئەوەنەی تر جوان و دڵگیر بوو بوون....

ئامە خان هەر زوو کەوتە مەتحی ماڵەکەی، کە چ مەسرەفێکیان کردبوو و چەند خەڵک هات بوون، چەند سەر مەڕیان سەر بڕی بوو حەپسەخانیش هەر لێی ئەپرسی ئەی توخوا سەبری چۆن بوو؟ چی ئەکرد؟ ژوور و ماڵەکەی چۆن

بوو؟ خەسوی چی ئەگوت؟ ئامە خانیش بۆی باس کرد. ڕووناک چووبوو خۆی بگۆڕی کە هاتە حەوشەکە لایان دی دایکی هێشتا هەر ماتەمینی دایگرتووە، هاتە تەنیشتییەوە دانیشت و دەستی کردە مل و گوتی:
دایە گیان بەو خوایە من قەد بەجیت ناهێڵم و قەد شوو ناکەم ئەگەر بشمکوژن دایکی ماچێکی کرد و خەریکی قسە کردن بوون تا حەپسەخان وتی: هەستن با بچین بنووین هەموومان ماندووین. پاش هەفتەیە بە بۆنەی باوەخونکردنەوەی سەبرییەوە ماڵی بووک زیافەتێکی گەورەیان کرد بۆ ماڵی خەزورانی و خزمەکانی، چونکە حەپسەخان ئەیویست لە بەرچاوی ماڵ خەزورانی کچەکەی خۆی دەرخات هەر زوو هەمـوو شـتێکی ئامـادە کردبـوو، خوشـکی و خوشکەزاکانی هێنا بوو بۆ یارمەتی، باجی حەلاو چەند دراوسێییەکی لە دەوری خۆیا کۆکردبووەوە هەرچی چێشتێکی خۆش و خواردنێکی کوردی ناودار هەیە بۆی لێنابوون!.
جگە لە ماڵی خوزورانی سەبری خزمانیان حسەینیش چەند ڕەفیقێکی خۆی بانگ کردبوو. سەبری زۆر دڵی خۆش بوو بە دەوری دایکیا ئەهات و دەستی ئەکردە ملی و ماچی ئە کرد، ئەویش جار و بار ئەیبردە پەنای و لەبارەی حاڵ و ئەحواڵی خۆی و مێردەکەی و ماڵە خەزووریانەوە پرسیاری لێ ئە کرد، دوای بانگی عەسر میوانەکان خۆیان کۆکردەوە بڕۆن و ماڵ ئاواییان کرد و ڕێیان گرتە بەر بە درێژایی ڕێگەش باس هەر باسی خۆشی و چاکی خواردنەکانی حەپسەخان و میواندارییەکەیان بوو. ماڵی بووکێ لە قاپ و قاچاخ و ششتن و ماڵ پاک کردنەوە و ڕێخستنەوەی بوونەوە و دانیشتن پشوویەک بدەن. حەپسەخان ڕووی کردە ڕووناک گوتی: ڕووناک گیان هەرچەندە ئەزانم ماندوویشی، بەڵام تۆ لە هەمووان مناڵ تری هەستە زوو چایەکی عەنناییمان بۆ لێ بنێ، ئەوی ڕاست بێ من ئەمڕۆ چایەکی بە دڵی خۆمم نەخوادوەتەوە.. لە قسەکە نەبووبووەوە و هاڕەی دەسڕێژ و تەقوتۆقی گوللە دڵی هەموویانی داخورپان.. حەپسەخان لە جێ خۆی هەر وشک بوو، خوشکی کێشای بە خۆیا و قیژانی: یا ڕوسووڵەڵا هاوەر بە خوا قەوما. ڕووناک ڕەنگی هەڵبرزکا و ماڵی بە لاڕوومەتیا گوتی: ئای کاکە حسەین و کوڕەکان هەموو لە دەرەوەن، حاجی مەجیدیش لە ژوورەوە قیڕانی بە سەریانا. گوتی : ئەرێ ئافرەت ئەوە چیتانە بۆ

وا شێت بوون؟ بەشک و منالە ورکە بن و تەرەقە و دەمە قاچان بتەقێنن. بەلام ژنەکان گوێیان نەدایە قسەکەی ئەو و هەموو ڕایان کردە بەردەرگا بزانن چی قەوماوە، دییان هەر خەلک بوو و ڕای ئەکرد، ئاخری نەسرین خۆی پێ نەگیرا، ڕای کرد عەباکەی هێنا و گوتی: بە خوا ئەگەر کوشتومیان ئەچم بزانم ئەم هەرایە چییە و مامی لێ تورە بوو گوتی: دانیشە کچێ تۆ بۆ کوێ ئەچی؟ حەپسەخان گوتی: ئەی چۆن هەر ئەبێ یەکێ بچێ بزانێ چی قەوماوە. کەواتە نەسە گیان عەباکەم بەرێ من ئەچم، مێردەکەی لەویش تورە بوو گوتی: باشە ئێوە بچنە ژوورێ وا من خۆم ئەچم ڕووناک بەردەمی گرت و لێ پاڕایەوە کە ئەو نەچێت چونکە لەشی خۆی نییە نەوەکا شتێک ببێ.. حاجی مەجید بە ئەسپایی ئافرەتەکانی دڕ پێ دا و جامانەکەی توونـد کردەوە و بە دوو لـۆق خۆی گەیاندە سەری کۆلانەکە. تەماشای کرد خەلک بە تاک و بە جووت خۆیان ئەکەن بە کۆلانەکانا، ناوبەناویش تەقەی تفەنگ دێت، ئەوەندەی پێ نەچوو حسەینی کوڕ و دوو کوڕی تر بە هەناسەبڕکێ ڕایان کردە لای ئەم و حسەین بەپەلە بروسکێ گوتی: بابە ئەوە تۆ چ ئەکەیت لێرە؟ زووکە بابچیینە مالەوە. باوکی بە پەرۆشێکەوە گوتی: هاتم بزانم چی قەوماوە !؟ تۆ جارێ وەرە با بڕۆینە مالەوە ئەوسا بۆتان ئەگێڕمەوە.. ئێوەش کوڕینە مەوەستن، زووکەن با بچینە مالەوە ئێرە جێی وەستان نییە. ئەمەی گوت و هەموو بەپەلە خۆیان کرد بە مالا و حسەین دەرگاکەی داخست. خەلکی مالەکەش هەموو شپرزە دەوریان دان هەریەکەیان پرسیارێکی لێ ئەکرد تا حسەین بێ دەنگی کردن، باوکی نەبێ ئارامی لە بەر بڕابوو هەر ئەیقیڕاند: دە بلێ ڕۆلە بزانم چی قەوماوە شەقمان برد، حسەینیش هەناسەیەکی هەلکێشا و گوتی: پۆلیس دایان بە سەر بارەگای پارتیدا و دایان خست، لەو دەوروبەرەش هەر کەسێکیان هاتە ڕێی گرتیان و بردیان.. ئەم تەقوتۆقەشیان گوایە بۆ ترساندنی خەلکە نەوەکا هەستن دەست بکەن بە خۆپیشاندان و هەراوهوریا، باوەڕیش ناکەم کەس بریندار بوو بێ...

ئی ئەی بۆچی ئەم هەرایە وا کتوپڕ قەوما؟

کتوپڕ نەبووە پێرێ بە پارتیان گوتووە کە بارەگاکەیان داخەن، ئەوانیش بە قسەیان نەکردوون تا لە بارەگای گشتییەوە پێمان نەلێن دای ناخەین، ئەم سەگبابانەش لە بەهانە ئەگەڕێن بۆیە کردیان بەم هەرایە...

باوکی دەستی دا بەیەکا و گوتی: لاحەولەوەلا قوەتە ئیلابیلا. ڕاست ئەکەی کورم، دیارە سەگبابانە لە خوایان ویستووە ئەگینا ئەم هاوار و تەقوتۆقەی بۆچییە.. ئێی.... کەواتە ئەوە بۆیە هەر لە بەیانییەوە پۆلیس کەوتونەتە ناو بازاڕ و بە عالەمی ئاشکرا شەڕیان بە خەڵک ئەفرۆشت... بە خوا خۆشە ئەمە ئەوانەن کەوا هەقی کوردیان ئەدا ئەشەوبیلا هەق هەر وا ئەدرێ.. کوڕ لایان بە لەعنەت لە بابی هەرە چاکیان، هەرچەندە باوەڕ ناکەم لەعنەت بەر کەسیان بکەوێ.. سەرێکی بادا و گوتی: لە سەرێکیشەوە ئەڵێم هەقمانە وامان لێ بکەن خۆ ئێستاش زۆرمان هەیە چەپڵە بۆ کەریمە شێت لێ ئەدەین و بۆی هەڵئەپەڕین و بە شان و باهوویا هەر هەڵئەدەین.. حاجی بێدەنگ بوو. ئامە خان بەپەرۆشەوە لە حسەینی پرسی وەکو بزانی زۆریان خەڵک گرتووە؟

نا پووری گیان دڵت هیچ نەکا هەر ئەو ٥، ٦ کەسە گیران کە لەبارەگابوون لەگەڵ حەوت هەشت ڕێبواری ئەزانم لە کوێوە قسە ئەکەی خەمی نەورۆز و بەختیارت نەبێ تا کرد و من بە مالا پێکەوە بووین، مامیشم هات بووەوە لە مزگەوت و لە ماڵەوە دانیشت بوو دایکی ڕووی کردە حسەین و گوتی: دە باشە بە ساقەت بم بەسە ئیتر هەستە لە گەڵ ڕەفیقەکانت بڕۆنە ژووری با ئیمشەو لێرە بنون تازە ڕۆینەوە نییە.

خۆ من هەر لە ڕێوە ئەوەم پێوتوون دایە! بەڵام دایکی فەرەیدون لەوانە نییە ڕەنگە هەتا ئێستا چەند ماڵە دۆست و خزم و ناسیاوەی بە دوادا گەڕابێ، جا ئەگەر لەم شەوەدا نەچێتەوە ئیتر ئەو هەر شێت ئەبێ و ئەداتە کێوان چونکە وای لێک ئەداتەوە کە یا کوژراوە یا گیراوە. فەرەیدوون هەڵی دایە و گوتی: بە خوا پوورە حەپسەخان قسەی حسەینە ئێستا عەباکەی لێ بووە بە باڵ و بە کۆلانانا ئەسوڕێتەوە و بۆیە هەر ڕۆیشتنەوە چاکترە.

بە قوربانەکەت بم چۆن بەم ئاخۆرانە و بخۆرانە ئەڕۆیتەوە لەوانەیە، قورعان لە بەینا بێ، تووشی بەلایەک ببێ...

خۆ قسەی دایکیشم چوونەوە خەتەرە.. هەر چۆنێک بێت جارێ مەڕۆ بەشکو دنیا نەختێ بێدەنگ ببێ. باشە ماڵەکە دوور نییە هەر بە دوو فڕکان ئەگەیتەوە.. حەپسەخان پرسی:

بۆچی ماڵیان لەکوێیە؟

ئەوەتا لە کاریزی دایکی پاشا. پوورە ئامەی گوتی:
ئەیەڕۆ حسەین گیان ئەو ناوە بە شەو زۆر چۆڵە، شەوانی تر خەڵک بە ترسەوە پیا ئەڕوا جا نەخوازەڵا ئەمشەو!.
نە پووریَ ئەو شوێنانە باشترن بۆ هاتوچۆی شەو، چونکە چۆڵن عەسکەر و پۆلیس هەر ناوێرن نزیک ئەو ناوانە بکەونەوە. ڕووناک لە لاوە گوتی: ئۆە خوا کوێریان کا...
نەختێ بێ دەنگ بوو لە پڕحەپسەخان گوتی:
ئاخۆ سەبری و ئەوان چیان بەسەر هاتبێ؟ حسەین گوتی: مەڕاق مەکە هەموویان چوونەوە ماڵێ.
ئێستا ئەبێ چەند دڵیان لای ئێمە بێ؟
دڵ لە لابوونی چی دایە بەر لە هاتنەوە چاومان بەیەک کەوت ئەوان چوونەوە ماڵی خۆیان ئێمەش ئەوەتاین لێرە! ئیتر ئەم خەیاڵانە چییە! سەیر ئێمەش هەر خەمی خۆمانە! هیچ بیرێک لەوانە ناکەینەوە کە گیراون و خوا ئەزانێ چییان لێ ئەکەن...!!
ئیتر مات و خەمبارو شپرزە بێ دەنگ دانیشتن  تاحەپسەخان هاتە قسەو لە مێردەکەی پرسی : ئەرێ پیاوەکە بۆ چی ئەو کوڕە دیار نەبوو؟ تۆ بڵێ شتێکی بەسەر هاتبێ؟
کوڕ کێیە دایکی عەلی؟ حەپسەخانیش بە زەردەخەنەیەکی تفتەوە گوتی: عەلی. عەلی ئەڵێم.. نازانم بۆچی ئەوەندە دواکەوت، دوو شەوە خەوی پێوە ئەبینم... خوا بیپارێزێ..
بە خۆڕای خەفەت بە خۆت پەیدا مەکە، کوڕ لە سایەی خواوە ساغ و سەلامەتە. شتەکانی هەموو گەیشتوون خۆیشی وا دیارە ئیشی تەواو بووە، یەک دوو ڕۆژی تر بێگومان ئەگەڕێتەوە، خۆ مناڵ نییە ون ببێ؟
جارێکی تر مات و بێدەنگ بوونەوە، لەپڕ یەکێکیان شتێکی ئەووت یەکێکەیان بە تووڕەیەوە وەڵامی ئەدایەوە، شتێکی بێ ئەهەمیەت و بچوکیانم زۆر لا گەورە نەبوو، وەکو ئەوەی ڕووناکی فەقیر دەمی سووتا گوتی: ئای ئەوە سەرپۆشێک لە میوانەکە بەجێ ماوە!. لە هەموو لایەکەوە تێبەر بوون ئەویان ئەیگوت: دە وس بە ئێستە وەختی ئەوە نییە. پووری گوتی: دە فڕێی دە چاوی سەرپۆشیش

دەربێ. دایکی گوتی: دە باشە ڕۆڵە لە جێیە داینێ تا ساحێبەکەی بۆی بەتەوە.. ئیتر سەری ئەم خەڵکە مەیەشێنە!!.

حاجی مەجید کە ویستی دوای بەو قڕەقڕە بهێنێ گوتی: ئەوە چایەک، شتێکمان نادەنێ؟ نەسرین هەستایە سەر پێو گوتی: باشە مامەی گیان هەر ئێستە چایەکی جوانت بۆ لێ ئەنێم.

***

## ١١

دوو، سێ هەفتەی پاش ئەو ڕووداوە شارەکە زۆر شڵەژا بوو، نائارامی و نارِحەتی بە گەلێ کەسەوە دیار بوو هەر کەس شتێکی ئەبیست چوار ئەوەندەی پێوە ئەنا، بۆ ئەوی دیکەی ئەگێڕایەوە. هەندێ کەوتنە سەخیرە خستن، هەر خەڵک بوو تەنەکە نەوت و فەردە ئاردی بە کۆڵەوە بوو ئەی بردەوە بۆ ماڵەوە. لەوە ئەچوو کە هەموو خەڵکی کوردستان بە تایبەتی سلێمانی و کۆیە چاوەڕوانی تەقینەوەیەک بکەن عەسکەرێکی زۆریش بڵاو بووبوونەوە بە ناو شارەکانا و بە چاوی پڕ مەترسی و گومانەوە جووڵانەوەی خەڵکەکانیا سەیر ئەکرد و ئەژمارد و بیانوویان پێ ئەگرتن، خەڵکیش زۆر دڵیان پڕبووبوو نیوەڕۆیەک حاجی مەجید لەناکاو کردی بە ماڵی ژنەکەی شپرزەیی چوو بەرەو پیری و شتی وائەوە چییە باوکی عەلی خۆ هێشتا نیوەڕۆ نەبووە بۆچی هاتوویەتەوە؟ دیسان قوڵەکەت نەهێناوەتەوە ژان؟ ئەترسم شتێ قەوما بێ یا خوا نەکرد خەبەرێکی خراپت پێ بێ؟ دەی دیسانەوە خۆت شتێ مەکە نە هیچ قەوماوە و نە هیچ خەبەرێکی خراپم بیستووە و نەقۆڵیشم ئێشێ.. جارێ خۆ تۆ ماوەی ئەوەت نەداوە کە مژدەی هاتنەوەی عەلێت بدەمێ... ئۆخەی یاخوا بەخێر بێتەوە.. یەڵام بۆ تۆ وا ڕەنگت تێک چووە؟ بۆ بەم چێشتنگایەوە هاتوویتەتەوە؟ تاقەتم نەبوو دیسانەوە ناو بازاڕ پڕبوو بوو لە عەسکەر و مەسکەر. هەر بە ئاشکرا شەڕیان بە خەڵک ئەفرۆشت، بە ناهەق میوە فرۆشەکامیان دایە بەر شەق گوتیان فیکەت بۆ کێشاوین. وەڵڵای چەند تۆ فیکەت بۆ کێشاوون ئەویش ئەوەندە! قوڕ بە سەرە هەر هەقیشی بەسەر ئەوانەوە نەبوو بۆی خۆی گۆرانی بە سەر میوەکانا هەڵئەدا... ئیتر ئێمەش زۆرمان دووکانەکانمان هەڵگرت هەر کەس چووەوە بۆ ماڵی خۆی. ڕاستە ئەوەی ئەوان لە شەڕ ئەگەڕان و ئێمەش بەم حاڵەوە پیاوی شەڕ نەبووین. حاجی سەرێکی بادا و گوتی: بە ڕاستی زۆر ناخۆشیان کردووە، خەریکە لە تام دەرئەچێ کەس ئەم خەدرەی پێ قبووڵ ناکرێ وەک ئەڵێن: جام کە پڕ بوو لێ ئەڕژێ. ژنەکەی بە کزییەوە گوتی: لە سەرێکەوە ئەڵێن خۆزگە عەلی نەهاتایەوە ئەترسم تووشی شتێک ببێ ئەی حسەین کوا ئەو بۆچی نەهاتەوە؟ ئەو چوو بۆ لای عەلی، قەولە تۆزێکی تر بێن بۆ ئێرە.

لای عەسر عەلی و حسەین کردیان بە ماڵ بە دەست و دیارییەکی زۆرەوە کە عەلی بۆ دایک و باوکی و خوشکەکانی هێنا بوو، دایکی دەستی کردە مل و کەوتە ماچ کردن و بۆن پێوەکردنی و گوتی: لە دەورت گەڕێم ئەوە بۆچی ئەوەندەت پێ چوو؟ بە خوا دایە گیان هەر وا فریا کەوتم، لە بەغداش وەزع باش نەبوو لەوێش کوردیان ئەگرت تا لە ئیشەکەم بوومەوە سێ ئوتێلم گۆڕی لەپاشان ناچار بووم چوومە ماڵی مامی نەوبەهار، چونکە دابوویان بە سەر دوو سێ ئوتێلا خەڵکێکی زۆر تەلەبەی کوردیان گرتبوو، باوکی پرسی: ئەی لەوێ مەقەری پارتیان داخست؟ لەوێ تاوەکو ماوەیەک هێشتیانەوە، بەڵام وەک داو وابوو نابوویانەوە بۆ ئەوەی بزانن کێ هاتوچۆ ئەکات تا بیانگرن ڕۆژێ خۆم لەوێ بووم کە گوتبان وا هاتن ئەڵێن بۆ هەندێ کەس ئەگەڕێن ئیشیان بەوە باش بوو شوێنەکە دوو دەرگای هەیە تا ئەوان هاتنە ژووری ئێمە لە دەرگای پشتەوە بۆی دەرچووین ئیتر من پێم نەکرا سەری لێ بدەمەوە، بەڵام وەکو بیستم ئەویشیان داخستووە و هەموو کەلوپەل و شتەکانیشیان دەست بەسەرا گرتووە، خۆ بۆ داخستنی ڕۆژنامەی خەباتیش وەکو ئەزانن، دەمێ بوو لێی بە بەهانە بوون بەرامبەر بە کردەوە ناڕەواکانی حکومەت چونکە لای خەڵک بووبوو بە تاقە ڕۆژنامە کە ناڕەزایی خۆی و گەل بەرامبەر بە کردەوە ناڕەواکانی حکومەت بە سەربەستی دەرببڕێت. خۆ لەم دواییەدا هەروا سەعاتی پاش بڵاوکردنەوەی لە بازاڕا نەما هەندێ ڕۆژیش دانەی بە دیناری دەس نەئەکەوت ناحەزەکانی قاسم ئەوەندە بە دڵیان بوو هەر ئەیانقۆستەوە.

باوکم ئەو قسانەی زۆر لا خۆش بوو وەک شتێ ئەیانگەڕانەوە بۆ کاتی لاوێتیی خۆی، کۆمەڵێ هەست و خەیاڵی لە دڵا ژیانەوە بە گەرموگوڕییەوە گوتی: دەی دەبا ئیتر هەستنە سەرپێ و شتێک بکەن، هەق نییە گوێ بدەنە قسەی ئەو ترسنۆکانەی لە بێورەییدا ئەڵێن کوردی فەقیر چیی پێ ئەکرێ؟ کێ دەستی ئەگرێ؟ و چۆن هەروا بکەونە شاخ و کێو؟ بە ئەقڵی من چەک نییە لە هەستی سەربەستی ویستن و وڵات ئازاد کردن و گەلی چەوساوە و ژێردەست

ڕزگارکردن بەهێزتر و کاریگەرتر کورد ئەبێ بە ئیمان و بەهێزی شان و بازوو ڕۆڵە نەبەزەکانی خۆی بە عالەم بناسێنێت و پەنجەبکات بە چاوی ئەو کەسانەدا کەوا دان بە هەقدا نانێن و نالێن کە کوردیش میللەتێکە و ئەرز و وڵاتی خۆی هەیە و هەموو شتێکی جیاوازە لەو میللەتانەی کە لەگەڵیان ئەژی، بە ڕاستی سەیرە خۆ هەر ئەڵێی کوێرن ئەگینا منالێکیش ببەیتە ئەو شاخانە بەرەو کوردستانی ئێران و بەرەو ژووریش بۆ لای بادینان و شاخەکانی کوردستانی تورکیا ئەزانێت کە ئەوە هەمووی یەک وڵاتە و یەک میللەتە، مەسەلەکەمان لە ڕۆژی ناوەڕاستی ئاسمان دیاتر و ئاشکراترە: زاڵم و زۆردار هاتوون وڵاتەکەمانیان داگیر کردووە و هەریەکەیان خستووەتە سەر دەوڵاتی خۆی... هیچ چارە نییە لەوە بەولاوە هەستنە سەرپێ و شتێک بکەین... دەست لە دەست و قەوەت لە خوا... حاجی هێشتا لە قسەکانی نەببووەوە کە دیمەنێکی هەندێ ئەنجامی ئەو چیشن هەستانەی بە مێشکدا تێپەڕی وەکو ئەوەی لەوانەیە شارەکەیان کاول کرێت، دوور نییە کوڕەکانی و برازاکانی، خوا نەکرد، شتێکیان لێ بێ، ئەی خەڵکی تر و ماڵومناڵیان؟ ئەی دوکان و بازاڕ و کاروکاسبیان؟ خۆ حەپسەخان هەر کە کوڕەکانی لێ دوور ئەکەونەوە ئیتر بەندی دڵی ئەپچڕێ، ئەی کچەکانی؟ لەپڕ زوڵم و زۆرەکەی ئەهاتەوە بیر ئینجا وەک دوعا بکا گوتی: دەی لەسەر تۆ خوایە هەرچی تۆ نەیکەی نابێت.

***

دنیا بەرە و پایز ئەچوو خەریک بوو ساردی ئەکرد، ڕەشەبا گوڕی دابووە خۆی هەرچی خۆڵ و زیخ و تەپوتۆزی گوێسوانەکان هەبوو ڕای ئەماڵی... ئەتوت ئەویش ئەیەوێ هونەری خۆی دەرخا نەوەکا خەڵک لەبەر سەرقاڵی خۆیان لە بیر چووبێتەوە، جار بە جار خاوی ئەکردەوە و دیسانەوە گوڕی ئەدایەوە خۆی... چیغ و میغی هەڵئەکەند و تووڕ ئەدا و سینییە دۆشاوی تەماتەی قلْپ ئەکردەوە، یا پڕی ئەکرد لە تۆز و خۆڵ... ئیتر ئەوە هەر کچ و ژن بوون بە بانانەوە و خەریکی کۆکردنەوە و داپۆشینی شتەکانیان بوون، بەڵام هێشتا هەنگاوێ دوور نەئەکەوتنەوە ڕەشەبا نەک هەر ڕەنجەکانیانی ئەبرد شاڵاویشی ئەهێنا بۆ سەر و پۆتەڵاک و کەواو و کراسەکانیشیان هەر

ئەوەندەیان ئەزانی ڕەشەبا خۆی ون کرد، کەچی پاش تۆزێ هەڵی ئەکردەوە، ڕاست ئەتگوت چاوشارکێیان لەگەڵ ئەکا..

زۆر کەس عادەتیان بوو کە لەم حەلانەدا سرکە دروستکەن و ترشیات ئەکەن و بەڵام ئەمساڵ گەلێکیان ئەمانەیان نەکردە ئەیانگوت جارێ با بزانین دنیا چی بەسەر دێت؟ هەندێ کەسیش هەر وەک و ئاگایان لە هیچ نەبێ وا ئەجوڵانەوە، بۆیە بەرچنە ترێ ڕەشەکەی جوانیان لە حەوشەکەیانا ڕیز ئەکرد کوپەڵەیان ئەهێنا و تەشت و سەبەتەیان پڕ ئەکرد لە ترێ ڕەشکە و ئایانکردە کوپەڵەکانەوە و ئەیانبردە ژێر خانەکەیانەوە.

***

چێشتەنگاوێک عەلی لەناکاو کردی بە ماڵا بە شپرزەیی پرسی: دایە ئەوە کوا حسەین؟

- لەماڵ نییە. بۆچ بەقوربانەکەت بم هیچ قەوماوە؟ لەبەر دڵی دایکی گوتی: هیچ ئیشێکی خۆم پێیەتی، لەپاش نەختێ گوتی: ئەی کوا ڕوناک بۆ دیار نییە؟
- تۆزێ لەمەوبەر چوو بۆ لای سەبری. عەلی چووە بەردەرگا، لە شپرزەییدا نەیئەزانی چی بکات، دوای نەختێ هاتەوە لای دایکی و گوتی: ڕاستت ئەوێ دایە بۆ ئەوە هاتووم پێیان بڵێم کە لەوانەیە دووسبەی ببێ بە هەرایە بۆیە وای بە باش ئەزانم کە هەمووتان پێکەوەبن یا لە ماڵی ئێمەبن یا لە ماڵی مامم، دایکی موچڕکێکی ساردی بەلەشدا هات و گوتی: بۆچ چی بووە؟ تخوا عەلی گیان پێم بڵێ چی قەوماوە و ئەبێ بە هەرای چی؟ ئەلی لەسەرخۆ گوتی:
- باشە جارێ شپرزە مەبە و مەشڵەژێ.. خۆ هەر ئێمە نین هەموو شارەکەیە.. عەلی کە دی دایکی زۆر تێکچووە بۆ ئەوەی نەختێ زاتی بخاتەوە بەر گوتی: دایە ئەمە هیچ لە تۆ ناوەشێتەوە، خزمان ئێستەش باسی ئازایەتی تۆ ئەکەن کە چۆن ئەوسا کە خاڵم کوردایەتی کردووە یارمەتیت داوە و شتت بۆ شاردۆتەوە و نامە و نووسراوت بۆ هێناوە و بردووە کەچی ئێستا خەریکی هەر بە قسەیەک ورە بەردەی.

- ئەوی ڕاسـت بـێ عەلـی گیـان هەمـوو ترسـەکەم هەر لەبەر تـۆ و حسەینە... زۆر دڵم لاتانە.
- ئاخر مەسەلەکە ئەوە ناهێنێ، چونکە جارێ هیچ نەقەوماوە. ئەمەی من ئەیڵێم تەنیا ئەگەربڕە.. چونکە پارتی داوای کردووە کە ڕۆژی (٦)ی ئەیلول لە هەموو شـارەکانی کوردسـتان مـانگرتنێکی گشـتی پێـک بهێنرێت بەبۆنەی بیرەوەری ڕۆژی ڕەشـی ئەیلولی (١٩٣٠)ەوە و بۆ پیشاندانی یەکێتی و ناڕەزایی گەلەکەشمان بەرامبەر بە کردارە ناڕەوا و دوژمنەکانی حکومەت بەرامبەر بە کورد و مافە ڕەواکانی، ئینجا دور نییە کە میریش ئەمە بکا بە بیانوو بۆ دەسوەشاندن لەبەر ئەوە بەلای منەوە ئەوەیە کە هەمووتـان لەشـوێنێک بـن بەم قسـانە حەپسـەخان هاتەوە سەرخۆی و گوتی: کە مەسەلەکە هەر ئەوە بێت، بەلای منەوە ماڵی ئێمە باشترە چونکە لە هی ئەوان گەورەتریشە وە شوێنەکەشی چەپەکە. تۆش نەوبەهار بێنە و با ماڵی ئامەی خوشکم و نەسرین و ئەوانیش بێن.. ئەی سـەبری چـۆنە؟ خـۆزگە ئەویـش ئەهـات لەگەڵ شیروان.
- ئینجا بۆ نەیەن؟ هەر ئێستا ئەچم بە هەموویان ئەڵێم کە لە سبەی ئێوارە بێنە ئێرە.

***

بوو بە شەشی مانگ و شار بە جارێک هەمووی مانی گرتبوو دووکان و بازاڕ هیچ شوێنێک نەبوو، حکومەت هەر شێت بوو بوو لە داخانا نەیئەزانی چی بکا، خەریــک بــوو بەزۆر دوکانیــان پێبکــاتەوە، بەڵام ئەوەش ســەری نەگــرت، مانگرتنەکە زۆر سەرکەوتو بوو، خەڵک هەموو یەک دڵ و یەکدەست بوو وەک و یەک خێزانیــان لێهــاتبوو، دەوڵەمەنــد و فەقیــر، وەک و بــرا لەپشــت یەکەوە وەســتابوون و هەمــوو لەژێــرەوە پەیمانیــان لەگەڵ یەک ئەبەســت، ئەو ژمــارە کەمەش کە وەزعەکەیان بەدڵ نەبوو لەترسانا تۆقی بوون نەیان ئەوێرا ورتە بـکەن دوای مـانگرتنەکە بە دوو سـێ ڕۆژ ڕۆژێـک، حسـەین بە پەلە کـردی بە ماڵی مامیدا پوری بەپەرۆشـەوە هـات بە پیرییەوە و گوتی: حسـەین گیان ئەوە چیتە؟ بۆ وا ڕەنگت هەڵبزڕکاوە؟ حسیەن تۆزێ منگە منگی کرد بەڵام پوری لێی نەدەبوەوە گوتی: بەسـەدەقەت بـم بەقوربانـت بـم لەڕێی خـودا وا هەنـاوم بەربوەوە بڵێ بزانم چەبووە.

حسەین بە زەردەخەنەیەکی کاڵەوە گوتی: ئۆە پووری.. دیسان خۆت بوورانەوە، بەوخوایە تۆ و دایکم بەتەواوی سەرتان لێشێواندوین نازانین چۆن قسەبکەین و چۆن بجوڵێینەوە حسەین کە دی پوری خەریکە بگری بەپەلە لێی نزیک بوەوە و دەستی کردە ملی و گوتی:

نا نا پورێ گیان لەسەر گریانمان نەکردووە...

ئـامە خـان بە پشـتی دەسـتی چـاوی خـۆی سـڕی و نەختـێ زاتـی خسـتەوە بەر خـۆی بە ئەسـپایی بە حسـەینی گـوت: دەباشـە بڵـێ بـزانم چە بـووە.. حسـەین بە دودڵییەوە گوتی:

- دەنـگ بـڵاوە کە لە دەربەنـدی بازیـان هێـزی حکـومەت و عەشـایەری کـوردی شــەڕیان بــووە، ئەڵــێن میــری ویســتویەتی عەســکەرێکی زۆر بنێــرێ بــۆ ســلێمانی و هێــزی عەشــیرەتە کوردەکــانیش ڕێگەیــان پێگرتوون.. ئامە خان کە ئەمەی بیست دەست و قاچی سارد بوونەوە، دەم و لێـوی وشـک بـوو، پـاش نەختـێ وەک لەگەڵ خـۆی قســەبکات گوتی:

- هەی قوور بەسەرمان دوور لە سەری ئێوە... جا ئەبێ چی بکەین؟ ماڵمان کاول ئەکەن ئەم سەگبابانە.. قیر سیا لە مەڵ بەڵام ئێوە چۆن ڕزگارتان ئەبێ لەدەستیان؟.. ئەی کوڕەکان لە کوێن؟ حسەین گوتی کوڕەکان ئەوەتان لەگەڵ کاک عەلی، خەمی ئێمەشتان نەبێ هەروا چەند ڕۆژێک خۆمان ون ئەکەین، هەر دنیا تاریکیش بوو بۆی دەرئەچین. تا لەشکرەکە نەگاتە شار لەوانە نییە حکومەت دەست بووەشێنێت بۆیە تا زوتر بڕۆین باشترە...
- ئامە خان ئەوەنەیتر بەڕاسی بڕا.. پاش نەختێ حسەین سەرێکی بادا و گوتی: ناشزانم چۆن بە دایکم بڵێم و چۆن تێیبگەیەنم کە ڕۆیشتن باشترە لەوەی لێرە لەبەر دەستیانا دانیشتین. دەی پورێ گیان با هەندێ جل بۆ کوڕەکان بەرین و بڕۆین بۆ ماڵی خۆمان، ئەوانیش کە تاریک داهات ئەچنە ئەوێ، حسەین بۆ ئەوەی پوری بهێنێتەوە سەرخۆی هەندێ قسەی خۆشی بۆکرد لەوانە کە ئەو زۆر پێیان پێئەکەنێ، لە پاشا دەستێکی دا بە شانیا و گوتی: دە هەستە ناوی خوای لێبێنە با جلی کوڕەکان کۆبکەینەوە و بیان بەین و بڕۆین.. پوری هەستا بەڵام لەوە نەئەچوو باش ئاگای لە خۆیبێتیەک دوو جار چووە ژورێ و هاتەوە دەرێ جارێ خاولییەکی ئەگرت بە دەستەوە و جارێ جوتێ گۆرەوی. چاوی تاریک بوو بوو دەستی ئەلەرزی نەئەیزانی نەئەیتوانی جل و بەرگی بۆ کوڕەکان بخاتە جانتاکەوە. بۆیە حسەین پێیگوت: کە ئەو وازبێنێت ئەم خۆی بۆیان ئامادە ئەکات.

پوری قوڕگی پڕ بوو لە گریان و گوتی: باشە ئەی بۆچی خۆیان نەهاتن کەل و پەلی خۆیان ببەن؟ تخوا حسەین گیان چییان بەسەر هاتووە؟

- وەڵا بەسەری باوکم و مامم هەموو سەلامەتن و هیچیان بەسەر نەهاتووە. بەڵام پۆلیس و ئەمن چوبونە دوکانەکەی عەلی هەواڵی ئەوانیشیان پرسیبوو، باش بوو کەسیان لەوێ نەبو بوون، تەنانەت شاگردەکانیش، هەر تۆفە لەوێ بوو بوو بەتاقی تەنیا ئەویش هەر زوو دوکانی پێچابوەوە و چوبوو پێی گوتبوون، ئەوانیش چوبونە ماڵی ڕەفیقێکی بێناونیشانمان لەوێ ئەبن تا تاریک دایەت ئەوسا یەنەوە

ماڵی خۆمان و لەوێوە بۆی دەرئەچین، ڕوناک و نەسرینیش لە ماڵی سەبرین، خەبەرم بۆ شیروانیش نارد، ئەوانیش ئێستە ئەڕۆن بۆ ماڵی ئێمە چونکە شیروانیش ناوی هاتووە!

- ئامە خان عەباکەی دا بەسەریا و گوتی: دەسەڵات چییە ڕەزام بە ڕەزای خوا، هەرچی خوا نەیکات نابێت.. و ئیتر بە بۆڵە بۆڵ و ورتە ورتەوە پێڵاوەکانی لەپێکرد و شوێن حسەین کەوت، بەرە و ماڵی خوشکی کەوتە ڕێ.

حسەین و پوری گەیشتنە ماڵی حەپسەخان ئەویش ئەگەرچی بە ڕوویەکی خۆشەوە چوبو بەپیریانەوە بەڵام تۆزێکیش داخورپا لەم هاتنە کتوپڕەیان بە تایبەتی کە حسەین گوتبوی ئەمڕۆ نەختێ درەنگ دێمەوە و خوشکیشی مەتەمینی چڕوچاوی شێواندبوو. حسەین هەرچەند ویستی بە قسەی خۆش بیهێنێتە پێکەنین ماتییەکەی پوری لە چارەی نەئەبووەوە، بۆیە دایکیشی هەتا ئەو زۆرتر لەسەر قسە خۆشەکانی ئەڕۆیی زیاتر دڵی ئەکەوتە مەراقەوە و هەستی ئەکرد کە شتێک قەوماوە، بۆیە ناو بە ناو قسەکەی پێئەبڕی و پرسیاری وەزعی لێئەکرد، لە دواییدا حسین ناچار بو بە بەهانەی هەندێ ئیشەوە بچێتە ژورەکەی جل و کەل و پەلی ڕیشتاشین و خاولی و ئەوشتانەی کە پێویستی پێیانە بخاتە جانتا بچوکە دەستیەکەیەوەو لە پەنایەکی ژورەکەدا داینێ و خەریک بو بچێتەوە بۆ لای دایک و ئەوان گوێی لێبوو دایکی بە خوشکی ئەگوت: ئامە شتم لێمەشارەوە، تو قەبری باوکمان، چی قەوماوە و پێم بڵێ دڵم تەقی، حسەین کە گوێی لێبوو بە ئەسپایی کشایەوە دواوە و لەبەر خۆیەوە گوتی:ئۆخەیش ئێستە پوری لە دەردی سەری پێگوتنی حەپسەخان ڕزگاری ئەکا.

پورە ئامەی دایە هاڕەی گریان و بەدەم هەنسکەوە گوتی: شەر دەستی پێکردوەو ئەبێ ئیمشەو کوڕەکان بچنە ئەو کەژ و کێوە.. ناویان هاتووە کە بیانگرن، پۆلیسیش چووبووە سەر دوکانی عەلی بەڵام شکور کەسیان لەوێ نەبوبون. حەپسەش لە خوشکی خراپتری بەسەرهات کەوتە باوکەڕۆ و برا ڕۆ، بە چەپۆک بەربووە سەر و

پۆتەڵاکی خۆی، حسەین بە پەلە هاتە دەرەوە و دەستی گرت و کەوتە ساردکردنەوە و دڵدانەوەی، ئەویش هەر بەدەم گریانەوە گلەیی لێئەکردن کە بۆچی زوو ڕاستی پێنەگوتووەو لەبەر چی ئەو دەنگوباسانە لەو ئەشارێتەوە...؟

حسەین کە دی دایکی نەختێک ساردبوەوە پێی گوت:

- ئەوی ڕاست بێ لەم حاڵەت ئەترسام بۆیە خۆم خەبەرەکەم نەدایتێ، ئێستەش پرسیارێکت لێئەکەم بە ئەقڵی تۆ ئێمە لێرە دانیشین تا یەن ئەمانگرن، یا بۆ چەند ڕۆژێک بچینە شوێنێک ئەمین باش لەو شاخ و کێوە جوان و خۆشانەی خۆمان وەک و سەیرانکەر ڕابوێرین تا بزانین دنیا چی بەسەر دێت؟؟

دایک چاوی سڕی و هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: وەڵا بچن باشترە.. قسەکەی کرد و دایەوە هاڕەی گریان سەرێکی باداو گوتی: خوایە ئەوە بۆ وا یەکجارەکی بەقوڕت گرت؟نیازتان هەیە بۆ کوێ بچن؟ ئامە خان هەڵیدایە گوتی: ئینجا بۆ هەرکوێیەک بچن خۆ تا خەبەری بە سەلامەتی گەیشتنە جێیانمان پێئەگات جەرگ و هەناومان بەرئەبێتەوە.. ئەمەی گوت و هەردو دەستی خستە باوەشییەوە، فرمێسکیش هۆن هۆن بە چاوەکانیا ئەهاتە خوارەوە، حسەین ئەمجا چوو بەلای پورەیەوە و کەوتە دڵدانەوەی سوێندی بۆ ئەخوارد کە هەتا یەنەوە، لەهەر شوێنێکبن هیچ ڕۆژێک بێ کاغەزیان نەکەن.

لەم کاتەدا دەنگی دەرگای حەوشە هات، حسەین ئەگەرچی لە ترسی دایکی و پوری شڵەژانی خۆی دەرنەخست، بەڵام تۆزێ سڵەمییەوە ئەوسا چوو بە دەنگەکەوەو تا لە درزی دەرگاکەوە سەیرێکی نەکرد نەیکردەوە، شیروان و سەبری و ڕوناک کردیان بەماڵا، ئەوانیش ڕەنگ هەڵبزڕکاو و نارەحەتبوون حەپسەخان و خوشکی بە دەنگێکی نزم و بێ تین بەخێرهاتنیان کردن، سەبری جانتای جلەکانی شیروانی لەژێر عەباکەی دەرهێنا و داینا لای خۆیەوە، ڕوناک حەپەسابو نەسرینیش ماتەمینییەکی زۆر دایگرتبوو بەڵام لە هەموویان وورەی باشتر بوو.

ئەوەنـدەی پێنەچـوو هەردوو حـاجیش هـاتنەوە، چـونکە تـۆفە هەمـوو شتێکی پێگوتبوون زۆری لەسەر نەڕۆشتن ئەیانوویست خۆیـان بێبـاک پیشــان بـدەن، بەتــایبەتی حــاجی مەجیـد. ســەیرێکی ژنەکەی کـرد و بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: دایکی عەلی ئەوە چیتە؟ دایکی عەلی جوابی نەدایەوە خوشکی هەڵیدایە و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- ئەی بــۆچی نــازانن کەوا شـــەر دەســتیپێکردووە و لەترســـی گــرتن کوڕەکان ئەبێ لەشارا نەمێنن..؟
- ئنجـا قســەی چــی ئەکـات؟ ئەڕۆن خوایـان لەگەڵبـێ هەمـووی چەنـد ڕۆژێکە.. وابزانن ئەچن بۆ گەڕان.. ژنەکەی لەژێرەوە خێسەیەکی لێکرد و گــوتی: ئەرێ ئەوە لەکەیەوە وائــازابوی حــاجی گیــان؟ ئەچــن بــۆ گەڕان!؟ خوا هەقە. غەڕان هەروا ئەبێت...؟
- ئەمـانە لەم قسـانەدا بـوون و عەلـی و نەوبەهـاری ژنـی و تـۆفە و دوو کوڕەکەی ئامە خانیش هاتن. حاجی مەجید گوتی:
- سەیران و گەڕان بێ یـا هەڵاتـن و ڕاکردن ناچـارن ئەبێ لەبەردەستی ئەم زۆردارانەدا نەمێنن، دەی خوا لەسەر هەقە، هەستن شتێکمان بەنـێ با بیخۆین!

نانیان خوارد و بەزۆر هەندێ تێشوویاندانێ، نزیـک سـەعات دەی شـەو کوڕەکـان هەسـتان و وتیـان ئیتـر بەسـە بـا بـڕۆین! تـۆفە ئەیویسـت لەگەڵیـان بچێـت کوڕەکـان نەیانهێشـت، حـاجی هەوڵیـدا کەوا دوور و نزیـک دوویـان کەوێـت تالەشــار دەرئەچـن ئەوەشـیان قبـوڵ نەکـرد، خواحافیزییان لەیەک کرد و ملی ڕێی شاخیان گرتەبەر.

ئەوانەی مانەوە تا ماوەیەک ئەوەندە شڵەژاوبوون خۆشیان نەیانئەزانی چی بڵێن و چی بکەن بۆیە پاش نەختێ قرە قر و پێکهاتن کز و مـات دانیشتن ماوەیەکیش وەها مانەوە دەست لەسـەر دڵ و گوێ هەڵخسـت و دووای بە ناچـاری هەریەکەیـان چـووە سـەر جێگـا بەهیـوای نوسـتن، بەڵام خەوی چـی، هەریاکەیـان خەیـاڵێکی لەمێشـکا بـوو، کە هەر خـوا خــوای ئەوەی بــوو حســەین ڕۆژی زوتــر لەشــارەزور بگەڕێــتەوە و کاسبییەکەی بەدڵـی خۆیبێت و ئەم پایزە شـاییەکەیان بکەن کەچـی وا

حسەین ڕۆشت خوا ئەزانێ کەی ئەگەڕێتەوە و وەزعی ئەمان و دنیا چی لێدێت.. ئیتر ئەوە هەر خەیاڵبوو ئەیبرد و ئەیهێنا و ئەیخستە ناو گێژاوەوە، ئەی سەبری چۆن خەو بچێتە چاوی کە هەمووی دوو مانگ نەبووە کە شووی کردووە لەگەڵ مێردەکەی ڕۆحیان لەسەر سەری یەکە، شیروان تاکو بازاڕ یا بۆ دەرەوە ئەچو ئەم سەعات و دەقیقەیی ئەژمارد تا ئەهاتەوە، کەچی ئێستا وابەئاسانی و کتوپڕ لەباوەشیان دەرهێنا؟ بەڕاستی دنیا سەیرە! شتی وای تیا ئەقەومێ بەخەیاڵی کەسا نایەت، بۆیە سەبریش هەر ئەمدیو و ئەودیوی ئەکرد بە ئەسپایش ئەگریا.

نەوبەهاریش کەوا ساڵێکە شووی کردووە و سکی دوو، سێ مانگە بیری لەوە ئەکردەوە کە بە بەزم و هەرایەک پێک گەیشتن، و چۆن و چەند جار تەنانەت پاش مارەکردنیش سەبارەت بە گیروگرفتی براکەی و هەندێ خزمانی خەریک بوو ئیشەکەیان هەڵوەشێتەوە، چونکە براکەی قەولی دابو بەهاوڕێیەکی خۆی کە ژنبەژنی پێبکا لەگەڵ خوشکی ئەو هاوڕێیە ئیتر هەتا بەینێک هەر هەراو هوریاو پەلاماردان و چەقۆ لەیەک هەڵکێشانبوو.. وا ئێستەش عەلی ڕۆی و بەجێی هێشت.. نەوبەهار لە دڵیخۆیا ئەیگوت:

- خۆ ئەڵێ هەر دو سێ ڕۆژمان پێئەچێ، بەڵام دوو، سێ ڕۆژی چی؟ خۆ بەدەست ئەو نییە بەخوا بە دوو سێ هەفتە و بە دوو سێ مانگیش نابڕێتەوە.. باش بوو لەوەدا بەختم بوو کەوا نەگیرا، ئەڵێن ئەمڕۆ زۆر کەسیان گرتووە.. کێ بڕوای ئەکرد کە ئیمشەو من بەتەنیابم. دوێنێ شەو ئەم وەختە مشت و مڕمان بوو لەسەر درەنگ هاتنەوەی، دەوەرە توخوا ئەگەر ئەمزانی ئیمشەو وا بەجێم ئەهێڵێت و ئەڕوا دڵیم عاجز نەئەکرد! بەڵام خەتای خۆیشی بوو، چەند جار شەڕمان بووە لەسەر ئەم درەنگ هاتنەوەیەی، هەموو جارێ بەڵێنیشی ئەدامێ کە شەوێکی کە زوو نەگەڕێتەوە منیش نان و شتی بەدڵی خۆیم بۆ حازر ئەکرد و دائەنیشتم چاوەڕوانم ئەکرد کەچی نانەکە سارد ئەبوەوە و کۆن ئەبوو لەوێدا ئەکەوت، خۆشم لە داخانا بە برسێتی سەرم ئەنایەوە، ئەویش

هەر دیـــارنەبوو کە هاتیشـــەوە ئەکەوتە بیـــانوو هێنـــانەوە بـــۆ دواکەوتنەکەی.. بیرم نایە ڕۆژێ بەدڵی خۆمان بێ قرە دانیشتبین، یا لە دەرەوە بـووە یـان برادەرەکـانی بەڕێـی مـاڵی ئـێمەوە بـوون، سـەری ئەوەندە قاڵبوو هەندێک جار کە میوانەکان ئەڕۆیشتن ئەویش لەگەڵیان ئەچـووە دەرێ بەبـێ ئەوەی کە پێشـم بڵـێ واڕۆشـتم، وای کە تـوڕە ئەبـووم و خەفەتـم ئەخـوارد بەم کـردەوانەی ئەیانخسـتە دڵـمەوە هەر خوێی چشتیش نەبوو لەچاو دەرد و داخی ڕۆینی ئەو شەویدا.
ئامەخانیش هەر بەجارێک لە پەل و پۆ کەوتبوو، چەند جارێک لەگەڵ مێـردەکەی دەمەقاڵێیـان بـوو، چـونکە ئەو پێیـدەگوت پـاڵکەوە بەشـکو نەختێ بنوی، بیاندەرە دەست خوا خۆ تۆ وابڕۆی بەشی دوو ڕۆژی کە نـاکەی؟ هەر بە نیـوە ڕۆژێ ڕەنگـی مـردوت لێنیشـتووە ماڵـت بە قوڕگیرێ کاکە حاجی وای بە ژنەکەی ئەگووت کەچی خۆیشـی ئـارامی لەبەر بڕابـوو خەو نەچوبـووە چـاوی ئەترسـا لەوەی کە بەر لەوەی خۆیان دەربازکەن لەڕێگا تووشی بەلایەک ببن..
ئـامە خـان هەر خـۆی ڕائەوەشـاند بەبێـدەنگ و پرمێسـکیش وەک و پلوسک لەچاوی ئەهاتە خوارێ، خەمی گەورەی هی کوڕە بچوکەکەی بـوو چـونکە منـاڵ و دەسـتە پـارچە بـوو هەمیشـە ئـاڵووی ئەکەوت و زۆری وەختیش نەخۆش بوو، شەوان ئەبوو چەند جارێک سەری بدات و داپۆشێتەوە ئەوەنـدە نوێنەکـانی لەسـەرخۆی لا ئەدا، زۆرجـار ئەگەر دایکی پێینەگوتایە (ئرێ ڕۆڵە بەختیار برسیت نییە) بیری نەئەکەوتەوە کە نان بخوا ئەوەندە سەقاڵی کوردایەتی بوو بەو مناڵییەوە کە هێشـتا لە سـنفی چـواری سـانەوی بـوو لێپرسـراوی هەمـوو هاوڕێکـانی بـوو ئەوەندە چالاک و ئازا بوو بۆ کاروبـاری پارتـایەتی، کەچـی بۆ ئیش و کاری تـایبەتی خۆیشـی وەهـا دەسـە پـارچەو سـاویلکە بـوو، هەرچەنـدە ئـامە خـوان دڵخۆشـی خـۆی بەوە ئەدایەوە کە حسـەین بەڵێنـی دابـوویە کە زۆر ئاگای لێی بێ و ئەشـیزانی کە حسـەینیش چەنـدی خۆشـئەوێت و چەند کوڕێک ڕێک و پێک و دو چار کە بۆ ئەو جۆرە ئیشـانە لەگەڵ ئەوشـدا کە زۆر حەب و (ڤیکس) و پەڕۆی نەرم و شـتیوای ئـاخنیبووە

جانتـاکەیەوە، بەڵام هەر دڵـی ئـاوی نەئەخـواردەوە و قـوڵپی گریـانی نەئەوەستایەوە بەتایبەتی کە بیری ئەکەوتەوە دواجارەکەی کە نەخۆش کەوتبوو چۆن تـایەکی گەرمـی لێهـاتبوو چۆن بەدەم تـاوە ئەیبزرکـان ئـامە خـان هەسـتی ئەکـرد وەک یەکـێ بەهەردوو دەسـت تونـد دڵـی بگوشێ وای لێئەهات.

هەرچـی وەکو حەپسـەخانیش بـوو هەر بە جـارێ ئـارامیلەبەر براببوو: جـارێ پـاڵئەکەوت بێـدەنگ، جـارێ ڕائەپەڕی و هەڵئەسـتا ئەیگـوت: یارەسـولەلله هـاوار، بەخـوا وابـزانم تەقەی تفەنـگ هـات...! حـاجی مێردیشـی پـێ ئەگـوت، (کچـی ئـافرەت تەقەی چـی ئەوە تەنەکە نەوتە بەتـاڵبووە کە ئێـوارە تـۆفە لای پەیـژەکەوە داینـا تـاکو بیبـا پڕیکـا، ڕەشەباکە خستویەتی ئیتر بۆچی تۆ دەنگی تەنەکەت لێبووە بەتەقەی تفەنـگ! حەپسـەخان هەروەک گوێشـی لە قسـەی مێـردەکەی نەبـوبێ خۆی مات نەکرد و بە پەرۆشێکی زیاترەوە گوێی هەڵئەخست تـاوەکو شتێ ئاگری جگەر هەڵیگرت هەستایە سەرپێ و لەتاوانا ئەچوو بۆ لای نەوبەهـاری بـووکی و بەدەوریـا ئەهـات و بەقوربـان و بە سـەدەقەی ئەبـو، کە هەمـووی چەنـد ڕۆژێـک لەمەوپـێش قسـەی پـێ ئەوت و سەرزەنشتی گەڕۆکی و کۆڵان کوتی و چونە دوکان و بازاڕی ئەکرد، بەڵام ئێستە لەتاو کوڕەکەی نەوبەهاری لابوبو بە فریشـتە و کولەکەی ڕۆحـی..! حـاجی مەجیـدیش ئەگەرچـی ئەیزانـی لەسـەدا سـەد کە ئەو دەنگە هی تەنەکە نەوتە بەتاڵەکەیە، کەچی ئەویش ئەکەوتە دودڵی و لە دڵی خۆیا ئەیگوت: خۆیە بیکەیت بە خـاتری خۆشەوسـتی خۆت ئاگـات لەو کـوڕە بێگوناهـانە بێ و بیـان پارێزەو بەسـەلامەتی دەربازیـانکە لە چنگی ئەو کافرانە. و ئەویش گوێی هەڵئەخست و لەدڵی خۆیـا ئەیگوت: وابـزانم حەپسـە ڕاسـتیکرد بەخـوا، لەتەقەی گـولەی دەسـترێژ ئەچـوو، هەڵسـاش بە بیـانوی دەسـت بە ئـاو گەیانـدنەوە چـووە حەوشـەکە تـا بزانێ دەنگەکە هی چیبوو....

## ١٣

بەیانی کە هەستان هەموو خەڵکی ماڵەکە بێخەوییان پێوە دیاربوو. جوتە حاجیش هەرزوو کەوتنە مشت و مڕی ئەوەی کە چۆن بچنە سەر ئیشەکانیان، نەوەکا دوکاندارەکانی دراوسێیان لێیان بکەونە گومان و مقۆ مقۆ، بڵێن ئەوە بۆچی نەهاتوون و قسەکە گەورەبێت! یەکێکیان ئەیگوت تەنیا تۆ بچۆ ئەگەر کەسێک هەواڵی منی پرسی بڵێ تۆزێک ناساغە، ئەویکەیان ئەگوت: لای من ئەوە باشترە کە هەردووکمان بچین...

ژنەکانیش هەریەکەیان قسەیەکی ئەکرد و جێگەیان بەخۆیان نەئەگرت. ئاخری هەردوو حاجی ڕۆیینە سەر ئیشی خۆیان و تۆفەشیان نارد کە ئاگای لە ماڵ و دوکانەکەی عەلی بێت.

شەو ڕۆژێک هیچ دەنگی کوڕەکان نەبو، بەڵام خۆیان حاڵیان زۆر باشتربوو، بێدەنگییەکەیانیان لەلا خۆشتر بوو لەوەی کە نەڕۆشتنایە و بگیرانایە، بەتایبەتی پاش ئەوەی کە زانیان لەو ماوەیەدا خەڵکێکی زۆر گیراوە و کەس نازانێ ڕەوانەی کوێ کراون، بۆیە حەپسەخان و خوشکی هەر بەوەدا ئەگەیشتن کە دەست بە سەروچاوی خۆیان بهێنن و بڵێن: یارەبی شکور کە ڕۆیشتن، ئۆە لەپەنای تۆدابن خوایە!..

حاجی مەجید هەر زوو گەڕایەوە ماڵێ ئەویش دڵی خۆشبوو کە کوڕەکان دەرباز بوون نەگیران، بۆیە کەوتبووە قسەی زل، زوو زوو ڕوی ئەکردە ئەوانیتر و ئەیگوت: کورە وازیان لێبێنن زۆر شتێکی چاکیان کرد، مەرگ لەگەڵ عەواڵان جەژنە. بڕۆنە ناو بازاڕ گوێ بگرن ئەوجا ئەزانن کە دوێنێ و ئیمڕۆ ئەو سەگ و گورگانە چیان بە خەڵکە کردوە؟..! سەری با ئەداو ئەیگوت: نەخێر ئەمە وانابێ، وابڕوا هەرکەسێ دەنکە جۆیەکی ماڵی پاشای خواردبێ ئەبێ بگیرێت و لەناو ببرێت، بەڕاستی یەکجار ناخۆشیان کردووە.. هەر پێویستە کوردیش دەست بکاتەوە.. ئەبێ ئەویش دەستێ بووەشێنێت!!.

حەپسە خانی ژنی لەوە زیاتر خۆی پێ نەگیرا، لچێکی لێهەڵقورتاند و گوتی:

- پیاوەکە ئەوە تۆ چیتە؟ هەر ئەڵێیت کورد ئەبێ دەست بکاتەوە و کورد ئەبێ دەست بووەشێنێ.! هەقە ئێمە هەمیشە دەست بە دوعا بین کە خوانەکا ئەوە بقەومێ، ئاخر کوردی داماو بەچی دەست بوەشێنێ و

چۆن دەست بکاتەوە؟؟ ئەتەوێ بەبەردو تێلا بچن بەگژ تۆپ و تەیارە و دەبابەدا!!.. نازانم بۆچی وابۆیان ئەقرێنی؟

- من بۆیان ناقرێنم و قەتیش حەز لە شەڕ ناکەم.. چ سەگبابێ حەز ناکا بەخۆشی و بێقرە لەناو منالّ و کەس و کاری خۆیا پالّی لێبداتەوە و بەئارەزووی خۆی بژی و بخواو ڕاببوێرێت؟؟ بەلاّم کە ژیانت پڕ بوو لەسە ڕۆی و زولّم و زۆرو لەمالّەکەی خۆشتا نەتتوانی سەربەستبیت بەخوا.. بەخوا مردن زۆر خۆشترە لەو ژیانەو لەو ژێردەستییە!! کچێ ئافرەت باوەڕبکە ئەو کەسەی بە ئیمان و بڕواوە بچێتە مەیدانی شەڕەوە بۆئەوەی کە لەسەر شەرەفی خۆی و میلەتەکەی بکاتەوە، بەرد و تێلاکەی زۆر بەهێزتر و کاریگەرتر ئەبێ لەو دەبابە و تۆپ و تەیارانەی کەدێنە سەریان و بەدەست کەسانێکەوەن کە لە ترسا، یان بۆ پارە و دەستکەوتی شەخسی شەر بۆ حکومەت ئەکەن!

- باشە باشە، بیکە لەڕێی خودا بەس باسی شەڕمان بۆبکە، ئێمە خۆمان وەختە دلّمان شەق بەرێ دەردمان کاریتر مەکە.. پاش نەختێ بێدەنگی ڕووی قسەی کردە خوشکی و گوتی: خۆزگە ئەمزانی بۆ ئەم پیاوە بەم چەند ڕۆژە لێمان بوو بە قارەمان، خۆ تا دوێنێ کوڕەکان لە ترسی ئەو بە دزییەوە کوردایەتییان ئەکرد؟ مێردەکەی بە تەوسێکەوە گوتی:

- ئەی پێشینان نەیانگوتووە: جام کە پڕ بوو لێی ئەڕژێ؟!

بۆ ڕۆژی سێیەم ئێوارەکەی کاغەزی عەلی گەیشت کەوا بەسەلامەتی گەیشتونەتە شوێنی خۆیان و دلّیان لایان نەبێت. خاو و خێزان ئەم خەبەرەیان زۆر پێ خۆشبوو، چونکە بەتەواوی دلّنیای کرد، سەبری هەرزوو هەستا و بەهەلّەداوان مژدەی برد بۆ خەسوو خەزوری، ئەوەشی پێڕاگەیاندن کە لەمەودوا ئەو لە مالّی خەزوری ئەبێت چونکە زۆر دلّیان تەنگە.

***

پارتی بڕیاری دەرکردبوو کەوا هەموو ئەندام و لایەنگرەکانی و ئەو کەسانەی ترسی گرتنیان لەسەرە بەرەو شاخ بڕۆن. بەم جۆرە بنکەو هێزی

چەکداری پارتی لەو خەڵکە پێکهێنرا و ناونرا پێشمەرگەی کوردستان و بەچەند تفەنگێکی کۆن و کەمەوە کە هی خەڵکەکە خۆیان بوو کەوتنە پەلاماردانی هێزی حکومەت لە قەزاو ناحییەکانی کوردستانا.

میری کە هەر وەختبو شێت ببێ، بەپەلە هێزێکی زۆری هەڵڕشتە ناو شارەکانی کوردستان، بەڵام لە هەر شوێنێکەوە پەلاماریان ئەدا، پێشمەرگە ئازا و دلێرەکانی کوردستان بەو تۆزە چەکە کەم و کۆنەی خۆیانەوە ئەو هەموو هێزە پڕچەک و خاوەن تۆپ و تانک و فڕۆکەیەی حکومەتیان ئەشکاند و پشتاو پشت ئەیانگێڕاندەوە دواوە بەسەر شۆڕی، پاس ئەوەی ژمارەیەک عەسکەر و ئوتومبێلی سوتاو و شکاو و چەک و ئازوقەیان بەجێئەهێشت.

لالەیەکی دیکەوە حکومەت ئەیویست خەڵکی شار و دێهاتەکان بسوتێنێ بۆ ئەوەی پشتی پێشمەرگەکان نەگرن و تێکەڵی بزوتنەوەکە نەبن بۆیە دەستی کردە لێدان و ئازاردان و گرتنی خەڵکەکە، وە هەر وەک و سەگی هار کەوتە ناو گەورە و منداڵ و قەدەغەکردنی خواردەمەنی و کەل و پەل و کوتاڵ لەشارەکانی کوردستانەوە بە بیانووی ئەوەوە کە ئەگاتە دەست پێشمەرگە، بەڵام حکومەت دوای کڵاوی بابردو کەوتبوو، چونکە ئەو خراپەی زیاتر ئەکرد و خەڵک زیاتر ڕقی لێی هەڵئەستاو خوێنگەرمتر و ئازاتر ئەبوون و پێشمەرگەیان لا خۆشەویستتر ئەبووبەجۆری کە لایان بووە مایەی سەربەرزی و دڵخۆشیان و لەخۆیانەوە پیتاک و ئازوقە و جل و بەرگیان بۆ کۆ ئەکردنەوە، بەشیو بەدزییەوە بەناو ڕەبیئەکانی عەسکەردا تێئەپەڕین و دەستە دەستە ئەچوون بۆ لایان و شتیان بۆ ئەبردن، عەسکەریش لەناو ڕەبیئەکانیاندا خۆیان مەڵاس ئەکرد بەهیچ جۆرێ لێی نەئەهاتنە دەرەوە، بەڵام هەر ئەوەندەی خشپەی پێیەک یاخود وورتەیەک ببوایە ئیتر لە هەموو لایەکەوە و بەگشت لایەکا ئەکەتنە دەستڕێژ کردن و گولە بەتاریکییەوەنان، کە جار و بار خەڵکی بەر گولەی وێڵیان ئەکەوتن، کە ئەمە وای لێکردن هەوڵبدەن ڕێی باشتر و بێمەترسیتر بدۆزنەوە بۆهاتوچۆکردنە شەوانەکەیان.

***

شەڕی پێشمەرگە و هێزی حکومەت هەتا ئەهات توندتر ئەبوو، بۆچوونی عەبدولکەریم و دەوروبەرەکەی کە لایان وابوویاخیبوونەکە بە چەند ڕۆژێک

پێشێل ئەکەن، هیچ دەرچوو، هێزی پێشمەرگە نەک هەر لەناو نەبرا و بەس زۆر جێی گرنگیشی لێداگیرکردن و هەفتە بوو بە مانگ و مانگ بوو بە ساڵ و ساڵیش تەپەری و بە پێچەوانەی بۆچوونی حکومەت و ڕەئی زۆربەی شارەزا بێگانەکان، بزوتنەوەکە هەتا ئەهات ڕوو لە سەرکەوتن و پەرەسەندن بوو. دوژمنانی ناوەوە و دەرەوەی ڕژێمەکە بەکەڵک وەرگرتن لە خەریکبوونی بەو شۆڕشە کوردەوە کەوا بەسیاسەتی کەرانە و خراپی خۆی هەڵگیرساندبوو، وەلە و بێدەسەڵاتییە پیشان دا لەچارەکردنی داو لەو بۆڵە بۆڵ و ناڕەزاییەی لەناو خەڵکدا پەیدا بوو توانیان کودەتایەکی لێبەن و سەرەونگومی بکەن و عەبدولکەریم قاسم و دەستەو دایەرەی بکوژن و لەناوبەرن و دەستەیەکی تێکەڵی نەتەوە پەرست بێنە جێی.
هەرچەندە کاربەدەستانی ڕژێمە تازەکە لە سەرەتاوە نەرمییان پیشاندا بەرامبەر بزوتنەوەکە، و ئامادەییان دەربڕی بەرامبەر گفتوگۆکردن و ڕێکەوتن لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش، بۆ ماوەیەکیش هەندێ لە بەغداوە چوون بۆ شاخ و لە شاخیشەوە چوون بۆ بەغدا بەنیازی گوایە ڕێکەوتن بەڵام دوای سێ چوار مانگێ هاتو چۆو وتوویژ دەرکەوت کە ئەمانە لە کەریم خراپتر و لەویش دڕەندەتر و داخ لەدڵترن بەرامبەر بە گەلی کورد و شۆڕشەکەی و ئەو مێچکە مێچکەیان تەنیا بۆ ئەوەبوو کە ماوەیان دەسکەوێ تا دوژمنەکانی ناوەوەی ڕژێمەکەیان پانەکەنەوە و جێیخۆیان خۆشئەکەن ئەوسا بگەرێنەوە سەر کورد!

***

ئالەم کاتی پشودان و قسەکردنەی نێوان حکومەت و شۆڕشدا شەوێک نزیکی بەرەبەیان حاجی مەجید لەسە دەنگێ خەبەری بوەوە وەیزانی بەنگە، ئەمدیوو ئەودیوێکی کرد و لە دڵی خۆیا گوتی: دەی با لە بانگەکە بێتەوە هێشتا زووە بۆ نوێژ بەڵام ئەو دەنگەی بە بانگی نەزانی هەر نەبڕیەوە.. شتێکی سەیرە، دەنگ لە هیچ یەکێ لە مزگەوتەکانی کەی نزیکیشیانەوە نایەت؟ کە بەیانیانتر دەنگزلکەرەکانیان نایەڵێ کەس بنوێ حاجی بە شپرزەیی هەستا و لەناو جێگەکەیا دانیشت، هەموو هەست و هۆشی خۆی کردەوە و سەیرێکی سەعاتەکەی کرد هێشتا سەعات (٣) نەبووە ئەی ئەمە بانگی چ محەلییە؟ تا ئەهاتیش دەنگیەکە زیتر لێی نزیک ئەبوەوە و حاجیش زۆرتر شپرزە ئەبوو

ئەی خوایە ئەمە چیبێت؟ با حەپسەخەبەر بکەمەوە.؟.. ئەء نەکەی بۆ خاتری خوا، هەر بە جارێک سەرت لێ ئەشێوێنێ. هەستایە سەرپێ و بە بیانووی چوونە سەر ئاوەوە ڕۆیشتە حەوشە. سەیرێکی ئاسمانی کرد و شایەتمانێکی هێناو تۆزێک ڕاوەستا، حوشەکە کش و مات و بێدەنگ بوو بە نەرمی و لەسەرخۆ خوڕەی ئاوی کاریز و حەوزەکە ئەهات، دنیا ساردی کردبوو ئاسمانیش سامالێکی پاک و دڵگیر بوو دەنگەکەش وردە وردە نزیکتر ئەبووەوە، دەنگی لۆرییەکی قورسیش لە دورەوە ئەهات، باشە ئەی ئەو زیکە زیکە ناخۆشە چییە؟.. لا حەولە وەلا قوەتە ئیلا بیلا، حاجی بەم خەیاڵ و قسە لە دڵی خۆداکردنەوە بێ ئارام و بە پەرۆشێکی زۆرەوە چووە هەیوانەکە، لەوێش تۆزێ وەستا خۆی پێنەگیرا هاتەوە حەوشە.. دەنگەکەی والێ نزیک بوەوە کە بەباشی بۆی دەرکەوت بانگ و شتی وا نییە، کابرایەکە کە بە کوردییەکی تێکشکاو جاڕ ئەدا هەی هاوار ئەوە چییە؟ جاڕوو بەم شەوە! لەپێشەوە لە قسەکانی نەگەیشت بەڵام کە جارێکیتر گوتییەوە ئەمر لە حامییەی سلێمانی بە مانع ئەلتەجول لە ئێستەوە بۆ ئیشعارەک ئاخر، حاجی بە پەلە پروزێ بەدەم موچڕک و لەرزەوە خۆیکرد بە ژوورەکەیا و کەوتە بانکردنی حەپسەخانی ژنی، ئەویش خۆی هەڵغێڕایەوە ئەودیوو توند لێفەکەی لەخۆیەوە ئالاندەوە و بەدەنگێکی نیوە نوستوو گوتی: بۆچی سەعات چەندە؟ نوێژی چی جارێ؟ حاجی بە دەستێکی لەرزۆک لێفەکەی لەسەر دەموچاوی لابرد و بە زەردەخەنەیەکی تفتەوە گوتی:

- کچێ کێ باسی نوێژی کردووە تۆ هەستە و گوێ بگرە بزانە ئەو کابرایە بەم شەوە جاڕی چی ئەدا!

حەپسەخان ڕاپەڕی و بەپەلە دەستێکی هێنا بەسەر و چاویا و گوتی: تۆ جارێ پێم بڵێ چی قەوماوە؟ و باسی چی ئەکا؟ هەی هاوار..! هەستایە سەرپێ.

مێردەکەی دەستێکی بۆ بەرزکردەوە و گوتی: وسبەو بەچاکی گوێبگرە.. دەنگی کابرا ئەوەندە نزیک بوبوەوە لەژووریشەوە بە باشی ئەبیسترا. ژنی تایەن کە گوێی لە جاڕەکە بوو لە مێردەکەی خراپتری بەسەرهات، هەر سەرپۆشەکەی لە ملی ئالاند و بەهەڵەداوان ڕایکرد

ئـامەی خوشـکی هەڵسـێنێ لە خەو کە ئەو شـەوە بەڕێکەوت لەلایـان نوستبوو بە بانگە بانگ نەک هەر ئامەی خوشکی هەموو کچەکانیشی لەخەو ڕاپەڕاند و تۆفەش کە لە ژێرخان نوستبووبە بۆڵە بۆڵەوە هـاتە دەرێ. ڕونـاک ڕەنگـی هەڵبزڕکـابوو چـۆقە چـۆقی دانـی ئەهـات! کـاکە حـاجی هەر زوو خـۆی گەیانـدە بـراکەی تـا بزانـێ چـی قەومـاوە، بەڵام ئامە خانی ژنی هەر بانگکردنەکەی خوشکی، قەڵەمی دەست و پێی شکا لەسـەر جـێگەکەی خـۆی دانیشـت و هەردوو ئەژنـۆی گـرتە بـاوەش، نەسرین لە هەمووان بەورەتربوو، گورج هەستاو گوتی: هەستن دەی ئێستە وەختی قسەکردن و گریان و شیوەن نییە خێرا ماڵە بگەڕێن بۆ کاغەز و شت.. حەپسەخان قیژانی: بەقوربانتـانبم، کەواتە جارێ فریـای ژوورەکەی حسەین بکەون بە پەشۆکاوییەوە کێشای بە خۆیا و گوتی: ئینجا چوزانم بەخوا ڕەنگە سەبریش سەبریش هێشتا کاغەز و ماغەزی وای لێرە مابێ هەی هاوار کوێ بگەڕێن و کوێ نەگەڕێن؟

ڕوناک هەڵیدایە گوتی: دایە تۆ خۆت بە خۆڕایی سـەغڵەت مەکە، بەخـوا من بزانم باجی سەبریم هیچی وای لەم ماڵەدا نەماوە کەجێی مەترسـی بێتچـونکە ئەو ڕۆژەی کە لە پیرمەسـوور هـاتمەوە پـۆلیس خەریکـن مـاڵان ئەپشـکنن ئەو، لەبەر چـاوی خـۆم هەمـوو کەغەز و زەرفەکـانی کۆکردەوە و بردنی نەزانم بۆ ماڵی چ هاوڕێیەکی!. دایکی هەناسـەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

- خوابکا وابێت کچـم.. بەخـوا تـازە تیـاچووین بەو پێغەمبەرە شـارەکە بە تەواوی وێـران ئەکەن و کەسـی تیـا نـایەڵن.. بەدەم ئەم قسـانەوە هەر ئەهـات و ئەچـوو بەلای نەسـرینەوە جـارێ پەلەی لێئەکـرد و جـارێ ڕوناکی بۆ ئەنـارد یـارمەتی بدا و ئەگەڕایەوە لای نەوبەهـاری بـووکی، بەدەوریا ئەهات و بەقوربـان و بەسـاقەی ئەبوو پێیئەگوت: نەترسـی و نابێت هیچ خۆت بشڵەژێنیت چـونکە خـراپە بۆ سکەکەت خەمـی هیچـت نەبێشکور کەڕەکەمان لێرە نین ئەڵێن قەت هـیچ هیچیش لە ژن نـاکەن، ئێمە هەقمان چیە؟ نەوبەهـار هەرچەنـدە بە ئاشـکرا گوێی لە قسـەکانی گرتبوو بەڵام ئەوەندە دڵی لای نەبوو لە خوای ئەویست دەقەقەیە زوتر

خۆی بگەیەنێتە حەمامەکە چونکە لەبەر بێزوکردن دڵی تێکئەچوو، ئەترسا لەوەی کە برشێتەوە، خۆی لە پێشا وابوو ئێستە ئەم حاڵەشی هاتەسەر.

- ئەمان لەم حاڵەدا بوون کە زریکە وقیژە لە ماڵەکانی کۆڵانی ئەودیویانەوە بەرزبوەوە، کە گوێیان هەڵخست دەنگی ئای هاور.. باوکە ڕۆ.. تخوا مەیبەن کوڕەکەم پانزە ساڵە، زۆر مناڵە و هەر لە هیچا نییە هەروەها گوێیان لە توڕەبوونی عەسکەر و جنێوی عەرەبی و شەق وەشاندن و کوپە و شووشە و پەنجەرە شکاندن بوو. نەخێر وا لە دەرگایەکی تر ئەدەن... بەلەقە دەرگایان شکاند و چوونە ژورەوە و هاوار هەستا.. ئەوە دەنگی مونیری وەستا ساڵحە وا بە عەرەبی قسەئەکت، ئەڵێ: کەسمان نییە جگە لە باوکم کە ئەویش ئەو پیرەمێردە نەخۆشەیە کەلەناو ئەو جێگەیەدا کەوتووە، دیسان دەنگی شەق وەشاندن و شت شکاندن هات.. وەی لە مونیر کە کچێکی ئازایە بۆ بەسەریانا ئەقیژێنێ و جنێویان پێئەدا و هەر باوکە گیان باوکە گیانیشیەتی!!. واگڕەی ئوتومبیل هات و غەڵبە غەڵبەکە دوور کەوتەوە.. بەڵام لە ماڵەکان تایەت دەنگی هاوار و گریان و دوعاو نزا و جنێو زیاتر ئەبێ.

حەپسەخان بە دڵێکی داخورپاوەوە بە ڕەنگێکی وەکو مردوەوە ڕووی کردە مێرد و شوبراکەی و گوتی: بەو خوایە ئێستە یەن ئێوەش ئەبەن، کە ئەوان ئەو پیرەمێردە نەخۆشەیان برد ئیتر هەرکەس نایەڵنەوە لە ماڵا..

مێردەکەی کە وادیاربوو لەو هات و هاوار و زریکەی ماڵە دراوسێکانیان زۆر ناڕەحەت بوبو گوتی: ئینجا ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە ئەو سەگبابە بێدینانە نەخۆش و مناڵیان لە نییە! و ئێمەش لەو خەڵکە زیتر نین، وەختە بڵێم عەیبە ئەوان بگرن و ئێمە نەگرن!!. هەستە برا با خۆمان کۆکەینەوە هەسات دەرمانەکانیکەی خستە ناو دەسەسرەکەیەوە و ئاخنییە گیرفانی بەربازخەڵی و لەگەڵ براکەی ئامادە دانیشتنەوە وەک چاوەڕوانیبن کە بێن بیانبەن.. کچەکان

بەبێدەنگ دەستیان کرد بە گریان زۆر ئەترسان لەوەی کەلێیان بدەن چونکە ئەیانزانی کە داروباری لێدرانیان نییە، بەتایبەتی حاجی مەجید هەر بەرگەی زللەیەکیش ناگرێت.. هەندێکیان لە دڵی خۆیانا ئەیانگوت: نا باوەڕ ناکرێت کە ئەوەندە بێناموس و بێویژدانبن کە لەم پیرەمێردانە بدەن، ڕەنگە هەر بەرامبەر بە کوڕە لاوەکان وا دڕندە و دەسوەشێنبن چونکە بە ئاگری بن کایان ئەزانن. لەپڕ وەستا ساڵحی باوکی منیرەی بیر ئەکەوتەوە خوڕ خوڕ ئاو بەچاویا ئەهاتە خوارەوە و ئەیگوت: ئەگەر ویژدان و نامووس و دینیان ببووایە چۆن ئەبوایە بە کوتەکی دەستی ئەم زۆردارانە.. ماشەڵلا ڕیش سپی و نەخۆشیان لەبەرچاوە..!
تۆفەش هەر خەریکی جگەرەکێشان بوو، لەو ماوەکەمەدا پاکەتەکەی نیوەیی کرد، هەر ئەهات بەمەلادا و ئەچو بەولادا و جنێوی ئەدا بە حکومەت، بەڵام حەپسەخان و نەسرین هەردوکیان پێکەوە هەڵیانکوتایە سەری و بێدەنگیان کرد نەسرین بە ئەسپایی پێیگوت: شێت مەبە ئێشتە وەختی جنێودان نییە جاریٚ وەرە باتا نەهاتوون چارەیەکی ئەو کۆمەڵە بەیانامەو کاغەزوو کتێبە یاساغە بکەین کە لە پەنا و قوژبنی ژورەکەی حسەین دەرم هێناوون.
حەپسەخان لەگەڵ ڕومەتی خۆ ڕنیندا بە ئەسپایی گوتی: ئاخ حسەین ئاخ چەندەم پێئەگوت ڕۆڵە ئەوەندە شت لە خۆت کۆمەکەرەوە.. هیچ! لەم گوێیەوە ئەچو لەو گوێیەوە ئەهاتەوە دەریٚ.. ئاخر ئێستە چیان لێبکەین، سا بەوخوایە هەمووومان ئەگرن.. مێردەکەی بە توڕەییەوە گوتی: بیبڕەوە. ئێستە وەختی ئەم بۆڵە بۆڵ و ڕاز و گلەییە نییە، ئەم قسەیەی کرد و ئاوڕێکی دایەوە بۆلای نەوبەهاری بوکی، کەدی لە شوێنی خۆی نییە زۆری پێخۆشبوو، ئینجا بە ئەسپایی بە ژنەکەی گوت: ئەوە چیە دایکی عەلی ئەڵێی هۆشت لای خۆت نەماوە! تۆ لە کەیەکەوە کچە بەستەزمانەکەت داگرتووە بە نەسیحەت مەوا نەترسێت هیچ لە ژن ناکەن کەچی ئێستەش قسەی وا ئەکەی؟ حەپسەخان لەگەڵ خۆشکی تۆفە و کچەکان وا سەری قاڵ بوو بە مەسەلەی لەناوبردنی کاغەزەکانەوە هەر ئاگاشی لە قسەی مێردەکەی نەبوو. خوشکی

ئەیگـوت: لە هەمـووی چـاتر ئەوەیە کە بیانسـوتێنین، ئەڵـێن حەمـام دائەخەن.. حەپسەخان بە شپرزەییەکەوە گوتی: ئەیەڕۆ. ئەی ناڵێن ئەم حەمام داخستنە لەم فەرتەنەیەدا چییە و ئەم چرە دوکەڵە هـی چییە!؟ خۆ بۆنی کاغەزی سوتاو زۆر دیارە، تۆفە جگەرەیەکی داگیرساند و خستییە بەینی لێوی و گوتی:

- چـی ئەڵێیت بیانسـوتێنین؟ بەخـوا تەگبیـری بـاش ئەکەی؟ خـۆ حسـەین دنیامان بەسەرا ئەڕوخێنێ. ئامەخان بە کزۆڵەیی گوتی: باشـە گەورەی گەڕەک میسوتێنە بـا هەمومـان ببین بە قوربـانی کـاغەز و کتێبە شـری حسەین! تۆفە هەستایە سەرپێ و گوت: تۆ هەر لە پاڵەوە ئەم قسانەبکە و لەبـای غیـرەت بخەیـتە بەر ئەم کـچە گەنـجە فەقیـرانە، زەنـدەقییان بەرە..!!.. حەپسـەخان بۆی ڕاپەڕی و گـوتی: کـوڕی بـاوکم بیکە لەڕێی خـوادا وەختـی ئەوە نییە قسـە زلەکانت هەڵگرە بۆ وەختێکیتر، ئێسـتە چـــارەیەکی ئەم بەڵایە بـــکە. تـــۆفە خـــۆی گـــورج کـــردەوە و بەپەلە جگەرەکەی کوژاندەوە و ڕووی کردە حەپسەخان و گوتی: تۆش وەکو خوشکت هەر بۆ ئەوە باشـی بکێشـی بە سنگتاو بڵێیت دڵـم ڕاوەسـتا. بەگورجی چووە لای نەسرین کە خەریکبوو کاغەزو شتەکانی ئەخستە ناو چەند کیسـەیەکەوە و پێیگوت: لاچۆ لاچۆ بیدەرە دەست مـن خـۆم ئەزانم چۆن چارەیان ئەکەم. نەسرین بەبێ ئەوەی گوێی بداتێ لەسـەر ئیشی خۆی ڕۆیشت و گوتی و پرسی:

- باشە بزانم چی ئەکەیت؟

- جا تۆ بیدەرە دەستم ئێستە ئەزانیت چی لێئەکەم، بەدەم قسەوە دەستی دایە کیسـەکەیان و گـوتی: ئێسـتە ئەمەیـال لەسـەر ئەو تـووە گەورەیە قایم ئەکەم. خەریک بوو بیباتە حەوشەو بچێتە سـەر دار تـووەکە بەڵام نەسرین ڕای وەستاند و پێگوت: باشە ئەی ئەگەر چوونە سەربان، یـان سەریان هەڵبڕی، خۆ مەگەر کوێربن کە نەیبینن. تۆفە گوتی: بەو خـوا ڕاسـت ئەکەی بەم پێـیە سـەر تەنـور، خەڵـوزانەکەی لە هەمـوو جێـیە چاترە.. نەسرین گوتی: ئاوس ئاوس بەخوا دیسان ئەوە دەنگە دەنگەکە

هاتەوە، تازە بە هیچ شتێک ڕا نەگەین و هیچ شتێکمان پێناکرێ، وا گەیشتنە سەرمان.. تۆفە گوتی:

- چار نییە هەر سەرتەنورەکە لێرە باشترە، پەلاماری تورەکەی کتێبەکانیدا و نەسرینیش کیسە کاغەزەکانی هەڵگرت و دووی کەوت، لەدڵی خۆیا ئەیگوت ڕاست ئەکا لەناو مەنجەڵ و قاپەکانا بینشارینەوە باشترە، بەپەلە چوو سەماوەرێکی زلی کۆنیان هەبوو مەگەر بۆ جەژن و زەماوەند بەکاریان بهێنایە، سەرەکەی هەڵبڕی و تا توانی کاغەزەکانی ئاخنییە ناوی و سەرەکەی نایەوە وەک و خۆی، شتەکانی کەشی خستە ناو مەنجەڵی ساوەر کولانەکەیانەوە و سەرقاپەکەی خستەوە سەری و بردییەوە ژووری زەخیرە و لەوێش پڕ تورەکەیەک نۆکیان هەبوو هەمووی کردە ناو قازانەکەوە باش کاغەزەکانی پێشاردەوە و سەرینایەوە و هەستا چووە لای پوری و دایکی. لەپاش ماوەیەک تۆفەش بەدەست و دەموچاوی خەڵوزاوییەوە هاتەلایان. بەلام حەپسەخان نەیهێشت دانیشێت ناردی بۆ حەمام گوتی: هەر ئێستە بێن و بەم حاڵە بتبینن ئەزانن کە لە خەڵوزان و شوێنی واشتت شاردۆتەوە! دەنگە دەنگەکە نزیکتر بوەوە و هەموو داماو و ورە بەردراو گوێیان هەڵخستبوو بۆ دەنگی دەرگا بەلام نەک هەر نە دەنگی دەرگا بوو نەکەسیش دەرکەوت بەرە بەرە دەنگی خەڵکەکە و گوڕە گوڕی ئوتومبێلەکانیشیان تا ئەهات کەمتر ئەبوەوە تا لە گوێ ڕا.. بە حەپەساوی تەماشای یەکتریان ئەکرد بێ ئەوەی یەکێکیان بوێرێ لەوی کەیان بپرسێ ئەوە بۆچی کەس نەهاتە سەریان؟ بەلام کە بێدەنگییەکە درێژەی کێشا ورتە ورتیان پێکەوت و ئەیانپرسی لەیەک کە تۆ بڵێیت ئیتر ئەوان نەیەنەوە سەریان!؟.

دنیا خەریکبوو ڕوناک ئەبوەوە، ڕۆژ بەرە بەرە لە کەل دەئەکەوت بەلام نەکەس لەدەرگای داو نەکەسیش هاتە سەریان. تۆزێ بوژانەوە. ئەگەرچی نوێژی بەیانی بەسەرچوبو بەلام ئەهلی نوێژی ماڵەکە هەستان و چوون بەلای نوێژەکانیانەوە، خۆ ئامەخان هەر لەسەر بەرماڵەکەی مایەوە، بۆ نان خواردنیش نەهات. هەر بەوەدا ئەگەیشت

دەست بەرزکاتەوە بۆ ئاسمان یەخەی داچەکێنێ و دوعا لە حکومەت و دەستە و دایەرەکەی بکات! و لەخوا بپاڕێتەوە کە کوێریان بکات، لە عاستی ئەو خەڵکە و لەناویان بات و ئەم کوردە بێکەسە سەرخات.

بو بە چێشتەنگاو کۆڵان و جادە و ڕێگا و بان هەموو کش و مات بوو، تەنانەت دەر و دراوسێش دەنگیان نەبوو، هەموو خزابونەوە ژوور و ژێرخانەکانیانەوە جار بە جار دەنگی لۆری یان جێبی عەسکەری ئەهات کەبەسەر جادەکانا تێئەپەڕین.

نەسرینی فەقیریش کەوتبووە مشوری نان و چێشت. حەپسەخان گوتی: ئۆف هەمووی لەلایەک و داخی ورگیش لە لایەک! دنیا کاولبێت خەڵک ئەبێت مشوری نان خواردن بخوات! ڕووی کردە نەسرین و گوتی: دایکت نەمرێ ڕۆڵە هەموومان بوین بە جل و کەوتینە ملی تۆ، بەخوا من هەر هەناوم تیا نەماوە ناتوانم دەست بۆ هیچ شتێک بەرم، چی بکەین ئینسان بەبێ نانیش ناژی، نەسرین گوتی:

- گوێ مەدەرێ پورێ گیان خۆت سەغڵەت مەکە وا ڕوناک گیانیش بەردەستیم ئەکا، چییە خۆ کۆڵ و بارم نەکێشاوە بۆتان!؟

بۆ نیوەڕۆ دەنگی بانگ لە هەندێ مزگەوت بەرز بوەوە، بەڵام لەچاو ڕۆژانا زۆر کەم بوو تاکو تەرا دەنگیان ئەهات، ئەویش زۆر بە کزی و مەلولی و بێ دەنگزلکەرەکان و دوا بانگ بە نیو سەعاتێ دیسانەوە گوێیان لەدەنگی تەقەبوو لەنزیکیانەوە ئەهات لەگەڵ دەنگی ئوتومبێل و غەڵبە غەڵب. دیسانەوە شڵەژانەوە بەڵام ئەمجارە ئەوەندە نەترسان، وەک شتێک هەندێ ڕاهاتن.

حەپسەخان ڕایکردە بەردەرگا و گوتی: بەخوا ئەچم لە درزی دەرگاکەوە سەیرئەکەم بزانم چییە، خۆ شەقمان برد. دەرگەکەیان دوو دەروازەیی کۆنی داربوو، درزی گەورەی وای تیابوو کە ئینسان ئەیتوانی بەباشی کۆڵانەکە ببینێت، کە چاوی نا بە درزەکەوە گورج بە دەست کەوتە ئیشارەتکردن بۆ جەماعەت کە بێن سەیرکەن، ئەوانیش بە هەڵەداوان چوون بۆ لای کە لە درزی دەرگەکەوە تەماشایان کرد هەر واقیان وڕما دییان هەروا عەسکەرن لە ئوتومبێلەکانیان دێنە

خـــوارێ و هەڵئەکـــوتنە ســـەر ئەو ســـێ چـــوار دوکـــانەی ئەوبەری شـــەقامەکەی بەردەمیـــان کەوا میـــوە و ســـەوزە و شـــەکر و چـــا و خواردەمەنی و شـتی وایـان ئەفرۆشـت، بەلەقە و شـەق دەرابەکانیـان ئەشکێنن و ئەوی ئەیانەوێ ئەیبەن و ئەیخەنە ئوتومبێلەکانیانەوە ئەوی ناشـیانەوە بەو نـاوەدا پەرش و بـڵاوی ئەکەنەوە و بە پۆسـتاڵەکانیان ئەیشێلن و لە کەڵکی ئەخەن و لێئەدەن ئەرۆن، ئەگەرچی شـوێنیکەیان لە درزی دەرگەکەوە لێـدیار نەبـوو تـا بـزانن بـۆ کـوێ ئەچـن بەڵام ئاشکرایە کە ئەچن دوکانی تر ئەشـکێنن و تـاڵانی ئەکەن..! ئەمـانیش بە خەمباری و شپرزەیی گەڕانەوە حەوشە و ژووری ماڵەکەیان.
پـاش دوو سـێ سـەعاتێ حەپسـەخان کە لە حەوشـەبوو بەهەڵەداوان هاتەوە هەیوانەکە و گوتی: دەنگی کـابراکەی شـەوێیە ڕاپەڕی و چووە حەوشەوە دەنگەکەش وردە وردە گەیشـتە نزیکیـانەوە و گوێیـان لێبوو کابرایەک سـواری ئوتومبێلێک بووە بە شـارا ئەگەڕا و جاڕ ئەدا ئەڵێ: ئەمر لە حامییەی سلێمانی بەلابردنی (مەنعل تەجەول) لەسەعات سێوە تاکو سەعات چوار هەرکەسێک بینرا لەسەر جادە و شـەقام و بەردەگا حـالا ڕەمـی ئەکرێ، خەڵـک کە گوێیـان لەم جـاڕە بـوو وروژان، دەر و دراوسـێ دەنـگە دەنگیـان تـێکەوت هەنـدێ بەنە چوونە دەرەوە کە زۆر بێـزار و بێتـاقەت بووبـوو ئەیانویسـت بـایەکی بـاڵی خۆیـان بـدەن، هەندێکیتر ئەیانویست بزانن دەنگ و باس چییە، هەنـدێکیش لەتـاو کوڕ و برا و مێرد و کەس و کاریان کە شـەوێ گیرابوون برابوون هەر خوا خوایـان بـوو دەرفەتێکیـان دەسـکەوێ و هەواڵێکیـان بـزانن بۆیە خەڵـک گـــوێی نەئەدایە ئەوە کەلابردنـــی (مەنعـــل تەجەولەکە هەر بـــۆ یەک سەعاتە)!
دەنگی حەلاوی دراوسـێیان هـات کە ئەیگووت: ئۆە خـوایە لێت بەزیـاد بـێ، نـازانم چـۆن چاویـان کوێربـوو نەهـاتنە کۆڵانەکەمـان، دایکیشـی کەوادیـاربوو لە هەیوانەکەیـانەوە قسـی ئەکـرد. ئەیگـوت: هەی قوڕیـان بەسەر بەخوا ئەوەندەم دوعا خوێند و هاوارم کردە شاهی نەقشبەند و غەوسـی گەیلانـی شـوکور موقرایەیـان داهـات و کـۆڵانەکەی ئێمەیـان

نەدی.. عوسمانی زاواشی دەنگی لێبەرزکردەوە گوتی: بەخوا هەر ئەوەیە کەوایان زانیوە کۆلانی مزگەوت و بەس، دوعا بۆ دو دەروازە زلەکەی مەلی حاجی مەجید بکەن.
ئەمانیش کەوتنە خۆیان، لەسەر ئاگر چاوەڕوانی سەعات سێیان ئەکرد، کە برۆن بزانن سەبری چۆنە و سەری خانووەکانی عەلی و ئامەخان بدەن و هەواڵێکی خزم و کەس و کار و دۆست و ناسیاوەکانیان بزانن. ئامە خان هەرزوو هاواری پێکەوتبوو ئەیگوت ئێستە ماڵەکانیان هەر کاول کردووە، خوا ئەزانێ ئەو کوڕانە، بێقەزابن چیان تیا بەجێهێشتووە، سەرەڕای دەردانیش ماڵی کەسی لێنییەو دەرگەی داخراوە، ئیتر هەر خوا خۆی ئەزانێ چییان کردووە!.
نەوبەهاریش ئەیگوت: خۆ ماڵی ئێمە هەر باسی مەکە بەخوا ئاگریان تێبەرنەدابێ باشە.. تۆفەش جامانەکەی بەست و دەستێکی بەشان و بەرۆکیا هێنا و چەند جارێ ملی خوارکردەوە بۆ سەعاتە گەورەکەی کە بە دیواری هەیوانەکەوە هەڵواسترابوو، دو سێ جارێکیش کۆکە گرتی و دیسانەوە جامانەکەی کردەوە و جارێکیتر دیسانەوە بەستییەوە، نەسرینیش کە لە هەموویان ورەی بەرزتر بوو ویستی نەختێ بە قسەی خۆش شپرزەییەکەیان خاوکاتەوە ڕوی کردە تۆفەو گوتی: هەی لە کاکە تۆفە هەر خەریکی خۆ ڕێکخستنە ئەڵێ ئەچێت بۆ خۆنواندن! ئەمە چوارجار جامانەکەی کردەوە و بەستیەوە، لای وایە هەر ئێستا چووە بەر دەرگا ڕەسمی ئەگرن!
تۆفە قسەکەی بەدڵ نەبوو ڕووی کردە گوێگرەکان و گوتی: ئەرێ ئەوە دەمڕاستی ماڵەکە چی ئەفەرموێ؟ حاجی مەجید وەک ئەوەی کە بیری کەوتبێتەوە کە ڕەنگە باش نەبێ تۆفە بچێتەوە دەرەوە کە نەوەکا بیگرن، لە دڵی خۆیا گوتی: شەوێ بەختی هەبوو کە نەهاتن، ئەگینا بەر لە هەمووان ئەویان ئەبرد. بەتایبەتی کە دەمی خۆشی پێناگیرێت لەبەر ئەوە گوتی: ئەرێ جەماعەت من بە باشی نازانم کە تۆفە بچێتە دەرەوە، ئێوە ئەڵێن چی؟ وەڵا کاکە منیش ئەڵێم با جارێ نەچێت، هیچ دوور نییە نەگیرێ!! تۆفە کە ئەوەندە تاقەتی چوو بوو هەر وەختەبوو

شـەق بەرێ بـۆ چـونەدەرەوە کە بزانـێ شـارەکە چـی بەسـەرهاتووە، وەک یەکێک ساڵێک لە کونی ژوورەوە حەپسکرابێ قیڕانی

- نەبەخوا، نەو هەرچییەک ببێ هەر ئەچم، ئەم قسانە چین؟؟!! کێ ئەڵێ دیسـانەوە نـابێتەوە بە تەقە؟ ئامەخـان بەدەم سـەر و سـەرپۆش ڕێکخسـتنەوە گـوتی: بەخـوا قسـەی ئەوانە، تـۆ مەیە، تـاقەتی بەزمـی تۆمان نییە! تا ئامەخان ئەم قسەیەی کرد تۆفە خۆی گەیاندە بەردەرگا و لەوێ لەگەڵ حەلاوی دراوسـێیان و مێـردەکەی قسـەیان ئەکـرد، کە ئەوانیش وەک و هەموو خەڵک چونکە سەعات سێ چوار دەقیقەیەکی مـابوو بـۆ (٣) لەبەردەرکـی ماڵەکانیـان بێئـارام چـاوەڕێی چـوونە دەرەوەیان ئەکرد.

***

کەسـەعات بـوو بە سـێ حەپسـەخان و خوشـکی کەوتـنە ڕێ هەر لە حەوشـەوە گوێیـان لە دەنـگە دەنگـی تۆفەبـوو، حەپسـەخان گـوتی: چـاوت لەم حەواڵە بە خـوایەیە چـۆن دەنگـی لێبەرزکـردۆتەوە ئەڵێـی خـوتبە ئەدا، هەر ئەڵێـی لەبیـری چۆتەوە کەوا چ ڕۆژێک لەشـارەکەدا قەومـاوە! خوشـکی جـوابینەدایەوە چـونکە خەریکی ئەیەتلکورسی خوێندن و فوکردن بوو گەیشـتنە سـەرجادە و ئیتـر هەر عەبابەسەر بوو لەم کۆڵان و لەو کۆڵان دەرئەپەڕی و هەمـوو لەسـەرجادەکەی کە ئەچـوو بـۆ بەردەرکـی سـەرا و فـولکەکەی ئەو نـاوە وەک لافـاوێکی ڕەشـی لێهـات لە ژنـی عابـا بەسـەر و وەک شـەپۆل چـین چـین بەرزئەبـوونەوە و هەڵئەگەڕانەوە بەلای مزگەوتـی گەورەدا بەرە و ژوور ئەڕۆشـتن بەرەو حـامیە. بەخێرای و بەپەلە و بەدەم ڕۆیشـتنەوە ئەگەر توشـی خـزم یـا ناسـیاوێ ببونـایە بەپەرۆشەوە بەچاوی فرمێسکاوییەوە هەواڵی یەکتریان ئەپرسی:

حەپسـەخان و خوشـکی کەوتـنە ئەم لافـاوەوە، بەڵام پـاش کەمێک جیـابونەوە، لایاندا بۆ ماڵی سەبری. تۆفە هەرزوو لە دەرگەیدا و سەبریش بەهەڵداوان هـات و کردییەوەو باوەشی کرد بەدایک و پوریـا بە گریـانەوە گوتی: توخـوا بـاوکم و مامم.. باوەشیکرد بە تۆفەدا و گوتی: وەی تۆفە گیـان ڕۆحمچوبو ئەمگوت هەر کورژاوی! زۆر لە مەراقتانا بووم هەر وەختەبوو شێتبم نەشم ئەزانی چیبکەم و چۆن هەواڵێکتان بزانم.

دایکی بە پەرۆشێکی زۆر و چاوی پڕفرمێسکەوە پرسی:

- ئەرێ ئێوەچۆن بوون؟ هاتنەسەرتان؟ئێمەش زۆر دڵمان لەلاتانبوو.. لێرەدا گەیشتنە بەرەو ژورو خەسوی سەبری هات بە پیریانەوە، دەستیان کردە ملی یەک و کەوتنە گریان، سەبری چاوی سڕی و بە هەنسکەوە گوتی: کافران هەرزوو مامیان پێش خۆیانداو بردیان، ڕەبی ئاگریان تێبەربێت.. دایکی کێشای بەخۆیا و گوتی: ئۆە ماڵیان کاولبێت. خەسوی سەبریش بە قوڕگی پڕ گریانەوە گوتی: خۆ وەستا حەسەنی ئەودیومانیان هەر کوشت، ئەوەندە دەمی سوتا گوتی: بەخوا ئێمە لەهیچانین، وابزانم بە نیوەمردووی فڕێیان دایە لۆرییەکەوە! سەبری گوتی: ئۆف من هیچ شێتی نەکردم کوڕە بچکۆلەکەیان نەبێ کە ئەگریاو ئەیگوت: وای باوکم خوێن لە دەمی دێت! خەسوی سەبری کە خەریکبوو هەندێ شتی ئەخستە زەمیلەیەکەوە، فەرشێکی بچوکی هێندەی بەرماڵێکیش لولدابوو و لای خۆیەوە دانابوو، ڕوی کردە حەپسەخان و خوشکی و گوتی: هەر گوێمان لە ماڵی وەستا حەسەن و هاوار هاواری دراوسێکانبوو هەر زیرەمان کرد، وتم ئێستەش دێن ئەم پیرەمێردە هەر ئەکوژن، کەچی کە هاتن گوتیان ئەوە کوڕەکانتان لە کوێن؟ وتمان منالمان نییە، ئەوانیش بە باوکی حەمەیان گوت کە هەستێ خۆی کۆکاتەوە و ئیتر هەروا، بێ ئەوەی هیچ شوێنێ بشکێنن چاوێکیان بە ژورەکانا گێڕا و باوکی حەمەیان پێش خۆیان داو لێیان دا ڕۆین، سەبری کە زانی عەسکەر نەچۆتە ماڵی باوکی نەختێ هاتەوە سەرخۆی بەڵام زۆر بەزەیشی بە خەزوریا ئەهات، بۆیە بەداخەوە گوتی: وەی ڕۆحم دەرچێ بۆت (مامە) گیان!

تۆفە هەڵیدایە گوتی: درێژەی پێمەدەن هەستن نیازی کوێتان هەیە با بچین بیرتان نەچێ کە ماوەکە هەر سەعاتێکە، سەری ڕاز مەکوتن، دەی زوکەن هەستن با بڕۆین، سەبری سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و گوتی: دەی ئامۆژن پەلە بکە.

تۆفە زەمیلەکەی بۆ هەڵگرتن و هەموو کەوتنە ڕێ، گوایە بچن ئەو شتانە بەرن بۆ خەزوری سەبری تۆفە سەرییبادا و لەبەر خۆیەوە گوتی: گیان فەرش و کەرە

و مەرەبای بۆ ئەبەن، قوڕبەسەرە خوا ئەزانێ ئێستە لە کوێیە و چی بەسەر هاتووە، لە پاشا بەم وەختە کەم و تەنگ و چەڵەمەیە، لەناو ئەم هەموو عەشامەدا چۆن ئەدۆزرێتەوە؟ بڵێم چی خۆ لەبەر حەپسەخان پیاو ناوێرێ دەم بکاتەوە، ئەگینا هەر زو پێم ئەگوتن کە دوی کڵاوی با بردو کەوتون، لەپاشا گوتی: دەی بەستەزمانە چیبکەن سەریان لێشێواوە، خوا سەر لەو زۆرداری بێشەرەفانە بشێوێنێ کەوامان لێئەکەن.
بەپەلە ڕۆیشتن و کەتنە ناو شەپۆلی عەبا بەسەرەوە کە تاکو تەرا پیاویشیان تیادیاربوو، هەموو بێوەستان پشودان، خواش ئەزانێ لە گەڕەکی چەند دورەوە هاتبوون، ڕایانئەکرد بەرە و حامییە، عەسکەریش بڵاوبوبونەوە بەناو شرەکەدا، هەرسەر کۆڵانێک دەبابە یان لۆرییەکی پڕ عەسکەری لێ ڕاوەستابوو، هەروەها لەسەر جادە گەورەکانیش بێجگە لە فڕکو هوڕی جێب و لادرۆڤەر، هەموشیان سەریانقاڵ بوو بە پەیوەندی لەگەڵ یەک کردم بەبێ تەلەکانیان قسەیان ئەکرد.
تۆفە سەیری کردن و شووێن حەپسەخان و ئەوان کەوتبوون، لە دڵی خۆیا بەتەوسەوە ئەیگوت: بەخوا باش سەری ماڵی کاکە عەلیمدا؟ هیچ نەبێ لە ڕێگاوە چاوێکمان بە ماڵی ئامەخاندا خشان کەلەوە ئەچوو کەس بەلایا نەچوبێ.. کێ ئەزانێ؟ خۆ ئەگەر چوشبن کە ملیان شکان دەرگاکە هەر دائەخەنەوە! ئیتر تۆفە لەمە زیتر خۆی پێنەگیرا و گوتی: تۆ سەری ئەم سەگبابانە ئەکەی خۆ ئەڵێیت بەرامبەر هێزی ڕووس ڕاوەستاون (ها ئێستە، ها دەقیقەیەتر بە تۆپ و تەیارە پەلاماریان ئەدەن)! دەک زەندەقتان چێت.. وەرە بەرامبەر ئەو خەڵکە بێچەک و ئەو چەن مناڵ و پیرەمێردانە وابکەن؟ تف لەعنەت لە باوکی چاکتان، ئەگەرچی حاجی مەجی وتەنی بەر کەسیان ناکەوێ. حەپسەخان سیخورمەیەکی لێدا و گوتی: ئەیەڕۆ لەڕێی خودا دەمت داخە، ماڵ کاول ئێسە وەختی ئەم قسانەیە؟؟ ئامەخان لەژێر عەباکەیەوە کێشای بەخۆیا و گوتی: نەمگوت با ئەم هەڵەوەڕە نەیەت لەگەڵمان، بەوخوایە بەڕەمیکردنمان ئەدا! سەبریش لەلایەکی ترەوە بۆیچوو، تۆفە چاری نەما بێدەنگ بوو.
گەیشتنە کۆمەڵە خەڵکێکی گەورە کەوا دەوری جێبێکی عەسکەرییان دابوو، عەسکەرێکیش قسەی لەگەڵ دو سێ ژن ئەکرد. ئەمانیش ویستیان بزانن چیە خۆیان کرد بەناو کۆمەڵەکەدا و تۆفە لەپێشیانەوە، کە ڕوانییان ژنێک بە نیوە

بـوراوەیی بەسـەرشـانی دوژنـی کەوەیەو ژنێکیش بە عەرەبـی لەگەڵ یەکێک لە عەسکەرەکانا قسـەئەکا پێی ئەڵێ: خێرت ئەگا هەر تەنیا پێمـان بڵێ گیراوەکـان بـراون بـۆ کوێ و هیچـی ترمـان ناوێت وا ئەم ژنە خەریکە ئەمرێت لەعەزرەت کوڕەکەی چونکە زۆر منالّەو ئەم خۆشـی نەخۆشـە، خێرت ئەگا تـۆش دایک و خوشکت  هەیە و ئێستە ئەوانیش دڵیان لای تۆیە و پەرێشانن بۆت! عەسکەرەکە تـۆزێ مـات بـوو بەڵام دیـاربوو کە لەبەر ئەوانـی لەگەڵـی کە لە جێبەکەدا بـوون نەیئەوێـرا بەنەرمـیش جـوابی ژنەکە بـاتەوە، ئەگەرچـی دیـاربوو کە پـلەی لەوان بەرزترە بوو، بۆیە هەر ئەوەندەی پێکرا کە بە توندی بڵێ: هەموویـان بـراون بـۆ حامییە ئیتر ئێمە ئاگامان لەهیچ نییە، بڕۆن بۆ ئەوێ.
نەختـێ دەنگـی هێواشـکردەوە، ڕەنـگە فریـاش نەکەون. ئەمـانیش گەڕانەوە نـاو خەڵـکەکەی کەوا ملیـان نـابوو بەرەو حـامییە ئەکشـان، ئەوەنـدەی نەخایانـد سـەیرییانکرد وا شـەپۆلێژن گەڕایەوە بەرەو دواوە و بـووبە غەڵـبە غەڵـب و پێکهاتنێـک نەبێـتەوە، ئەمـان لەوانیـان ئەپرسـی کە بـۆچی ئەگەڕێـنەوە و ئەوان لەمانیـان ئەپرسـی بۆ کوێ ئەچـن ئـاخری ژنێکـی سـەلار چـووە سـەر شـوێنێکی نەختـێ بڵنـد و دەسـتی بەرز کـردەوە بـۆ خەڵـکەکە کە بێـدەنگ بـن و گـوتی: خوشـکەکانم ئەگەر بەقسـەم ئەکەن هەمـوو ئەگەڕێـنەوە مـاڵی خۆتـان، چـونکە ماوەیەکی زۆرکەممان ماوە بەشی هیچ ناکات و ئەوانیش لەمسـەر پێمـان ئەڵێن لە حامیەن و لەسەر پێمان ئەڵێن وان لە سجن ئەگەر وابڕوا کاتەکە بەسەرئەچێ و لەگەڕانەوە ئەماندەنە بەر دەسڕێژ لەوانەیە نیوەمـان بکوژرێین، دور نییە ئەم بەنگ و باوە فێڵبێت بۆ ئەوەی لە دەرەوە بمـانهێڵنەوە، بۆیە لە هەمـووی باشـتر ئەوەیە کە هەرکەس بگەڕێـتەوە مـاڵی خـۆی و خۆشەویسـتە گیراوەکانمـان بسپێرن بە خوا، لەپاشا وا نیوەشیان لەناوبردن، نەخێر خوا نەکردە هەمووشـیان کوشتن، پیرەمێرد وتەنی: کورد نـابڕێتەوە خەیـاڵی خـاوە.. زوکەن دەی وەختـەکە بەبەرییەوە نەماوە.. کێ پێی ئەکرێ بەکۆڵانـا تێپەرێت، کۆڵانەکـان چـۆڵن، ژنەکە ئەمەی گوت و هاتە خوارەوە و خۆیکرد بەنـاو شـەپۆلی عەبـا بەسـەرەکانا و ون بوو. هەموو خەڵکەکەش سـەرەوخوار ببونەوەو بڵاوەیـان لێکـردو بەپەلە خۆیـان لەچاو ونکرد.

ئەو شەو ڕۆژە خەڵکی شار غەمبار و پەرێشان و داماو بوون، چەندان ژن بەبێ مامان منالیان بوبو، چەند نەخۆشی خەتەر بێ دکتۆر و دەرمان مابوونەوە، سەدان ماڵ نانیان لێبڕابوو، زۆر لەو مالانەی ڕۆژانە شت ئەکڕن، ئەگەر دەر و دراوسێ نەبونایە بە برسێتی ئەمانەوە..

چەند ڕۆژێک وەزع هەروا بە ئالۆزی مایەوە مەنعل تەجەول لە سەعات چوارەوە دەستی پێئەکرد تا سبەینێ سەعات (٣) لەپاشا وردە وردە کەمکرایەوە و بو بە لە شەشی ئێوارەوە تا شەشی بەیانی، دوای ماوەیەک گیراوەکانیشیان بەرەڵلاکرد، بەلام هەر یەکەمشەو زۆر کوردی چاک و پاک و دڵسۆز و بێتاوانیان شەهید و زیندەبەچاڵ کردبو. جا وەنەبێ هەر سلێمانی بەم مەرەیە برابێ، تێکڕا لە هەموو شارەکانی کوردستانا کردەوەی وا دڕندانەیان کردبوو بەتایبەتی لە کۆیە چەند ماڵیشیان سوتاندبوو و هەندێ کەسی بێتاوانیشیان بەداری ئەلەکتریکەوە هەڵواسیبوو.

ئەم سیاسەتە دڕندانەیەی حکومەت لەباتی ئەوەی وەک و ئەو چاوەڕێی ئەکرد هەرەس بهێنێتبە ورەی خەڵکەکە، کەچی بووبە ڕاپەڕێنەر و کۆکەرەوەیان، هەموو یەک دڵ یەک دەست وەکو برا لەپشت یەک بوون و بەبێ دریغی یارمەتی پێشمەرگەیان ئەداکەوا لەرزیان خستبووە دڵی حکومەت و لەشکرەکەیەوە، شەو نەبوو لەلایەکەوە جەزرەبەی پێنەگەیەنن، ئیتر حکومەت نەیئەوێرا بەسەربەستی هاتوچۆ بە عەسکەرەکانی بکات، ئەبوو بە کاروان و بە دەیان تانک و تۆپ و لۆری پڕ هێزی چەکدارەوە هاتوچۆی بەینی بەغداو دەربەندیخان و سلێمانی دەربەندی بازیان و کەرکوک بکەن و عەسکەر بگوێزنەوە، یاخود ئازوقە و کەل و پەل و تفاقی پێویستیان بۆ بەرن.

پێشمەرگەی قارەمان کەوتنە پەلاماردانی هەندێ قەزا و ناحیەو مەخفەری حکومەت و زۆربەیان داگیرکرد و عەسکەر و پۆلیسەکانیان بەدیل گرتن، بەلام بە پێچەوانەی ئەوان کرد ڕەوشتیان زۆر پیاوانەبوو لەگەڵ دیلەکان و قسەیان بۆ ئەکردن و تێیان ئەگەیاندن کەوا کورد پیاوکوژ و ڕێگر نین، زۆر ئاشتیخواز و مرۆڤدۆستن و زۆر حەز بە برایەتی عەرەب ئەکەن بەلام حکومەتەکانیان دان بەوەدا نانێن کە کوردیش میلەتێکەو ئەویش وەک و میلەتانیتر هەقی خۆی ئەوێت بەلام حکومەتەکان ئەوەندە خراپن نەک هەر مافی خۆی نادەنێ ئەیانەوێ

بیـــانتوێننەوە و لەناویشـــیان بـــبەن ئەوانـــیش ئەمە قبـــوڵ نـــاکەن و بـــۆ دەستخستنەوەی سەربەستی وئازادی خۆیان و پاراستنی خاک و مافی خۆیان خەبـات ئەکەن. بەم قسـە ئـاقڵانە و ڕاسـتانەو بە کـردەوەی جوانیـان زۆربەی عەسکەر و پۆلیسە دیلەکانیان والێکرد کە لە کانگای دڵەوە ڕقیان لە حکومەت هەستێت و جنێو بە سەرکردەکانی بدەن. زۆر پەشیمانیان دەرئەبڕی و هەندێ لە کوردەکانیان هەر ڕاست ئەبوون بە پێشمەرگە و لەژێر شیعاری کوردستان یان نەماندا ئازایانە خەباتیان ئەکرد، ئەوانیکەیان کە بە ناوی دیلەوە مابونەوە هەرچەند پێشمەرگە زۆر دۆستانە لەگەڵیان ئەجولانەوە و خۆراکیان وەک هی پێشمەرگەکان خۆیان بوو. بەڵام چونکە بە سەختی شاخ و داخ ڕانەهاتبوون بیـری مـاڵ و منـاڵ و کەس و کاریـان ئەکـرد تێکـڕا نـاڕەحەتبوون بەڵام ئەم ناڕەحەتییە بوو بوو بەهۆی زیاتر ڕق ئەستوری بوونیان بەرامبەر بە حکومەت کەوا بەناهەق شەڕ بە حکومەت ئەفرۆشێت و ئەمانیشی توشی ئەمداوە کرد، و کە بیریـان لەوە ئەکـردەوە کە زابتەکانیـان چۆن دیلـی پێشـمەرگەیان ئەدایە بەر گولله جوامێری پێشمەرگەیان زیاتر بۆدەرەکەوت و شوکری خوایان ئەکرد کە لە مەترسی شەڕ ڕزگاری کردنو خستنییە بەر دەستی ئەم خڵکە چاکە.

***

پەرەسەندنی شەڕ و دڕندەیی هێزی حکومەت و کاربەدەستانی و کەوتنە گرتن و ئازاردان و سزادان تەنانەت کوشتنی کەس و کاری ئەوانەش کە پێشمەرگە بوون وای لەو خەڵکە کرد کە لە خۆیان ئەترسان بەپەلە ماڵ کۆکەنەوە و بیدەنە خزم و دۆستو ناسیاویان کە بۆیان هەڵگرن و خۆشیان بە خاو و خێزانیانەوە بچن بۆ شاخ بۆ لای کوڕ یا مێرد و کەسیان کە لەوێبوون.

ماڵی حەپسەخان و خوشکێکی کە لەوکەسانەبوون، بەتایبەتی ڕەوشتی دڕندانەی حکەمەتیش لەوەدا نەمابوو کە دەگوترا هیچ لە ژن ناکەن. ئەوانیش ترسێکی زۆریان لێنیشت، بەڵام هەرچی وەک و حەپسەخان بوو بۆی نەئەکرا وەک خۆی ئەیویست پەلە لە ڕۆیشتنەکەیان بکات چونکە نەوبەهاری بوکی سکی هەبوو، جا لەبەر ئەوەی ماڵی باوکی لە بەغدا بوون وایان بەباش زانی کە لە پێشا ئەو بنێرنە ماڵی باوکی تا منالەکەشی لەوێ ببێ بە دەردیسەری، کەلەوە بوونەوە ئەوسا خەمی ڕۆینی خۆیان بخۆن.

حەپسەخان بوکەی ئامادەکرد و هەرچی پێویستبوو بۆی کرد و لەگەڵ ماڵێکی دۆستو ئوتومبێلێکی ناسیاو، بەچاوی پڕ فرمێسکەوە بەڕێیان کرد بۆ بەغدا.

نەوبەهار تا لەشار دەرچو کوڵی گریان نەنیشتەوە، لەپاشا بەرە بەرە بیری کردنەوە لەو مەترسیانەی کە دوورنییە بێنەڕێی گریانی لەبیر بردەوە و ترسێکی زۆری لێنیشت، بەڵام هەرچەند سەیری ماڵە ناسیاوەکەی لایەوە ئەکرد کەچۆن بێباک کەوتونەتە قسە و باسکردن وەک ئەوەی بچن بۆ سەیران تەریقی دایگرت، جگە لەمە کاک سمکۆی ئوتومبێلچیش کەیەکێ بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی عەلی مێردی و ئەم لە تەنیشتییەوە سواربوبو ئەو بە ئاسپایی دڵی دایەوە و قسەی خۆشی خۆی و عەلی بۆ گێڕایەوە و هەموو شتێکی بیرچوەوە و ئەویش کرایەوە لەگەڵی و خۆی تێکەڵی قسەوباسی لە هاوڕێکانیشی بە ئەندازەیەک کە هەر گەیشتنە نوختەی سەیتەرەکان، قسەی پێئەبڕین. لەو نوختانەشا نەوبەهار پرسیارکردنی عەسکەرەکانی کردبوو بە گاڵتە چونکە هەرجارەی ناوێکی تازەی ئەنا لە خۆی و ماڵ و مێردیکەی بۆ خۆی پێکەوە ئەنا، وەکو ئەوەی کە جارێک ئەیوت کە ناوی زەکیەیە ماڵی موهندس فلانە، لە نوختەیەکی تر ئەیگوت کە ناوی عائیشەیە و ماڵی مامۆستا سانەوی فیسارە،

وەلەبەر ئەوەی کە نەوبەهار لە بەغدا گەورەبوبو، ئەوەندە عەرەبییەکەی باش بوو لەزۆری سەیتەرەکان لایانوابوو کە عەرەبە، بۆیە هەندێ جار عەسکەرەکان لێیان ئەپرسی: خوشکێ ئەوە تۆ چی هێناوییە ئێرە خەڵک مەگەر خوا شێتی کردبێ بێتە ناو ئەم ئاگرەوە.
نەوبەهاریش خۆی گێل ئەکرد و بەکەساسییەوە ئەیگوت وەڵا برام بلێمچی بەخێرێ ماڵە ئاشنایە دەعوەتییان کردووم، کێ ئەیزانی واتێک ئەچێت، لە هەندێکی کەیانی ئەپرسی، ئەرێ تخوا برام پێم ناڵێیت ئەم خەڵکە بۆچی وا ئەکەن و ئەم شەڕ و شۆڕە چییە؟ هەندێ عەسکەر لە وەراما ئەیانگوت:چۆن نازانین ئەمانە کوردن شەڕ لەگەڵ حکومەت ئەکەن ئەوانن دنیایان شێواندووە. نەوبەهاریش ئەوەندەیتر خۆی هیچنەزان پیشان ئەداو ئەیگوت: ئینجا چۆن ئەوان دەرەقەتی حکومەت دێن؟ عەسکەرەکەش سەری ڕائەوەشاند و ئەیگوت: ئەم کوردانە ئەڵێیت؟

- چەند جنێوێکی ئەدا: خوشکم تۆ چوزانی، بەخوا هەر ئەڵێی جنۆکەن چونکە هەر تەق و هەڕیانە و کەسیش نایانبینێت، ئەوەتە شەو و ڕۆژ زۆرمان خۆمان خزاندۆتە ئەم چاڵانەوە، هەر شێتبووین بەدەستیانەوە، بڕۆرەوە خوشکم جارێکیتر نەیەیتەوە بەم ناوەدا.

کەلە نوختەکان تێئەپەڕین نەوبەهار قسەکانی خۆی و عەسکەرەکانی بۆ هاوڕێکانی ئەکرد بە کوردی، ئەوەندە پێئەکەنین جاری وابو تا نوختەیەکی تر کوڵی پێکەنینیان نەئەوەستایەوە جار جار نەوبەهار بە سمکۆی ئوتومبێلچی ئەگوت کە بیری نەچێت ئەم قسانە بۆ ماڵە خەزورانی بگێڕێتەوە با دڵیان خۆشبێت.

***

پاش بەڕێکردنی نەوبەهار ماڵی حەپسەخان و خوشکیشی خۆیان کۆکردەوە و وەک لەسەرئاگربن چاوەڕوانی کاغەزی عەلی و کوڕەکان بوون کە ڕاو شوێنیان پیشانبدەن و خەڵک بنێرن بەدویانا.. لەپاش چەند ڕۆژێک خەبەریان بۆ هات کەچی بکەن و کەی بکەونە ڕێ و چۆن بچن!.
هەموو خۆیان گورج کردبوو: جلی ئەستور و ڕەنگ تێریان کردبووە بەر و سەر و گوێلاکیان باش پێچابوەوە، پێش هەموویان کاکە تۆفە سنگی

دەرپەڕاندبوو پەلەی ڕۆینی بوو بەتایبەت کە دو سێ ڕۆژ لەوەو پێش قسەی بە ئەمنێکی حەرامزادە گوتبو ئەویش تێر و پڕی لێدابوو، خۆشی نە ئەیزانی کە بۆچی سەڕای تێهەڵدانەکە بە گرتنیشی نەدابوو! جگە لەمە تۆفە هەر ئەبوو بچێت لەگەڵیان چونکە بە حساب ئەو مەحرەم و پیاویان بوو.

لەسەر ئامۆژگاری ئەو کوڕە کە هاتبوو بە شوێنیانا لای چێشتەنگاو یەکی تورەکەیە، یان بوخچەیەکیان خستە ژێر هەنگڵ و بەبیانووی چوونە حەمام چوونە ماڵە تەعزێوە بوون بە دوو قۆڵ و هەر یەکەیان بەلایەکا خۆی گەیاندە سەرجادە و لەوێوە بەعەرەبانە چوون تا خانووەکانی عەقاری و لەوێ لە عەرەبانە دابەزین و بەپێ ڕۆین تا چوونە ئابلاخ و بۆ ئەو ماڵەی کە ناونیشانیان درابوویە و لەوێ یەکیان گرتەوە خەڵکی ماڵەکە کە هەر بەناو ئەیانناسین.. زۆر بە گەرمی و خۆشەویستییەوە بە پیریانەوە چوون و بەخێرهاتنیان کردن بۆ ئەوەی دەر و دراوسێکانیش هەر بە میوانێکی ناوەختیان بزانن، بەپەلە کەوتنەمریشک سەربڕین و چێشت لێنان قاپ و سینی خواستن لەملا و ئەولا، ئەگەرچی هەمووشیان خەڵکی باش و دڵسۆزبوون و هەندێکیان خۆشیان ئەم چەشنە میوانانەیان زۆرجار بەڕێ کردبوو، بەڵام هەمیشە خۆیان لە یوانی و میوانداری یەک بێدەنگ و گێل ئەکرد، نەوەکا قسەکەیان لەدەمی مناڵێک یان هەرزەکارێک دەرچێت.

نانیان خوارد و پشوییەکی باشیان داو تا سەعات بوو بە دەی شەو، دێیەکە کپ و بێدەنگ بوو، کۆڵانەکە چۆڵ بوو پێشمەرگەکە کە هاتبوو بیانبات، ناوە نهێنییەکەی حەسەن ئاغابوو هات و بانگی کردن کە ئامادەین بۆ ڕۆین.

دوای ئەوەی بە ئەسپایی لەگەڵ خەڵکی ماڵەکە خواحافیزییان لەیەک کرد و بێورتە و بێدەنگ کەوتنە دوی حەسەن ئاغا، دو سێ کۆڵانیان بڕی و بەسەر یەکدو جۆگەلەی ئاوو چڵکاوا بازیان دا.

حەپسەخان توند دەستی ڕونکای گرتبوو، وە هەناسە برکێی پێکەوتبوو لەدڵی خۆیا دوعای ئەکرد. ڕوناکیش نەقەی لەخۆی بڕیبوو، و ئامە خانیش پشتێنێکی ئەستوری بەستبووە پشتی و شوێن خوشکی کەوتبوو تۆفەش لە تەنیشتییەوە ئەڕۆیشت، زۆرجار لە شوێنی بەردەلان قۆڵی تۆفەی ئەگرت و لەژێر لێوەوە هەر ورتە ورتی بو نەئەزانرا کەوا دوعای ئەکا یا لە ترسا بۆڵە بۆڵیەتی، بەڵام

تۆفە هەر وەختەبوو لێکبێتەوە نەک لە ترسا بگرە چونکە پێیگوترابوو نابێ جگەرە داگیرسێنێ تا حەسەن ئاغا نەڵێت: سەبری و نەسرینیش لە دواوە بێدەنگ لەتەنیشت یەکەوە ئەڕۆیشتن.
لە دێیەکە ماوەیەک دوورکەوتنەوە گەیشتنە دۆڵێکی پان و بەرین مانگەشەوێکی زۆر خۆشبوو، لە کارێز و زەلکاوەکانەوە قرە قرە بۆق ئەهات لەدوور تارمایی ولاخ و زەلامێکیان بەدیکرد کە بۆی وەستابوون ئامە خان ترسێکی زۆری لێنیشتبوو وەختەبوو زەندەقی بچێت وایزانی عەسکەرن، کە نزیکیان بونەوە بەدەست ئەو بوایە دەم و لوتی ولاخەکانی ئەبەست چونکە زۆر مشەمش و فرە فریان ئەکرد، بە سپایش بە تۆفەی ئەگوت ئینجا چیبکەین تۆفە گیان!؟ بەخوا ئێستە عەسکەرەکان گوێیان لێئەبێت و ئەزانن کە خەڵکن ئەیانەوێ دەربازبن، ئەڵێن شتێکیان هەیە وەک و فیشەکە شێتە لە پێشا ئەوە ئەتەقێنن دنیایان بۆ ڕوناک ئەکاتەوە ئەوسا دەسڕێژ لە خەڵکەکە ئەکەن، وەک و ماڵە قوڕبەسەرەی دو شەو لەمەوپێش، ئەی خوایە گیان چیبکەم دە بڵێ بۆ هاتین؟ ئاخر چی لە ژن ئەکەن؟ تازە تەواو....
تۆفەش کە لەم قسانە تورە بوبو بە ئەسپای پێیئەگوت: ئەوە چ زوو لەبیرت چوەوە، خۆ تۆ شەوان خەوت لێ هەراسان کردبووین ئەوەندە ئەهاتیتە سەرمان و ڕاتئەپەڕاندین دەنگی دەرگە و پەنجەرەشت لێبوبو بە گرمەی تۆپ و بۆمبا و هەر ئەتگوت زوکەن لەڕێگەی خودا با بڕۆین! خەریکبوو قسەیتر بکا کوڕە پێشمەرگەکە بێدەنگی کرد. دوای ئەوەی کە شتەکانیان هەموو لە ولاخەکان بارکردبە دەنگێکی ئەسپایی گوتی: ئێستە ئێوە ناوی خوای لێبێنن و سواربن و بکەونە ڕێ تەنیا یەک تکام هەیە کە نابێ کەس قسە و پرسیار و ورتە ورت بکا، چونکە شەوەو دنیا کپە و دەنگ زۆر ئەڕوات!
حەپسەخان بە دەنگێکی نزم گوتی: یاخوا عەمرت درێژبێ باوکەکەم، بەلام پێم نالێیت ئەو هەموو عەسکەرە ئاگرتێبەربوانە لەم دەورو پشتەن چۆن ئەتوانین ئێمە دەربازبین؟ پێشمەرگەکە بە زەردەخەنەوە گوتی: خەمت نەبێ، ئێمە ڕێگای تایبەتی خۆمان هەیە هیچ مەترسن، خوا یاربێ بەسەلامەتی ئەگەینە شوێنی خۆمان، دەی زوکەن ناوی خوای لێبێنن و سواربن.
بەردێکی گەورەی لێبوو ولاخەکانیان ئەهێنایە بەردەمی و ژنەکان ئەچونە سەر بەردەکە و تۆفە و قەتارچییەکان یارمەتییان ئەدان تاکو سوار ئەبوون.

بەو جـۆرە کەوتـنە ڕێ بەڵام ئەوەنـدەی پێنەچـو کە حەپسـەخان بە دەنگێکـی لەرزۆکی نزم گوتی: ئای من بەقوربانتانبم وامن ئەکەومە خوارەوە، شتەکانی ژێرمان زۆر لوس و خزن. خۆمانی بەسەرەوە ناگرین! چونکە ئەوانە پێنج کەس بوون و وڵاخەکان چوار، ڕوناکیش لە پشت ئەوەوە سواربوبو.

باری وڵاخەکەی حەپسەخان و ڕوناک ڕاست کرایەوە و دیسانەوە کەوتنە ڕێ لە چـاڵاییەکە هـاتنە دەرێ و کەوتـنە دەشـتایی، قەتارچییەکـانیش جـڵەوی وڵاخەکانیان ڕائەکێشا... بەینێک وا ڕۆشتن تا پێشمەرگەکە ئیشارەتی کردکە ڕاوەستن، هاتە نزیکیانەوە لەسەرخۆ بە چرپە وتی: ئەبێ زۆر وریابین، ئیتر جادە قیرتاوەکەی سلێمانی و کەرکوک، ئەبێ ئێمە پیا تێپەڕین و بچینە ئەوبەر، ئەملاو ئەولاش هەمووی ڕەبیئەیە، هەر ورتەیەک یان خشپەیەک یان پژمین و کۆکەیەک ببەین ئیتر دەم و دەست ئەکوژرێین بۆیە تا ئەتوانن ئاگاداری خۆتانبن، هەموویان لەترسانا وەک و بەردییان لێهات بێ ئەوەی بوێرن بپرسن چۆن و بۆ یاشتێکی تر بۆیە بێدەنگ سەریان بۆ لەقاند و لەبەر خۆیانەوە بە مەلولی وتیان باشە.

ئامە خان چاوی قوچاند، هەر وەک ئەوەی ئیتر گیانی دەرچێت، لەترسی خۆی نە کچ و نە خوشکەزاکەشی بیرنەما، حەپسەخانیش هەر لە دڵی خۆیا هاواری خوای لەم بەڵای ناگەهانە بیان پارێزێت.

گەیشتنە سەر جادەکە دنیا ئەوەندە کش و مات بو هەر تەقەی ناڵی وڵاخ ئەهات، دیمەنەکە زۆر بەسام بوو بەتایبەت لای حەپسەخان و خوشکی و کچەکان کە یەکەمجاربوو شتیوا ببینن، قەتارچییەکان بە پەلەو توند جڵەوی وڵاخەکانیان ڕاکێشا، هەموو هێز و لێزانینی خۆیانیان بەکارهێنا تا بەزوترین کات جادەکەیان بڕی و پەڕینەوە ئەوبەری کەوتنە دەشتاییەکی تر و هەر بەو گورجی و خێراییە ڕۆیشتن تا گردێکیان لێ دەرکەوت و بەپەلە پروزێ خۆیان گەیاندە گردەکەو بە دەوریا سوڕانەوە تا کەوتنە ئەودیوی. پێشمەرگەکە هەناسەیەکیداو بە دەنگێکی نەختێ بەرز گوتی: دەی جەماعەت ئیتر سڵاوات لە دیاری پێغەمبەر بدەن، شکور بە سەلامەتی دەربازبووین ئیتر ئەتوانن بۆ خۆتان قسەبکەن، جگەرە بکێشن، حەز ئەکەن گۆرانیش بڵێن! هەموویان بوژانەوە و شایەتومانێکیان هێنا و هەندێکیشیان دەموچاوی خۆیانیان سڕی،

کەوا لە ترسا بەو شەوە ساردەش ئارەق بە سەرو چاو ملیانا ئەهاتە خوارەوە. تۆفە پێش هەموویان سنگی دەرپەڕاند و کەوتە قسەی زل و فیشاڵکردن و باسی سیاسەت و خاک پاراستن و نیشتیمان پەروەری، حەپسەخان کەوتە دوعاکردن بەڵام وەها شڵەژابوو، هەر قسەیەکی چەند جارێک ئەگوتەوە و پاش و پێشی ئەخستن و ڕوناک لە خۆشی ئەوەی کە لە مەترسی ئەو جادەیە ڕزگاربوون لە قسەکەوتبوو! سەری نابوو بە پشتی دایکییەوەو توند دەستی گیر کردبوو لەناوقەدی هەر وەک و ئامەخانیش بوو وەک و وڕێنەبکا کەوتبووە قسەهەڵڕشتن ئیتر هەقی نەبوو بەسەرەوە کێ گوێی لێیەتی و کێ گوێی لێنییە، خێرا خێرا و بێوچان ئەیگوت: ئۆە بەقوربانی پێشمەرگەبم، یاخوا قەزایان لە عەمرم کەوێ، سەیرکە چەن ئازان بێچاوێنی بن، یاخوا عەمری عەسکەر نەمێنێت خۆ ناوێرن لەو کونە سەگانە بێنە دەرێ لە ترسا. یاڕەبی ماڵت ئاوابێ.. خۆ خەریکبوو لەناو چەقی ئەو جادەیەدا بکەوم گوێم لە دەنگێ بوو وەمزانی ئوتومێلی عەسکەرە بۆمان هات.. ئۆ قوڕبەسەریان.. لە پڕ ترپ ها! لەو وڵاخەی کەوتە خوارەوە (وای باوکەڕۆ بەخوا وابزانم پشتم شکا.. ئای لەڕای خوا بمگەنێ مردم...).

تۆفە ڕایکرد و پێشمەرگەکە ڕاپەڕی قەتارچییەکە بە پەرۆشەوە چووبەلایەوە، خوشک و کچەکان هاواریان تێکەوت ئامەخانیان هەڵسانەوە، نە پشتی شکابوو نە هیچیشی لێهاتبوو، ئیشی بەوە باشبوو شوێنەکەی نەرمان بوو لەگەڵ ئەوەشا مردن و سوتان و ئیتر ئامەخانیان پێ سواری وڵاخ نەکرایەوە لێی ئەپاڕانەوە کچی دایکم زۆرمان ماوە و ڕێگەکە سەختە، بەردەڵانە و دڕک و داڵە، بەهیچ جۆرێ ناتوانی بە پێبڕۆیت، نەخۆش ئەکەوی بەسەرمانا! بەڵام کەڵکی نەبوو نەیوێرا و نەیوێرا سواربێتەوە ئیتر وازیان لێهێناو کردیان بە پێکەنین و قەتارچییەکان هەریەکەیان کەوتنە گێڕانەوەی ڕوداوی کەوتنێکی وەکو ئەمەی ئامەخان، تۆفەش خۆی پێنەگیرا و باسی بەسەرهاتێکی سەیرانێکی بۆکردن کە وەختی خۆی چووەو دو سێ ژن لە وڵاخ کەوتونەتە خوارێ و چۆن ئەگەر ئەم نەگەیشتایە بە پریایان ئەکەوتنە شیوێکەوە و هەلا هەلا ئەبوون!! ڕوناک چرپانی بەگوێی دایکیدا لێیپرسی وەکو ئەو بزانێ تۆفە کاری وای کردووە، حەپسەخانیش ملی لار کردەوە و بە سپە پێی گوت: حەرام بێ

ڕۆڵە ئەمە یەک شتی وای لێبیستم، ئەمە چل و ئەوەندە ساڵ لەگەڵیم ڕوداوی وای باسنەکردووە، لە کاتێکدا کە تەنانەت بەسەرهاتە هەڵبەتراوەکانیشی دەیان جار بە چەند جۆر بۆ گێڕاوینەتەوە ڕوناک دەمی نا بە پشتی دایکییەوە تێر پێکەنی.

لە ڕۆینا کە ئامە خان لەگەڵ تۆفە و پیاوەکانا بە پێ ئەڕۆیشتن چونکە نەیئەتوانی پێ بە پێی ئەوان بڕوا بەرە بەرە لەوان دوائەکەوت و لەپڕ هاواری لێهەڵئەستا: وای باوکەڕۆ هەناسەم لەبەر بڕا... بیکەن لە ڕای خودا، کچی دایکم بەجێم مەهێڵن ئێستە گورگێک شتێک پەلاماری ئەدا!. تۆفە بە پەلە فریای کەوت و هەندێکی تر لەگەڵ خەریک ئەبوو وەعز و نەسیحەتی دا ئەدا کەوا سواربێتەوە بەڵام بێهودەبوو نەیئەوێرا.

ڕوناک سەری خستبووە سەر پشتی دایکی خەریک بوو خەوی لێبکەوێ، هەندێ جار وەختەبوو بەلادا بێت، دایکی خەبەری ئەکردەوەو ئەیگوت: ئەیەڕۆ ڕوناک گیان ئەوە خەوت لێکەوتووە!؟ بەخوا ئێستە هەردووکمان بەر ئەبینەوە، بۆ خاتری خوا مەنوو، ئاگات لەخۆت بێت، حەپسەخان گەیشتە تینی بەبێزاری و شەرمێکەوە گوتی:

- ئەرێ حەسەن ئاغا باوکەکەم ئەوە نابێت لەشوێنێک دابەزین تۆزێ پشویەک بدەین! بەوخوایە من قاچم وا سڕبوە هەر ئەڵێی پەڕۆیە و ئەم کچەش خەویلێکەوتوە، ئەترسم بکەوێتە خوارەوە جێیەکی بشکێ.

حەسەن ئاغا گوتی: بەرێ وەڵا ئەوەندەمان نەماوە ئێستە ئەگەینە لای ئەو ئاشە و لەوێ بار ئەخەین ئێوەش بۆخۆتان پشوو بدەن و سەرخەوێکیش بشکێنن، نەسرین و سەبریش لە دڵی خۆیانا گوتیان، یارەبی کارت ڕاستبێ کەوا دڵت خۆشکردین، بەخوا ئێمەش ئەوەنە مانوبووین قاچمان یەشێت، بەڵام ڕومان نەهات قسەبکەین.

ئەوەندەی پێنەچو گەیشتنە ئاشەکە، بەڵام ئاشی چی بۆردومان وا کاولی کردبوو بەردی بەسەر بەردەوە نامابوو. بەڵام ئەمان گوێیان نەدایە ئەوە دابەزین و بارەکانیان خست. ئیتر هێندە ماندوبوون خێرا ژنەکان هەریەکەیان عەباکەی لەخۆیەوە پێچاو وەک مردو بەلادا هاتن نەیانئەزانی ژێریان بەردو دڕک و داڵ و مار و دوپشکە یان دۆشەکی پەڕی قوو!

## ١٦

هێشــتا دنیــا تاریــک و ڕوون بــوو، ئاســمانێکی پــاک و ســاماڵ ئەســتێرەکان جریوەیـان ئەهـات گەلاوێـژ دەمێـک بـوو کەوتبـوو، زۆر گەش و دڵگیـر دیـاربو، جاروبـار شــەماڵێک ســاردی شــەونماوی بەســەریانا تـئەپەڕی ئەتگـوت ئەیەوێ خەبەریــان کــاتەوە بــۆ ئەوەی هەســتن ســەیرێکی ئەم دیــمەنە جــوانەی نیشتیمانەکەیان بکەن.

پیاوەکان هەستان و چوون بەلای ولاخەکانیانەوە و ئامادەیان کردن و حەسـەن ئاغا بانگی کردە ژنەکان کە هەستن و بە پەلە خۆیان کۆکەنەوە و گوتی: ئەبێ پێش هەتاو کەوتن ئێرە جێبهێڵن نەوەکو تەیارە بێتە سەرمان.

ژنەکـان ڕاپەڕیـن و بە هـاتنی نـاوی تەیـارە خەو و ماوییـان بیرچـووەوە، ئامەخـان سەیرێکی دەوروپشتی خۆیی کرد و ڕووی کردە خوشکی و گوتی: کچەکە چ زوو ڕۆژ بـوەوە، خـۆ مادویمـان نەحەسـایەوە هەسـتایە سـەرپێ خـۆی تەکانـد و گـوتی: وەی قـوڕ بەسـەرم نەبێـت، ئەوە چـۆن لەسـەر ئەم بەردانە نوسـتوین، بەس نەبـوو شتێکمان بۆ نەهاتووە. پشتی کردە پیاوەکـان و سـەر و لەچـک و دەسماڵەکەی کرد بۆ ڕۆیشتن. تۆفە پێیگوت: وەرە دواربە دیسـان تـاقەتی هـاوار هاوارمـان نییە، ئـامە خـان چـونکە دنیـا تـۆزێ ڕونکـا ببوەوە و ڕێگاو بـانەکەی ئەبینی وەک و شـتێ ئەو ترسەی نەمابوو بۆیە گوتی: سوارئەبم ئەی چی ئەکەم؟

هەموویـان بەسـەر و مـۆتەلاکی شـیواو و خەوالـوەوە سـواربونەوە، ئەو دەسـتی ئەبرد بۆ پشتی و ئەویکەیان دەستی ئەبرد بۆ کلێنچکە و کەلەکەی، هەریەکەیـان شـوێنێکیان ئەیەشـا، لەسەرمانیشـا خۆیـان ئەوەنـدی تـر کـزۆڵە کردبـوو خۆیـان پێچـابوەوە، ڕونـاک تـاکو بەینێکیش هەر سـەری نـابو بە پشـتی دایکییەوەو خەو بەری نەئەدا. حەپسەخان لە دڵی خۆیا ئەیگوت کچەکە ئەمە چیە خـۆ مـن هەمـوو لەشـم تێکشـکاوە، لەبەر ئەم پیـاوانە نەبـوایە هەر نەمئەتـوانی هەسـتم، کەچـی لە ماڵەوە چەند لەشم سوکە؟ چەند زو هەڵئەستم و نوێژ ئەکەم، وای دایکتان بمرێ تـمەز حـاڵ و خەوی پێشـمەرگە وایە، ڕەنـگە هەمیشـە بە ترسـەوە بنـون لەبەر دوژمن و تەیارەکان.

حەسـەن ئاغـا حەپسـەخانی لە خەیالـدا، گـوتی: ئێسـتە ئەگەیـنە نـاو ئەو دار و درەختـانە و بەرەو قەیـوان ئەڕۆیـن، هەروا بەینێکیتـر ئەگەیـنە شـوێنێکی بـاش

ئاویشی لێیە لەوێ دابەزن و نانێک بخۆن، باکتان نەبێ دارستانەکەی ئەوەندە چرە تەیارەش هیچ نابینێت.
ئەوەندەی پێنەچوو هەتاویش کەوت، وردە وردە کەوتنە سەر ڕێگایەکی بەردەڵان تاوێری گەورە گەورە و درەختی بەڕو مازو و هەرمێ و کرۆسک و بەلاڵوک و گوێژ لەو ناوەدا بڵاوبوبونەوە، هەندێکیان لەبەر سەرماو ڕەشەبا ڕوت بوبونەوە و هەندێکیان گەڵایان زەرد و سور هەڵگەڕابوو، ناو بە ناو قەتارچییەکەی پێشەوە ئەیقیران: دادە سەرتان دانەوێنن بۆ ئەوەی لق پۆپی درەختەکانتان بەر نەکەوێ.
وردە وردە لە هەوراز بونەوەو کەوتنە ناو بنار و دۆڵەوە ئەوەندەی پێنەچو حەسەن ئاغا گوتی: ئەوەتا گەیشتن، ئەتوانن لێرە دابەزن.
دوای ئەوەی نانەکەیان خوارد و نەختێ حەسانەوە دیسانەوە کەوتنە ڕێ. حەپسەخان دەستێکی برد بۆ سەری و گوتی: خۆزگە چایەکیشمان لێبنایە، وای کە سەرم ژان ئەکا... چونکە ئەوانیکە بە ڕیز ئەڕۆیشتن هەر تۆفە کە لە نزیکییەوەبوو گوێی لە قسەکانی حەپسەخان بو بۆیە هەڵیدایە گوتی:جا ئێستە وەختی چایە؟ دەبا ئەم ژەمە چا نەبێت کفرە؟ حەپسەخان لە ترسی تۆفە کە نەوەکا قسەی زیاد بکابێدەنگ بوو چونکە ئەیزانی ئەمانی نییە کە قسەی بهاتەیە دەمگرتنی لانەبوو بۆیە پێیگوت: باشە باشە نەمانویست بیبڕەوە ئیتر.
نزیکی نیوەڕۆ گەیشتنە قەیوان. کچەکان زو زو دەمی خۆیان ئەگرت و بەوڵاخەکان پێئەکەنین کە وەختی سەرکەوتن بەسەر هەورازا چۆن دەنگیان لێبەرزئەبوەوە. ڕوناک دڵیشی پێیان ئەسوتا و لەبەر خۆیەوە ئەیگوت دەوەرە ئێمە وا ئیسراحەت لەسەر پشتی ئەم حەیوانە فەقیرانە دانیشتوین کەچی تاقەتمان چوەو مانوین و هەر ئەبۆڵێنین، ئەی ئەم حەیوانە بێزمانانە ئەبێ ئێستە چەن هیلاک بن؟ ئەوە چۆن ئەتوانن بەم ڕێگا سەخت و باریکانەدا بڕۆن؟ بەڕاستی جێی ترسە: خەریک بوو فرمێسک لەچاوی دەرپەڕی لەسەر دەنگی تڕ لێبەربونەوەکانیان خەیاڵی لێ تێک ئەچو بێ ئەوەی حەزی کردبێ سەیری ئەکرد وا دەمی خۆی گرتوەو پێئەکەنێت.. لەپڕ یەکێک بە پەرۆشەوە قیڕاندی: ئای باوکە ئەوە کوێیە وا دوکەڵی لێبەرز ئەبێتەوە؟
جەماعەت دڵیان داخورپا یەک لە دوای یەک ڕاوەستان و لە قەدی ئەو کێوە بەرزەوە ئاوڕیان دایەوە دییان وا هەردو کەڵەو لەچەند لایەکەوە بەرز ئەبێتەوە،

لەو دورەوە دیاربوو کە وەک گێژەڵوکە لولی ئەخوارد و بەرە و ئاسمان بەرز ئەبوەوە. حەسەن ئاغا دەستی دا بەیەکا و گوتی: وایش بەوخوایە ئەوە دێی ئابلاخە ئەسوتێ دیارە حکومەت پێیزانیوە و چۆتە سەریان و ئەو ماڵی ئەو کەسانە ئەسوتێنن کە یارمەتی خەڵک ئەدەن بۆ دەربازبوون وە لە صەدا صەد ئەم دوکەڵە هی ئەو مالانەن. ژنەکان بەمە زۆر نارەحەتبوون هەریەکەیان لە لایەکەوە کەوتنە بۆڵە بۆڵ و دوعاکردن و بەچاوێکی پڕ خۆشەویستی و بەزەیی و داخ و خەفەتەوە سەیری دوکەڵەکەیان کرد و ئەیانکێشا بەخۆیانا. نەختێ بەمجۆرە ڕاوەستان بەلام دوایی چارەیان نەما کەوتنە ڕێ. ئامەخان کە دی هەتا دێت هەر بەرز ئەبنەوە گوتی: ئەرێ بەقوربانتانبم ئەوە ئێمە بۆ کوێ ئەچین خۆ تۆزێکی ماوە بگەینە لای خوا، تۆفە ئەمەی بە هەل زانی کە نیکتەیەک بڵێ و خۆی بکا بە گوڵی مەجلیس، ڕووی تێکرد و گوتی:باشە کە ئەوەندە نزیکی خوا بویتەوە دە دوعایەک لەو زۆردارە نامەردانە بکە کەوا لەم خەڵکە بێتاوانە ئەکەن بەڵک و دوعاکەت گیربێت و خوا ڕزگارمان بکات لەدەستیان..
حەپسەخان بە تورەییەوە هەڵیدایە گوتی: کفر مەکە تۆفە، بڵێ ئەسەغفیرولا ئەو قسەیە کفرە.، خوا بەقوربانیبم بێشوێنە و لە هەموشوێنێکیش هەیەو نزیکە، تۆفە گەتی: وەلا من کفرم نەکردوە.. خوشکەکەت ئەڵێ.. تۆزێکی ماوە بگەینە لای خوا، ئامەخان و خوشکی ئەسەغفیرولایان کرد و تۆزێ لە ژێرەوە پێکەنین. بەلام ڕوناک هەر نارەحەت بوو، دوکەڵەکە برینەکانی کولانەوە بەجارێ، ئەو نیشانەی قومابوون و ئەمەی چەند وەختە ئەقەومێ هەمووی وەک سینەما ئەهاتنە بەرچاوی و مێشکیان ئالۆز کردبوو سەبریش چاوی بڕیبوە ئاو شاخ و کێو و ڕێگاو بانە، هەر پەڵە دوکەڵ یا ئاواییەکی لە دورەوە بەدی بکردایە دڵی دائەخورپا و ئەیگوت: تۆ بڵێی ئێستە شیروان لە یەکێک لەو ئاواییانە چاوەڕێمان ئەکات؟ ڕوشی نەئەهات بپرسێ کە ئاخۆ کەس دێت بە پیریانەوە؟.
نەسرینیش کە ئەگەر لە دورەوە لادێی یا شوان، یا چەند چەکدارێکی ببینیایە کەوا بەرە و لای ئەوان دێن وەیزانی ئەوە حسەینە و هاتووە بە پیریانەوە.
تۆفە هەناسەبڕکێی پێکەوتبو خیزەی سنگ و دەنگی کۆکەی لەو ناوەدا دەنگی ئەدایەوە.، هەر کە ئەگەیشتە ڕێبازێکی تۆزێ تەخت و رمان هەناسەیەکی هەڵئەکێشا و دەموچاوی ئەسڕیەوەو ئەکەوتە باسی زەمانی عەسکەرێتی خۆی

که چەند هاتووە بۆ ئەم شاخ و داخانە و چۆن بە شاخی زۆر لەمەش سەختترا وەک ئاسک هەڵگەڕاوە و سەرکەوتوە و قاچاغچییەکان چەندی لێئەترسان و چۆن جارێک لای پیرەمەگرونەوە توانیویە بە تاقی تەنیا پێنج کەسیان لێبگرێت و لەوێوە چوە سەر باسی ئەوەی کە چۆن ژنێکی گۆرانیبێژی عەرەب عەزی لێکردووە، حەسەن ئاغا و قەتارچییەکان کە هەر زو لەوە گەیشتن کە پیاوێکی فیشاڵکەرە حەزیان ئەکرد زۆرتر پێیڕابوێرن، جا حەسەن ئاغا کە خوێندەوار بووعەرەبی نەئەزانی و شارەزاتر بوو لەوان لەباسی گۆرانیبێژی عەرەبدا ناوی چەند گۆرانیبێژێکی بەناوبانگی وەک و سەباح و شادییە و فائیزە ئەحمەدی بۆ هەڵدا کە پێیان بڵێ لەوانە کامیان بووە کە حەزی لەو بووە ئەویش سەرێکی ڕائەوەشاند و ئەیگوت: نە نە ئەمانە نەبوون... ئەونەش زیاتر سەریان ئەکردە سەری و لێی ئەپاڕانەوە و سوێندیان ئەدا کە پێیان بڵێ کێ بووە، ئایان وت کاکە خۆ تازە ئەوە چەندساڵی بەسەرا تێپەڕیوە ئیتر بۆچ پێمان ناڵێی، لە پآس پاڕانەوە و تکایەکی زۆر تۆفە بەدەم ڕۆینەوە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: وەڵا سەمیرە تۆفیق بوو، گۆرانییەکیشی بۆ من گوتووە، حەسەن ئاغا و ئەوان هەموو بەیەکجار کردیان بە هاوار: سەمیرە تۆفیق ئەی ماڵ کاول بۆچی بەجێت هێشت؟ تۆفەش نەختێ بە ماتەمینییەوە گوتی: بڵێم چی ئیتر نسیب و قسمەت، پیاوەکان بەزۆر خۆیان گرتبوو کەنەدەنە قاقای پێکەنین، تاکو کاکە تۆفەش لەسەر قسەکردنی خۆی بڕواو ئەوانیش بۆخۆیان پێی ڕابوێرن، هەر کە نەختێ بێدەنگ بوایە لەپڕ یەکێکیان پرسیارێکی لێئەکرد و هانی ئەدا کە قسەی تریان بۆ بکات، حەپسەخان و ئەوان زۆریان پێناخۆش بوو، بەسپای لەبەر خۆیانەوە هەر بۆڵە و خوتەیان بوو، کەوا تۆفە ئەمانیشی شارەزای خۆی کرد. بەر لەوەی ئەم قسانە بکا چەند حورمەتیان ئەگرت وایان ئەزانی پیاوێکی تەواوە کە ئێستە شارەزای بوون ئەوەتە گاڵتەی پێئەکەن! گەیشتنە شاخەکە هەموو هیلاک و ماندوبوون، تۆفە هێزی لەبەر بڕابوو، ئەوەندەش خۆی هەڵکێشابوو لەلای پیاوەکانیتر ڕوشی نەئەهات باسی هیلاکی خۆی بکا، دوای پشودانێکی کەم کەوتنەوە ڕێ ماوەیەک بەرەو خوار ڕۆیشتن تا گەیشتنە پانایییەکی خۆشی پڕ دار و دەوەن. حەسەن ئاغا ڕوی کردە ژنەکان و دەستی درێژکرد بۆ چەند درەختێکی بەرزی پیر و کەڵە کە بەردێک و گوتی: ئا ئەوە کانی و ئاوێکی زۆر

خۆشە بچن پشویەک بدەن، ئێمەش ئەچینە ئەو خوارەوە ولاخەکان ئەبەینە سەر ئاو و نەختێکیس ئالیکیان ئەدەینێ بۆیە پەلە مەکەن.
ژنەکان کە دابەزین و هەندێ لە تێشوەکانیان لەگەڵ خۆیان برد ڕویان کردە کۆمەڵە درەخت و کەڵەکە بەردەکە. کە چوونە پێشەوە دییان لەبن چەند درەختەکە کانیاوێکی جوانو سارد هەڵئەقولێ، بەدەوریا چەند بەردە نوێژێ دانراوە هەندێ ژنە لادێی لەسەریان دانیشتوون دەستنوێژیان ئەگرت، هەندێکیکەش لەولاوە خەریکی دەست و پل شتن و ئەگریجە داهێنان، یا کوندەیان پڕ ئەکرد و مەشکەیان ئەشت.
ڕوناک لەبەر ئەوان ڕوی نەهات بچێتە سەر کانییەکە، دەست و پلی خستە ناوی ئاوی جۆگەلەو لەژێرەوە هەر سەیری ئەکردن، بەتایبەتی هی دەست و پلی پڕ لە بازن و ئەنگوستیلەی جۆرا و جۆر و متومورووی ملیان کە لە زیوینەوە تیایانابوو تاوانەی لە ئاسن و من و لە پلاستیک دروست کرابون لەگەڵ ئەوەشا کە هەوایەکی ساردیشی ئەهات بەلام ژنە لادێییەکان هەر گوێشیان نەئەدایە ئەتگوت لای جورنەی ئاوی گەرمی حەمامەوە دانیشتون کە ژنە شارییەکان هەتنە سەر کانییەکە وەک ناسیاوێکی کۆن، چاکو چۆنییەکی گەرمیان لێکردن و زۆر بە پەرۆشەوە هەواڵیان پرسین چونکە خراپی حاڵی خەڵکی شاریان بیستبوو، بۆ ئەوەی شەرمیش نەکەن و بەربەستی پشوی خۆیان بدەن، هەر زوو کانییەکەیان بۆ چۆڵکردن و بەرەو ماڵ بوونەوە دوای ئەوەی هەندێکیان تکای ئەوەشیان لێکردن کە میوانداریيان قبوڵ بکەن.
حەپسەخان و ئەوان هەر دانیشتن ئامە خان عەباکەی توند لە خۆیەوە پێچاو لێیکەوت و ئەوانی کاشیان پاش نەختێ حەسانەوە کەوتنە دانانی تێشووەکانیان ئینجا پیاوەکانیشیان بانگ کرد کە بێن ئەوانیش شتێ بخۆن.
دوای نانخواردن و پشودانێکی باش حەسەن ئاغا گوتی: ئینجا هەستن با بکەوینە ڕێ شەو لەو دێیە لە ماڵی یەک دو ناسیاو ئەنوین و بەیانی زوو ئەکەوینە ڕێ ئیتر پشو نادەین تا نەگەینە (ماوەت) لای کاکە عەلی.
شەو درەنگ بوو بوو کە گەیشتنە دێیەکە، ولاخەکانیان لەبەردەمی ماڵێکا ڕاگرت و ژنەکان دابەزین، هەموو کووڕ بوبون ئامە خان هەر لە شوێنی خۆی دانیشت

بەو تاریکیەو لەناو ئەو پەین و خۆڵەدا و لەبەرخۆیەوە گوتی: چی بە قورعان هەبووە بە پەڕۆ.
ماڵەکەی نوستبوو، حەسەن ئاغا خەبەری کردنەوە، بە چراوە هاتن بە پیریانەوە و بەخێرهاتنێکی گەرمیان کردن، وا دیار بوو کە ئەمە یەکەمجاریان نەبوو کە میوانی ناوەخت، لەخەو ڕایانپەڕێنن، فێری هاتوچۆی ئەو چەشنە ماڵە لە شار هەڵاتووانە بوو بوون کە بە ناچاری لەو دێهاتانە لایان ئەدا. ژنە خاوەن ماڵەکە پێشیان کەوت بە دەستێ چرای هەڵگرتبو بە دەستێکیش خەریکی سەر و سەرپۆش دەموچاوی بوو، کە زو زو دەستی پیا ئەهێنا بۆ ئەوەی خەوەکەی بە باشی بەریبدا. ژنەکە سەر پلیکانەیەکی تەسکی باریک کەوتکە لە تەنیش دەری حەوشەکەوەبو حەپسەخان و خوشکی و کچەکانیش شوێنی کەوتن تا گەیشتنە ژورێکی درێژ، ئەمبەرە و ئەوبەری چەند بەرەو کلیمێکی لێڕاخرابوو، دوو سێ دۆشەکیان لەسەر ڕاخرابوو، لەپەیەکیشا کۆمەڵە نوێنێک دانرابوو. لەسەر یەکێک لە دۆشەکەکان بۆی دانان و گوتی: فەرموون ئەوە نوێن و ئەوەش جێ، ماندووی ڕێگەن بۆخۆتان بنوون، خەوی خێرتان بێ، ئەمەی گوت و لێیدا ڕۆیشت، ئەمانیش کەوتنە نوێنەکان و بەپەلە هەریەکێکیان لیفە یا جاجم یا پەتو وە سەرینێکیان هەڵگرتو، لەلایەکەوە لاڵ و پاڵ لێیکەوتن، هەروەک مردوو بێ هەست و هۆش. تا ماوەیەک وەها مانەوە، لەپاشا بەرە بەرە جوڵە جوڵیان پێکەوت، بەر لە هەمووان ئامە خوان خەبەری بوەوە بە چاوی نوستووەوە خۆی ئەخوراند و ئەیبۆڵاند و بە ئەسپایی ئەیگوت: ئەم کێچانە نەیەڵن بنوین. نەختێ ئەمدی و ئەویدی کرد و هێندە کفت بوو، هەرزوو خەوی لێکەوتەوە، پاش ئەو سەبری و نەسرینیش هەندێ ورتە ورتیا کرد بەڵام زۆری پێنەچوو کەوتنەوە پرخە پرخ، ئەمجا حەپسەخان نەکەوتەوە ئەمدی و ئەودیو کردن، بە زمانێکی قورسی خەواڵوەوە ئەیگوت: وەی باوکە ڕۆ ئەمە چییە خوراین؟ بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو خەبەربونەوە و خۆ خوراندن و بۆڵە بۆڵەیان، هەر ماندوێتی و خەو زاڵتربوو بۆیە ئەنوستنەوە.
هێستا دنیا تاریکو ڕوون بوو کە مێشیش وروژمی هێنایە سەریان، ئیتر هەر بەوەدا ئەگەیشت کە لە سەر و چاویان دەریانکەن. حەپسەخان بە بێزارییەکەوە سەرپۆشەکەی لە ملی خۆی کردەوە و بە پەلە دای بە دەم و چاوی ڕوناک و

دەسماڵەکەشی لە سەر و چاوی خۆی ئاڵاند. ئەوانیکەشیان هەیەکەیان بەشتێ سەر و پۆتەڵاکی خۆیان شاردەوە، بەو حاڵەش خۆیان مات کردەوە و چاویان چوەوە خەو. بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو ژنە خاوەن ماڵەکە هاتە سەریان ئیتر چاریان نەما هەستان، ژنەکە پێیگوتن: ئەگەر ئەیانەوێ با بێن بیانبا بۆ کانی ژنان، ئەوانیش گوتیان بەشەو کەوتنە خۆیان، حەپسەخان لەشی بوبو بە لیر و هەر خۆی هەڵەکڕاند و لەگەڵ ڕوناک پرتە و بۆڵەی بوو، سەیری ئەوبەری ژورەکە بکە ئەوە تەویلەی وڵاخ و شوێن گا و گۆتەڵیانە.. هەر شوێنی ژورەکە خۆشی سەیری لەملاوە بەو هەموو پلیکانەیەدا دەچێتە سەرێ کە چی ئەوسەریشی لە ئاستی حەوشە و تەویلەکەیە.

ئامە خانیش عەباکەی تەکاند و دای بەسەریا و بە ئەسپایی گوتی: ژوری چی ماڵیان ئاوابێ ئەڵێی فارغۆنی قیتارە ئەوەندە درێژە، خوشکی گوتی: ئەوەی قەینا بەڵام ئەودیوی لەسەر ئەو تەویلەیەیە، ئەوە ناخۆشی کردووە، خۆ من ئەمشەو هەر کافر بە حاڵم بێت بەدەس کێچەوە، هتا بەیانی هەرخۆمهەڵکراندووە گەوزم داوە، سەبری بە ئەسپایی گوتی: دایە دایە لەرێی خوا بێدەنگبن ژنەکە لەسەر پێپلیکانەکان وەستاوە چاوەڕێمان ئەکا لەوانەیە گوێی لێبێت، قوڕبەسەرانە سەرەڕای چاکەش، گلەییان لێبکەین؟ چی بکەن هەر ئەوەیان هەیە، بەڵام ئێوە بەهیچ ڕازینابن و هەر ئەبۆڵێنن، ئیتر بێدەنگ دووی ژنەکە کەوتن چەند هەنگاوێک لەماڵەکە دور کەوتنەوە و لەیەک دو جۆگەلە پەڕینەوە و پاش نەختێک گەیشتنە دەشتاییەکی بەردەڵان، کە چەند درەختێکی گەورەی لێبوو، سەریان نابوو بەیەکەوە، حەسارێکی گەورە سەریگیرابوو، دەرگایەکی گەورەی داری پێوەبوو بەڵام لەسەر پشت بوو، ژنەکە چووە ژورەوە و ئیشارەتی ئەمانیشی کرد و گوتی ئەمەتا کانی ژنان، کە سەیریان کرد کانی چی وەک حەوزێکی گەورە وایەو دەوری کراوە بە بەرد و چیمەنتۆ و چەند جۆگەلەیەکی بچوکی لێبۆتەوە و ژنان شلپ و هوڕیانە، هەندێکیان ڕووتن خەری خۆ شوشتنن، هەندێ سەر و پرچی کردۆتەوە، هەندێ خۆی پۆشتە ئەکاتەوە، هەندێ دەسنوێژ ئەگرن و، هەندێکیش جل ئەشۆرن، ئەمانیش ڕەق وەستابوون، جوڵەیەن نەئەکرد، ڕوناک سەری نایە بناگوێی دایکی و گوتی: دایکە بەخوا بمکوژن لەبەر چاوی ئەم هەمو ژنانە دەستنوێژ ناشۆم و خۆم ناکەم بە سینەما،

دایکی گوتی: ئەرێ دایکم ئەوە بۆچی واتان لێهات، ئەی ئەمانەش ژن نین وەک و ئێوە؟ چاو بقوچێنن و گوێشی مەدەنێ، نەسرین گوتی: هەمووی قەیناکە بەڵام بەخوا شوێنەکەی و ئاوەکەشی زۆر پیسن.
ژنە لادێییەکان وادیاربوو هەستیان کردبوو، کەوا ڕەنگە مشت و مڕی ئەم ژنە شارییانە لەوەبێ کە ڕوویان نەیە وەک و ئەوان بکەن، بۆیە سەیری یەکتریان ئەکرد و پێئەکەنین، هەندێکیان بە تەوسەوە قسەیان لەگەڵ ئەکردن و دەوەرن ژنی چاک بنبۆچی واقتان ورماوە؟ یەکێکی کەیان لەولاوە بە زەردەخەنەیەکی مەکراوییەوە ئەیگوت:

- ئاخر ئەوان شارین فێری حەمام و شوێنی پاک و تەمیزن.. بەڵام هەرچەند کردیان، بەهیچ جۆرێ نەیانتوانی وایانلێبکەن هەنگاوێکیش لەخۆیانیان نزیک خەنەوە، بە پێچەوانەکەوە کشانەوە دواوە و هاتنە دەرێ، چەند خانە خوێکەیان ناچاربوو کە بیانباتە تەویلەکەوە و هەندێ ئاویان بۆ بهێنێ کە لەوێ سەر و شلّپ بدەن بە دەموچاویانا.

نان و چایان بۆ دانان، بەڵام لەبەر مێش نەیانتوانی بیخۆن، چونکە دنیا ساردی کردبو، هەموو مێشەکان ڕایانکردبووە ژوورەوە، ئیتر مەجبور بوون یەکێکیان بە پەڕۆیەک باوەشێنی ئەکردن و بەنۆرە ئایانخوارد، چایەکەشی بە دڵی حەپسەخان نەبوو، چونکە خۆ وەک و ئەڵێن وەستای سەماوەر و چا بوو چاکەی بەناوبانگ بوو ئێستەش ئەم چا شلەتێنەیان بۆ هێناوە و بەو حاڵەش کە هەیە تاک و هێناویشیانە نیوەی ڕژاوەتە ژێرپیاڵەکانەوە ئەمانیش شەرمیان ئەکردو چی بلێن سەرەڕای ئەوەی کە هاتونەتە سەر ماڵەکە و عەزیەتیان داون هەر ئەوەیان کەمە کە داوای چای حەوت ڕەنگیشیان لێبکەن. ئاخۆ فەقیرانە ئەو چایەشیان چۆن پەیا کردووە چونکە حکومەت ڕێگای هەموو شتێکی لێگرتوون و ئەیانگوت بۆ پێشمەرگەی ئەبەن، بۆیە هەروا شتێکیان خوارد و سوپاسی ماڵەکەیان کرد و دانیشتن و چاوەڕوانی جوابیان ئەکرد تا بکەونە ڕێ.

## ١٧

لای ئێوارە کە حەسەن ئاغاو تۆفە هاتن بەدووی ژنەکانا، هێندەیان پێخۆشبوو ئەتگوت مژدەی بەهەشتیاپێداون، بەپەلە هەموو هەستان بە سوپاسەوە ماڵئاواییان لە ژنە خانەخوێکەیان کرد، ئەویش زۆر بە گەرمییەوە بەڕێی کردن.

که هاتنه بەردەرگا ئەماخان چاوێکی بەدەوری خۆیا گێڕا و ڕوی کردە تۆفە و پرسی: ئەرێ تۆفە گیان ئەوە چیە؟ بزانم نە وڵاخێک نە شتێک دیار نییە؟ چییە بە پێ ئەڕۆین؟

- نا بە تەیارە ئەڕۆین، ئەوە بۆ دیسانەوە کەوتیتەوە بپڵە بۆڵ کردن؟

ئامەخان گوتی:

- ئەیەڕۆ خوا بتگرێ من چیم گوتوە، پرسیارێک بوو لێم کردی

تۆفە گوتی: کچێ خوشکم تۆ دە جارێ وەرە با نەختێ دورکەوینەوە لە ماڵەکە ئینجا ئەزانی بە پێ ئەڕۆی یا نەء... خۆ ئێرە شارع ڕەشید نییە ئوتومبێلەکەت بۆ بەر دەرگا! ئەوەتا جێیێک لەو خوارەوە ڕاگیراوە بۆتان، ئیتر بڕۆ و ئەوەندە مەڵێ ئا خ و ئۆف و وای مردم.

حەپسەخان لەگەڵ حەسەن ئاغا و کچەکان لەپێشەوەین ئەڕۆین و باسی ماڵەکەی بۆ ئەکرد کە چەند خزمەتیان کردوون و چۆن ئەو ژنە بەسەزمانە مێرد و دوو کوڕەکەی هەر بەیانی زوو ڕۆیشتن بۆ سەر ئیش و ئەو ماڵەش بە تەنیا بەسەر ئەوا ماوەتەوە: بە دەستێ هەویری شێلاوە و بە دەستێ خەریکی سەر و پێی ئەو گیسکە بووە کە بۆیان سەربڕیبوون و مناڵەکەشی لە بێشکەدا هەر گریاوە و ئەویش نەیپەرژاوە قومێ شیری باتێ و سەرەڕای دەردانیش پەیتا پەیتا هاتووە بەلای ئەمانەوە و چۆتە کانییەکەش بە تەنەکە ئاوی هێناوە. ڕوناک هەڵیدایە و گوتی: ئەی دۆشینی مانگا و بزنەکانت لەبیر چوو، دایکی پێکەنی و گوتی: وەڵا ڕاست ئەکەی ئەوەی لە هەموو ئیشەکانی لام من قورسترە، ئەوەیم لەبیرچوو. ئامەخان و تۆفەیش گەیشتنە لایان و گوێیان لە قسەکانی حەپسەخان بوو. ئامەخان داوێنی کەواکەی هەڵکردەوە، کە بە دوویا نەخشاو تۆفە پێی ئەگووت: چاوت لە کەواکەت نییە کە چەند جوان ڕێگەکە گەسک ئەدات. ئەویش بەدەم هەڵکردن و تەکاندنی کەواکەیەوە لە دڵی خۆیا ئەیگوت: (بەخوا لەبەر قسەی حەپسەخانی خوشک و ئاگام لە کەواو کراسیش نەماوە) ماڵی ئاوابێ چەند شت گەورە ئەکات، ئەوە یەکێ گوێی لێبێت، ئەوەندە مەتحی ئەو ژنە و باسی سەروپێ پاکردنی کرد وائەزانێ گیپەی دەرخوارد داوین...

کچێ دایکم گورج و گۆڵی چی سا بەو خوایە کەمە باوەڕ ناکەم تا دو ڕۆژی تریس لە پاکردنی ئەو سەلکە گیسکە بچوکە ببێتەوە، ئەوەندە خاو و خلیچک

بـــوون، هەر چاومـــان لە ڕێـــگەی ســـەروپێ بـــوو، ئـــاخریش وا ڕۆیشـــتین و نەمانخوارد، کچەکە ئینسـان لەم ڕێ و بـانە چەن نەوسـن ئەبێ، زۆر سـەیرە لە ماڵی خۆمان ئەو هەموو نان و چێشـتە خۆش و جوانە هەندێ جار بە زۆریش پێمنەئەخورا، کەچی لێرە مرخم لە سەروپێی ئەو ماڵە خۆشکردبوو، ئۆە دایکتـان بمرێ ئێستە ئاخۆ کوڕەکان و ئەو پێشمەرگە نازدارانە چی ئەخۆن و چەند حەز لە خواردنی خۆش بکەن، ڕۆحم دەرچی بۆیان.

گەیشـتنە شـوێنێک جێبێکـی بچـوکی ئەمریکـی ڕاوەسـتابوو، منـاڵە ورتـکەی ئەو ناوەی تێئالابوو، ئەوی سـەیری ئەکرد ئەوی ئەیقیژاند بـانگی ڕەفیقەکەی ئەکرد ئەیگـوت: هـاتیو ڕاکە جێبەکە هـاتووە ئێسـتە ئەڕواتەوە، دوایکەشـیان مشـت و مڕیانبوو، ئەو ئەیگوت چوار گڵۆپ هەیە دوانی زل لە پشـەوە و دوانـی بچـوکیش لە دواوە، ئەویتریان ئەگوت نەخێر وانییە لە پشتەوە چوار هەیە..

حەپسـەخان هەر سـەیری جێبەکەی کرد لە دڵـی داخورپـا و بە ئەسـپایی گـوتی: ئەی قوڕ بەسەرم نەبێ ناشێ هەمووومان بخزێننەوە نـاو ئەم جێبە بچکۆلەیەوە؟ بەڵام خۆیگرت و هیچ قسـەی نەکرد تـا بزانـێ چـی ئەڵێن، بەشـکو وانەبێت ئەمە هەر بۆ بەشـێکیانبێت و ئەوانیکەشـیان بە جێبێکـی کە بـڕۆن دیسـانەوە حەسـەن ئاغـا لە خەیاڵیـداو گـوتی: دەی دادە گیـان سـواربن و جێـی خۆتـان لە پشـتەوە بکەنەوە، من و کاکە تۆفەش لە پێشەوە ئەبین.

ئامەخـان سـەیرێکی خوشـکی کرد و گـوتی: ئینجـا چۆن جێمـان ئەبێتەوە؟ سـەبری و نەسـرین عەباکانیـان لە خۆیـانەوە پێچـاو چـوونە ئوتـومبێلەکەوەو خۆیـان خزانە یەک و بانگی دایک و پوریان کرد و گوتیان: دەی وەرن ئێمە هەر جێی یەکێکمان گرتووە.

ئـــامە خـــان بە کەساســـی گـــوتی: ئـــاخر مـــن دڵـــم زۆر تێکەچـــێ ئەبـــێ لای پەنجەرەکەوەبـم، حەپســـەخان بەدەم بـۆڵەی ئەسـپاییەوە گـوتی: بەخـوا مـن لە ناوەڕاستابم هەر ئەمرم، سەبری و نەسرین گوتیـان: باشـە ئەمـلاو ئەولاکەی بۆ ئێوەو ئێمەش لە ناوەڕاستاو ڕونـاکیش ئەخەینە باوەشـمان، ڕونـاک دەمـی خۆی گـــرت و بە پێکەنیـــنەوە گـــوتی: ئەمـــخەنە باوەشـــتان؟ بەخـــوا هەردوکتـــان ئەپلیشێنەوە.. ڕۆڵە من ئەڵێی ورچم..

هەموو پێکەنین و دایکی و پوری لە دڵی خۆیانا، دو سێ دوعای چاوەزاریـان بۆ خوێنـد و هەرچۆنێـک بـوو بـوو نـاڕەزاییەکی بێـدەنگ حەپســەخان و خوشـکی

سواربوون، ئەوجا پیاوەکانیش ئیتر جێبە بۆریان کەوتە ڕێ، بەڵام قوڕبەسەرە بەحاڵئەیتوانی بڕوا، خەڵکەکەی ناویشی وەک و یاپراخیان لێهاتبوو، ئانیشک و قۆڵیان چەقیبووە کەلەکەو ورگی یەکتری، ئامە خان هەرزوو شتێکی خستە دەمیەوەو دەستی کرد بە ملّچە ملّچ، ڕوناک بە ئەسپایی لێیپرسی پورێ گیان ئەوە چی ئەخۆیت. پریاسکەیەکی بۆ ڕاگرت و گوتی: ئەوە ترش و خوێیە بە صەدەقەتبم، بۆ دڵ تێکنەچوون زۆر چاکە، ها تۆزێ بکەرە دەمتەوە، ڕوناک بە ئەسپایی و بە پێکەنینەوە لە کوێ پەیاتکرد؟

- ئەوە بەقوربان هێشتا لەشاربویین خستبوومە گیرفانمەوە وامەزانی هەر بە قەمەرەو شتیوا دێین بۆ ئێرە.

جێبەکە لەبەر نارێکی ڕێگەکە کەوتبووە هەڵتەک، ئەوەندەیپێنەچوو شەویش داهات و ئیتر چاویان لە هیچ نەما، کەلەمەدا بەختیان هەبوو ئەگینا پێش هەموویان ئامەخان زیرەی ئەکرد چاوی بە شیو و کەندەڵان و هەزار بە هەزار و بەرزی و نزمی و باریکی ڕێگەکە بکەوتایە، بالام چونکە شاخ و داخ و ڕێ و بان گشت تاریکبوون تەنها ڕۆشنایی چرای ئوتومبێلەکەبوو کە بەردەمی خۆی ڕوناک ئەکردەوە چاویان لەملا و ئەولای خۆیان نەبوو.

تۆفەش گەرمی کردبوو ئەمجارە باسی تورکیای بۆ ئەکردن، کە چۆن ساڵێک بە لاوی ڕێگای بزر کردووە و شاخەو شاخ گەیشتۆتە شارێک و زانیویەتی کە ئەوە شارێکی تورکیایە، ئیتر بە ناچاری بووە بە میوانی ماڵێک، ماڵەکە پیرێژنێکی تیابووە بە دوو کچیەوە ئەمیش داوای لە پیرێژنەکە کردووە کە ژورێکی بداتێ بە کرێ، ئەویش ژوری ئەداتێ و کچەکانیش هەرزوو حەزی لێئەکەن و زۆرجار ئەیکەن بەشەر لەسەری یا نانیان نەئەخوارد تا کاکە تۆفە ئەگەڕایەوە لە سەیران و گەڕان، لێخوڕی جێبەکە پێشمەرگەیەکی زۆر دڵسۆزبوو، وەختی خۆی بۆ دایەرەیەکی حکومی کاری ئەکرد، لەپاشا بەخۆی و جێبەکەیەوە گەیشتبووە ناو پێشمەرگە و کاری ئەکرد، لەوێش جێبەکەی بۆ ئەوان ئیشپێئەکرد و خەڵکی دەرباز ئەکرد و ئیشی بۆ شۆڕش ئەکرد و ناوی حەسەنە بچکۆل بوو، جا لەگەڵ ئەوەشا کە کوڕێکی خوێندەوار و زیرەکیش بوو، بەڵام چونکە یەکەمجاربوو تۆفە ببینێ شارەزای فیشاڵەکانی نەبوو، بە گومانەوە گوێی لێئەگرت و لەپڕ لێیپرسی:

- باشە کاکە تۆ ئەڵێیت گوم بووم شاخەو شاخ ڕۆیشتم تا گەیشتیتە تورکیا ئەی چۆن لەو هەموو ڕێگایە یەکێکی توش نەبوو کە لێت بپرسێت بۆ کوێ ئەچیت، کێی تۆ، لە کوێوە هاتووی، کوا پاسپۆرتت، هەر تۆ خۆت کە زانیت ڕێت بزر کردووە نەئەبوو بۆ یەکێک بگەڕێیت بەشکو ڕێگاکەت پێ پیشان بدا؟ تۆفە منگە منگێکی کرد و جگەرەیەکی دەرهێنا و خۆی بە داگیرساندنییەوە خەریک کرد ویستی بەسەر پرسیارەکەیا بازبدا و لەبیر خۆیی بەرێتەوە، حەسەن ئاغا دەستێکی لە لێخوڕەکە وەژەند و بە چاو تێیگەیاند کە ئەو هەقی نەبێ بەسەرە هەر گوێ بگرێت.
- ژنەکان زۆر سەغڵەتبوون بەڵام ئیشیان بەوە باشبوو کە خەیاڵی ئەوەی ئێستا ئەگەنە لای خۆشەویستەکانیان و دەست ئەکەنە ملیان و بەیەک شاد و شکور ئەبنەوە هەموو شتێکیکەی لەبیر بردبوونەوە و خەیاڵیان ئرۆیی تا لەپڕ یەکێکیان بە بێزارییەوە بۆڵەیەکی لێوەئەهات و وای بەوکە گیانێکی بۆ ئەکرد و هەوڵی ئەدا بەشکم بتوانێ باری ئەندامێکی یا جێ دەستی یا جێ قاچێکی بگۆڕێت، ئەوەی زۆرتر سەغڵەتی کردبوون تۆفەبوو کە وەک و ڕادیۆی چایخانە کرابوەوە و ئەو حەکایەت و بەسەرهات و بێسەروبنە درۆیانەی ئەگێڕایەوە و دوو پێشمەرگەکەش پێی پێئەکەنین و پێیان ڕائەبوارد، ئەمانیش نەیانئەتوانی بێدەنگیکەن ئەیانناسی کە چ دەمێکی پێوەیەو دور نییە کە تەریقیان بکاتەوە چەنکە زۆر نازی بەسەرا ئەکردن و ئەویش لە گەورە و بچوکیان توڕە ئەبووبێ ئەوەی کەسیان لە قسەی یا لە جنێوەکانیشی توڕە ببن یا بیگرنە دڵ بۆیە لای ئەو کەسانەی شارەزای پەیوەندی ئەو خێزانە و تۆفە نبونایە دەمی تۆفەیان نەئەکردەوە.

شەو درەنگ گەیشتنە ماوەت ڕوناکی چرای چەن ماڵێک بەحاڵ دیاربوو، جار جارەش ڕۆشناییەک لەپڕ لەناو دۆڵ و گرد و شاخەکان و ناو ئاواییەکەدا شەوقی ئەدایەوە و زۆر ئەبوو، ئامەخان چەند یا اللە و بیسمیلایەکی کردو گوتی: بەخوا بە بروسکە و هەورە تریشقە ئەچێت یاخوا بگەینە جێ بەرلەوەی بیکا بە تۆف و باران! حەسەن ئاغا دڵی خۆشکرد و گوتی: باجی ئەوە لای پێشمەرگەکانە وائیتر گەیشتینە جێ. ئەوی خەواڵوبوو کەوتە چاو گڵۆفینو خەریکی سەرو پۆتەڵاکی بوو، تۆفەو کە لەبەر چەنەدان وەنەوزیشی ئەدا، بەدەم

باوێشــکێکەوە جامــانەکەی کــردەوە و بەســتیەوە و خــۆی گیــڤ کــرد، هەر ئەوەنـدەیان زانـی جێبەکە هێواشـی کـردەوەلەبەر بینایەکـا وەسـتا گـورج چەنـد زەلامێکی چەکداری لێدەرپەڕین و حەسـەن ئاغـاش دابەزی و کەوتە قسـەکردن لەگەڵیان ئینجا بە ئافرەتەکانی گوت دابەزن. ئەوانیش چونکە لە جێگا تەنگەکەیانـا دەقیـان گرتبـوو بە گـۆجی و شــەلی لە پیـرە جێـب هــاتنە دەرێ. هەردابەزیـن حەپســەخان ئەوەنـدەی زانـی چەک لە شـانێک باوەشـی پیـاکرد لە پێشــەوە زۆر سڵەمییەوە، بەڵام گورج بە دەنگێکی نەختێ بەرز گوتی: وەی لە دەورت گەڕێم ئەوە تۆی عەلی گیان ئەیەڕۆ ئەوە چۆنم نەناسیتەوە؟

ئیتـر حسـەین و کوڕەکـانی ئامەخـان هەمـوو بە جلـی پێشـمەرگەییەوە و تفەنـگ لەشـان هـاتن بـۆ لایـان و بـو بە دەسـت لەمـلان کـردن و مـاچ و مـوچ سـەبری ئەگەرچـی بـرا و پورزاکـانی مـاچکرد، بەڵام هەر چـاوی ئەگێـڕا و دڵـی خـورپە خورپی بو بۆ نەوشیروان و هەر بە چاو تروکانێک چەند خەیاڵێک بە مێشکیا تێپەڕی: ڕەنگە ئەو لەم دێیە نەبێت، ئاخۆ لە کوێبێت؟ دوربێ نەخۆش نەبێت؟ لەوانەیە نوسـتێ، نـا ئەی گـوایە نـازانێ کە مـن دێـم، هەمووەمـان دێین؟ تۆ بڵێی هەروازوو منی لەبیرچوبمەوە؟ هەر ئەوەندەیان زانـی لەلایـانەوە لایتێ دەرکەوت و دەنگـێ هـات، شـیروانبوو بە هەڵەداوان ڕای ئەکـرد تـا خـۆی گەیـانە لایـان: بە گەرمی و بە پەرۆشەوە دەستی خەسوی و خوشکی ماچکرد و ئەوانیش لامل و سەریان ماچکرد، لەگەڵ ڕوناک و نەسرینو سەبریش دەستیان گوشی، کوڕەکـان پێشیان کەوتن بیانبەن بـۆ خـانویەکی نەختێ لە شـوێنی دابەزینەکەیـانەوە دوور، بە چراو لۆکسەوە کەوتنە پێشیان و پێیان گوتن کە ئەو شەوە لەوێ ئەنوون، تـا بەیانی شوێنێکیان بۆ پەیا ئەکەن، لەلایەکی تریشەوە پێشمەرگەی تریش حەسەن ئاغایـان ئـابڵوقە دابـوو، چـونکە جـار و بـار کـاغەزی بـۆ ئەهێنـان و لە کەس و کاریانەوە، ئاینوست ئەگەر بۆی هێنابن زوو وەریبگرن!

لەڕێگای ڕۆشتنا بۆ خانوەکە، عەلی دیسان دەستی کردە ملی تۆفە و گوتی: ئـای کاکە تۆفە گیان بەڕاستی بیرم ئەکردی، یاخوا بەخێربێیت، هەرچەنـدە بـاوکم و مـاممبە تەنیـا مـانەوە بەڵام گـوێ مەدەرێ زۆر چاکـت کـرد کە هــاتی تـۆفەش دەستێکی بەسـەر و جامانەکەیا هێنا و کۆکەیەکی بۆکرد و خەریکبوو بکەوێتە قســەکردن بەڵام حەپســەخان نەیهێشــت پێشــیکەوت و گــوتی: وەڵا لە دەورت

گەڕێم، هیچ مەراقی باوک و مامت نەبێت، ڕۆژێ پێش هاتنی ئێمە، پورە ئافتاوت و هەردوو کچەکەی بە باوڵ و جانتاوەهاتن بۆ لامان، پێی گوتم کە یەک دەنک دڵت لای ئەمان نابێت، ئیتر هەر لێرە ئەبم. جا خۆشت پورە ئافتاوت ئەناسیت کە چەند ڕێک و پێک و بەدەست و بردە، عەلیش گوتی: بەخوا ئیشێکی باشی کردووە هەی ئافەرم پورە ئافتاو!

تۆفە ئیتر نەیتوانی خۆی بگرێ قسەکەی حەپسەخانی بڕی و گوتی: ئەوە قسەیە تۆ ئەیکەیت عەلی گیان، چۆن من نەئەهاتم؟ هەر یەکەم ڕۆژ ئەمویست بێم لەگەڵتان بەڵام بێقەزابیت تۆ نەتهێشت، ئەگینا چۆن دڵم بەرایی ئەهات ئێوە لەبەر ئەم گولە بارانەبن و من لە شار بم ؟!

حەپسەخان گوتی: وەی ڕۆحم دەرچی بۆ خەڵکی شار ئەوەندە ترسیان لە دڵایە، بۆچی ئەتوانن تێربنوون؟! هەموو ڕۆژێ ئەو زۆردارانە بەزمێکیان پێ ئەگێڕن، بۆچی وائەزانی خەڵکی شار لە کەیفان؟ تۆفە هەر ئەیویست محازەرەکەی خۆی لەسەر میللەت و خاک و پاراستن و پەرستنی تەواو بکات، بەڵام ماوەی نەبوو چونکە گەیشتنە خانووەکە ئیتر بوو بە غەڵبە غەڵب و هەرکەسە قسەیەکی ئەکرد.

چونە ناو خانوویەکی چیمەنتۆی ژوور گەورەی فەرح و خۆش، بەڵام لە هەندێ بەرە و پەتوو سەرین بەولاوە هیچ ناوماڵێکی تیانەبوو. ئامەخان هەر زوو عەباکەی لەخۆی کردەوە و گوتی: ئۆخەی خانووی واش هەیە لێرە، خۆ ئەڵێی خانوی شارە! حسەین دایە قاقای پێکەنین و گوتی:

ئەی هەر لای ئێوە خانووی کۆنکریت و خۆش هەبێ؟ ئەوەتا ئێمەش هەمانە. ئەمانە هی حکومەت بوون کە پێشمەرگە ماوەتیان گرت، ئەم خانووانەشیان بۆ مایەوە.

دایکی گوتی: ئۆە یارەبی موبارەکیان بێت و نوخشە لە هەزان خانو دێهات و شاریش کە داگیریکەن.

حەپسەخان و خوشکی لە خۆشی کورەکانیان کەوا بە جلی خاکییەوە چەک لەشان لایانەوە بوون لە دیاری پێغەمبەر! لەپاشان دانیشتن پێکەوە و عەلی لەگەڵ دایکی و ڕوناک باسی شار و ماڵ و چونە بەغدادی نەوبەهاریان ئەکرد. ئامە خانیش کەوتبووە تورەکە و پریاسکە هەڵرشتن، جل و بلوز گۆرەوی و ئەو شتانەی پیشان ئەدان، کە بۆیان هێنابوون و باسی سواربوون و کەوتن و بەپێرۆشتنی خۆی و جێب سواربوونەکەیان بۆ ئەگێرانەوە و کولیچە و کولێرە بە ڕۆنی ئەخستە بەردەمیان، کورەکانیش هەر یەکەیان بەشی خۆیان لە خواردنەکانیان کردەناو دەسرەکانیانەوە کە بیبەن لەگەڵ هاورێکانیان بیخۆن.

سەبری و شیروانیش هەرچەندە پێکەوە دانیشتبوون و قسەیان بع یەک ئەکرد و باسیان بۆ یەک ئەگێرایەوە، بەڵام لە خۆشی بەیەکگەیشتنەوەکەیان هەر ئاگایان لە قسەکانیان نەبوو.

حسەین و نەسرینیش لە ژێرەوە سەیری یەکیان ئەکرد و ئەتگوت هەرچی خۆشی دنیا هەیە لە چاو و دڵی ئەوانا کۆبووەتەوە.

پاش بەینێک دانیشتن، کورەکان هەستان و پێیان گوتن، ئێوە ماندون بنون ئێمەش ئەگەڕێینەوە بۆ بارەگا، ئینجا سبەینێ دێینەوە بۆ لاتان و خانوشتان بۆ پەیا ئەکەین.

بەڵام ئەما خان نەیهێشت کوڕە بچکۆلەکەی بڕواتەوەلەگەڵیان و گوتی: تخوا با ئیمشەو لای من بێ، تێر دەست بکەمە ملی، ئەوانیش کردیانە پێکەنین و هەڵاو گوتیان: باشە با هەر لاتبێت تا تێری لێئەخۆیت، ئیتر ئەوان لێیاندا ڕۆین.
ئامە خان سەری بەختیاری نابو بە سنگییەوە و لێی ئەپرسی: تخوا بەخە گیان لەگەڵ نەخۆشی چۆنبویت؟ چەند جار ئاڵووەکەت وای لێهاتۆتەوە؟ وەی دایکت بمری بەخوا شەو ڕۆژ ورێنەی تایەکەشت لە گوێچکەمە ئەزرینگایەوە، دیسانەوە ئەکەوتەوە ماچکردنی.
بەختیار بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە گوتی: نەخۆشی چی و تاو و ئاڵکو کەوتنی چی دایە گیان!؟ بەسەری باوکم ئەوەتەی هاتوم بۆ ئێرە یەک ڕۆژیش نەخۆش نەکەوتوم، مەگەر لە کاغەزەکانما بۆم نەئەنوسیت!!
دایکی بە چاوێکی پڕ خۆشەویستی و پەرۆشی دایکانەوە سەیرێکی کرد و گوتی: بڵێم چی دڵم بەو قسانە ئارام نەئەبوو، وامزانی لەبەر دڵی من ئەو جۆرە قسانە ئەنوسیت، بۆ ئەوەی خەفەتم نەدەیتێ.
شەوێ کە کوڕەکان گەڕانەوە بارەگا، بێستوونی هاوڕێیان هێشتا هەر لەوێبوو چاوەڕوانی ئەکردن، لەگەڵ هەواڵپرسینێکی گەرمی کەس و کارەکەیانا، گلەییەکی زۆریشی لێکردن کە ئاگاداری ئەویان نەکردووە، لەگەڵیان بچێت بۆ بەخێرهاتنیان، ئەوانیش دڵیان دایەوە پێیان گوت: کە نەچووە بچێ بەیانی ئەیبەن بۆ لایان>
ئەو شەوە بێستون خەوێکی ئەوتۆی لێنەکەوت، یان ڕاستتر خەو و بێخەوییەکی وەک و یەک بوون: بیری ئەکردەوە لە ژیانی پڕ بە شۆڕشی، لە سلێمانی کەوا لەگەڵ هاوڕێیەکی، خانوویەکی بچوکیان گرتبەە، خەریکی خوێندنبوون، ناو بە ناو سەبری کە لەگەڵ ئەما هەردوکیان ئەندامبوون لە پارتیدا، بە ڕوناکی خوشکیان بەیاننامەو بڵاوکراوەکانی بۆ ئەنارد، ئەویش زۆر بە حایاو شەرمەوە هەر لە دەرگاکەوە ئەیدایە دەست و بەپەلە ڕوی ئەکردەماڵی ئەندامێکیتر، وای کە کچێکی جوان و ئازا و بەحورمەتبوو، کە خەویشی لێئەکەوت خۆی لە یەکێ لەو کۆبونەوانەدا ئەدی کە جار و بار لە ماڵی ئەوان ئەیانکرد بۆ کاروباری پارتایەتی لە خەوەکەدا ڕوناکیش وەک ئەندام لەگەڵیان دانیشتبوو و قسەی لەبارەی سیاسەتەوە بۆ ئەکرد، ئەمیش لە باتی ئەوەی گوێ لە قسەکەی بگرێ،

هەردوو چـاوی بڕیبـووە ئێسـکە سـوکەکەی. ڕونـاکیش وەک هەسـتی پێبکـا و پێینـاخۆش بـێ هەڵئەسـێ بـڕوا ئەمـیش دەسـت ئەبـات کە نەیەڵێـت و خەبەری ئەبێــتەوە، ئەجــا ئەوەی دێــتەوە بیــر کە چــۆن تــا ئێســتا توانیــویەتی ئەو خۆشەویستییە بشارێتەوە و لای کەس دەرینەبڕێ، تەنیا ئەو جارە نەبێ کە لای حەمەی هاوڕێ و هاوخانوی درکاندی و گوتی: وەختە بۆی شێت ببم، ئەوەندە ڕەوشـت و خـویەکی بەرز و ئێسـکێکی سـوکی هەیە، ناشـزانم تـۆ بڵێـی ئەگەر ڕۆژێ خوازبێنی بکەم بمدەنێ؟ وە ئەویش دڵی خۆشکرد و گوتی: گوایە بۆچی ئەبێ نەدەنـێ؟ خـۆت کـوڕێکی بـاش و قـۆز و نیشـتیمانپەروەر و خوێنـدەوار و باوکیشت حاڵێکی باشی هەیە ئیتر لە چی ئەترسیت؟ ئەمیش پێی گوت کێ ئەڵێ ڕازی ئەبن کە کچ بدەن بە لادێی؟ حەمەش گوتی: ئینجا کە تۆ ئەوەندە خۆشت ئەوێ و کارەکەشت لەسەر مەسـەلەی شـار و لادێ یەکـی بکەوێت، هـیچ سـێ و دوی لـێمەکە بگـوێزەرەوە بۆ سـلێمانی... بێسـتون کە بیـری ئەکەوتەوە وا ئێسـتا لەبــاتی ئەم بگــوێزێتەوە بــۆ شــار خــوا ئەوانــی هێنــاوەتە نەک هەر لادێ، (مـاوەت)یش! ئەگەرچـی هـۆ و چەشـنی هاتنەکەیـانی لاخۆشـنەبوو، بەڵام هەر هاتنەکە و لێکنزیکبونەوەکەیان خەریکبوو باڵی پێبگرێ، ئەو لەو خەو خەیاڵانەدا بوو کە گوێی لە دەنگی عەلیبوو بانگی ئەکرد هەستێ خۆی کۆکاتەوە با زوو بچن بۆ لای دایکی و ئەوان.

***

بەڕێوە بێسـتوون گـوێی لە کوڕەکـان بـوو باسـی خانوویـان ئەژرد کەتێگەیشـت مەسەلە چییە، پرسی ئەوە قسە لە چی ئەکەن؟ خانوتان ئەوێ بۆ حەپسـەخان و ئەوان؟ خەمتـان نەبـێ هەر ئێسـتا ئەچـم کلیلـی خانوتـان بـۆ دێنم، خـانوویەکی چۆڵمان هەیە، ئەوەی ماڵی مەئمورەکەی تیابوو کە پێشـمەرگە خـۆی ناردییەوە بـۆ شـار، ئەوە کەسـی تیـانییە، ئێسـتە هەر بەخێرهـاتنێکی پـورە حەپسـەخان و ئەوان ئەکەم و ئەچــم بە فڕکانێــک کلیلەکەیتــان بــۆ ئەهێــنم. کوڕەکــان بەسەرسوڕمانەوە لە بێخەبری خۆیـان تەماشـای یەکتریـان کـرد و عەلی گوتی: ئەی سوپاس بێستون گیان بەڕاستی لە کێشەیەکی گەورە ڕزگارت کردین! هەم شوێنەکەشی باشە و هەم لەسەریشیان دێ لەپێیـان دەردەچێت.. زۆر سـوپاس.. بێستوون بەشەرمەوە گوتی: ئینجا کاکە عەلی ئەوە سوپاس ئەهێنێ.. مـاڵی ئێمە

هی کێیە؟ بەدەم ئەم قسانەوە گەیشتە شوێنی ئافرەتەکان، بێستون بەخێرهاتن و خۆشی و چۆنییەکی گەرمی لەگەڵ حەپسەخان و ئەوانکرد، بەڵام نەختێ شڵەژابوو، هەندێ جاریش دەمی تێکەڵ و پێکەڵ ئەبوو بەتایبەتی کە ڕوناکی ئەدی بە جلی کوردییەوە سەرپۆشێکی داوە بە پرچە کاڵە جوانەکەیا و زو زوش بە چمکەکەی دەمو لێوە خونچە گوڵەکەی پێدائەپۆشێ کە بە قسەی یەکێکیان ئەهاتە پێکەنین، خۆ کە حسێنی برای دەستی برد پرچە جوانەکەی بە ئەسپایی ڕاکێشا گوتی: هەی شەیتان دیسان هاتیتەوە بەردەستم، دەستی کردە ملی کچە دەم و چاوی سور هەڵگەڕا و هەموو لەشی نیشتە سەر ئارەق، بێستوون کە ئەمەی دی ئەوەندەیتر شێتیبوو. کە نەختێ هاتەوە سەرخۆی بە هەموویانی گوت کە بۆ نیوەڕۆ لە ماڵی ئەوانن. بەهەڵەدانیش چو دایکی تێگەیان کەوا باڵی کاک عەلی و ئەوان هاتوون و نیوەڕۆ لای ئەمان قاوەڵتی ئەکەن. لەوە بوەوە بە پەلە چووە لای باوکی بۆ کلیلی خانووەکە، باوکی ئەگەرچی ئەمەی پێناخۆشبوو، وەگەڵێ کردەوەی بێستونی بەدڵ نەبوو بەتایبەتی دەستبڵاوییەکەی چونکە خۆی کابرایەکی گیر و دەستقوچاو بوو. بەڵام لەبەر ئەوەی کە کوڕە گەورەی بوو یەکێ بوو لەو تاک و تەرا لاوە ماوەتیانەی کە خوێندنیان تەواوکردبوو، لەناو خەڵکا خۆی پێوە هەڵئەکێشاو بە ئەقڵ و زیرەکی و لە خوێندنا پێشکەوتویی هەڵئەدا: کە چۆن بەیەکەم دەچوەو عەرەبی وەک و بولبول ئەزانێ و تا تەنانەت هەندێجار کە بێستون دەنگ و باسی شتێکی بۆ ئەخوێندنەوە، ئەویش هەر کەسێکی بدیایە بۆی ئەگێڕایەوە، زۆرجار بێئەوەی بە تەواوی خەبەرەکە یان ناوی شار یان وڵات یان خەڵکەکە بە ڕاستی بزانێت و چەند ئەوەندەیەکیشی ئەخستە سەر خەبەرەکە و بۆ خەڵکەکەی ئەگێڕایەوە، لەبەر ئەمە هەموو جار پێی لە دڵی خۆی ئەنا و بەقسەی ئەکرد و دڵی نەئەشکاند!

بۆ نیوەڕۆ لە ماڵی بێستوون بوون، ئەگەرچی لە خۆشیانا گەشابوەوە، بەڵام ئەوەندە ژیر و بەحورمەت و لەسەرخۆبوو، شتێکی وای لێڕووندەدا کە هیچ کەس هەست بە گۆڕانکارییەک بکا، هەرچی وەکو ڕوناکیش بوو، ئاگای لە هیچ نەبوو. وە لە دڵیشا ڕقی لە بێستوون بوو و هەرچەند سەبری شتێکی پیائەنارد بۆ یەکەمجار پێیگران بوو، وە جار جار کە ئەهاتە ماڵیشیان هەتا ئەڕۆیشت ئەم

هەر لە دڵی خۆیا ئەیبۆڵاند و ئەیگوت: دیسانەوە هاتەوە بۆ چاوبڕینە خەڵک! کابرای تایەن ئەڵێی بۆ ڕەسمگرتنمان یەت! گەجە نەیئەزانی کەوا ئەو بەسەزمانە هەر تەنیا حەزی بە تەماشاکردنی ئەو ئەکرد، بەتەنیا ڕەسمێ کە ئارەزویی گرتنی ئەکرد بە دڵ، ڕەسمی ئەو بوو! لەسەر زۆری بێستوون بە خۆی و دایکی لەگەڵ میوانەکان ئەوەندە خەریکبوون و نابێ و ناکرێیان گوت، هەتا ڕازیانکردن کە ئەو شەوەش لەوێ بمێننەوە، هەتا بەیانی خانووەکەیان بۆ ڕێک ئەخەن.

***

## ١٩

چوونه ماڵەکەی خۆیان کە خانوویەکی خۆشکەلەبوو، سێ ژوورو هەیوانێکی هەبوو لەگەڵ سەرشۆرک و سەرتەنورێک و حەوشێکی پان و بەرین. ئەگەرچی لە خشتی کاڵ دروستکرابوو بەڵام، رێکوپێک بو. هەرزوو بە کڕین و بەیارمەتی ماڵی بێستوون و چەند ناسیاوێکی کەی کوڕەکەیان ماڵێکی لەچاو لادێدا باشیان رێکخستوو، ژورەکانیان بەشکرد بەسەر خۆیانا. ئەوەی ئەم ژوور دابەشکردنەی بەدڵنەبوو حسەین و نەسرین بوو، هەرچەندە بەپێی شەرع حەلاڵی یەک بوون نەسرین لە حسەین مارەکرابوو بەڵام چونکە بەپێی عادەتی کوردەواری نەگوێزرابوەوە نەسرین لای دایکی و ئەوان، حسەینیش لە بارەگا ئەنوست. هەریەکەیان دڵی پڕبوو لە گلەیی و ناڕەزایی بەتایبەتی کە جاروبار گوێیان لە قسەو بڕوبیانوی دایکەکانیان ئەبوو هەر وەختەبوو لێک بنەوە. حەپسەخان ئەیگوت: ئەیەڕۆ کەس قسەی وا نەکات یەخەی خۆم دائەدڕم! چۆن ئەو کوڕە نازدارەم لێرە ژنەکەی بگوێزێتەوە؟ لە خانوی قوڕاو لەسەر ئەم بەڕە و دۆشەکە شڕە خواستەمەنیانەو لەم دەربەدەری و ئاگربارانەدا؟؟ بەخوا تاکو شاییەکەی بەدڵی خۆمی بۆ ئەکەم هەروا ئەیانهێڵمەوە، جارێ پەلەیان چیە خۆ ئیشەلا دنیا هەتا سەر وا بەقوڕ ناگیرێ.!!؟

ئەوانیش لە دڵی خۆیانا ئەیانگوت: بەڵێ پەلەمان چییە؟ حەپسەخان مرخی لەوە خۆشکردووە کە ئەوپەڕەکەی یەک دوو مانگی تر دنیا ئەبێتەوە بە ماستی مەییو و کورد بەهەقی خۆی ئەگات و ئەویش ئەگەڕێتەوە لای خیوەخانی خۆیی و لەوێ شایی حەوت شەو و حەوت ڕۆژەمان بۆ ئەکات! بەخوا خەوێکی خۆشە خۆزگە ئەهاتدیی، بەڵام هیچ شتێک ئەوە دەرناخات کە ئەم وەزعە ڕوو لە باشی بێت، بەڵک و لەوە ئەچێ کە بەرەو خراپتر بڕوا، جا ئێمە تاکەی هەروا ڕائەوەستین و چاو ببڕینە یەکتری؟؟

هەرچی ئامەخانیش بوو زۆرجار ئەیگوت: هەی هەی من تەنیا ئەو تاقە کچەم هەیە ئێستە هیچ ناکەم ڕازی ئەبم هەروا بێدەنگ و سەنگ وەک و بێوەژن دەستی بگرن و بڵێن ها نەسرین ئەوە ژوری خۆت و حسەینی مێردت؟!!

نەسرینیش و حسەینیش ئەم قسانەیان زۆر پێناخۆشبوو بەڵام ڕوویان نەئەهات ناخۆشی خۆیان دەربڕن نەک هەر ئەمە زۆرجار حسەین تەنانەت لە

گلەییەکانیشی پەشیمان ئەبوەوە و لە دڵی خۆیا قسەی بەخۆی ئەگوت کە کەی ئێستە وەختی ئەوەیە بچێ بڵێ ئەمەوێ ژنەکەم بگوێزمەوە، هێشتا دێ نەگەییوە دوکەڵ گەیی، هێشتا ماندوییان نەحەساوەتەوە، وا ئارامم لەبەر بڕا بەخێرێ من لای خۆم خەباتکەرە سەرسەختەکەم کە ئەبێ لەم تەنگانەیەدا هەموو هەست و هۆش و دڵ و مێشکی لەلای شۆڕش و میلەتەکەی بێت؟؟، هەرچۆن ڕووم دێ ئیتر سەیری ئەو برادەر و هەڤالانە بکەم کە ژن و ماڵ و منالی نازداریان بەجێهێشتووە؟؟ یەکێکی وەک کاکە قوباد چۆن ڕوت یەت جاریکیتر سەرهەڵبڕی لە عاستی ئەوی کە کوڕەکەی دوسالانەو هێشتا لە ڕەسما نەبێت چاوی پێینەکەوتووە چونکە ئەو لە بەندیخانەی کەرکوک بووە کە ژنەکەی منالی بووە، لەپاشا کە شۆڕش دەستی پێکردووە لەگەڵ دوو هاوڕێی ڕایان کردووەو خۆیان گەیانۆتە شاخ. وەیش چۆن هەموو جارێک ڕەسمەکەی لەبەر باخەڵی دەرئەهێنێت و پشانی هەموومانی ئەدات.. نە.. نە،، بۆ خاتری خوا ئێستە نابێ هەر بیەڵم خەیالی ژن گواستنەوەش بە مێشکما تێپەڕێت، جارێ بۆ ئەوە زۆر زووە!

***

هەر پاش دو سێ ڕۆژ سەبری و شیروانکەوتنە دەمەقالێ و پرتە و بۆڵە لەیەک، شیروان ئەیگوت:" ئێرە جیایە لەگەڵ شار، تەنانەت وەک دێش نەماوەتەوە، هەموو پێشمەرگەن و دۆست و برادەرمانن و هاتوچۆی ماڵمان ئەکەن بە تایبەتی چونکە بەشی زۆریان کەس و کاریان لێرە نییە، جار جارە خاوەن ژن و ماڵەکان ئەگەر چێشتێکی بە جۆرێکیان لێنا بانگیان ئەکەن چونکە لێرە ئەگەر نیسکێنەشمان دەستکەوێ ئەوە شاییە، لەبەر ئەوە کە ئەوان دێن ئەبێ جوان خۆت بپێچیتەوە و سەرپۆش بدەی بەسەرا و ئەوەندەش باسی سیاسەت نەکەی و خۆت لە هەموو ئیشێک هەڵنەقورتێنیت!"

سەبریش تورە ئەبوو ئەیگوت:" وەڵا باش ئیشالا دەممان ئەبەستیت؟ من سەربەستم و لەوەتەی چاویشم کردۆتەوە حیزبایەتیم هەر کردووەو لەناو ئەو هەموو پۆلیس و ئەمنەی شارا خۆم خستۆتە خەتەرەوە، ئێستە تۆ ئەتەوێ ببم بە کەیبانوی ماڵ و هەر خەریکی نانکردن و چێشتلێنانبم؟ هەی گیان بەخوا باش بڕوات بە مافی ئافرەتان هەیە؟؟" شیروان بە تەوسێکەوە وەڵامی ئەدایەوە:

"بەوا لە خەتەری گەورەدا خەباتت کردووە بۆیە تورەکەکەت پڕ نەئەکرد لە بایاننامە و بڵاوکراوەی پڕ مەترسی و نەتئەدایە دەس ڕوناکی بەسەزمان بۆت بڵاوکاتەوە بەسەر ئەندام و لایەنگرەکانی پارتیدا بەبیٚ ئەوەی بەبیرتا بێت کە ئەگەر ڕۆژێک پۆلیس گرتی ئەوا پێستی ئەچیٚ بۆ دەباخانە،" شیروان دەرگای ئەدا بەیەکا و ئەڕۆیشتەوە بۆ بارەگا بیٚ ئەوەی گویٚ لە وەڵام و بۆڵە و خوتە و ناڕەزایی سەبری بگرێت، کەتا بەینێکیش پاش ڕۆینی ئەو بەسەراهاتن و ئاو بەئاگرداکردنی دایکی و ئەوانیش، هەر لەسەر قسەی خۆی ئەڕۆیشت، بەڵام ئێوارە کە شیروان ئەهاتەوە زۆر بە ڕوخۆشییەوە سەیری یەکتریان ئەکرد و ئەتگوت نەبایان دیوە و نا باران!

***

وردە وردە وا بە ژیانی ئەویٚ ڕاهاتنئەتگوت سەد ساڵە لەویٚ ئەژین، نەک هەر ئەمە بگرە پێشیان خۆشبووبەتایبەتی چونکە کوڕەکانیشیان لەوێبوون و ترسی گرتنیان لەسەر نەمابوو، ئەوانیش هەستیان بە ئارامی و دڵنیایی ئەکرد، ئەگەرچی زوو زوو حەپسەخان و خوشکی ئەکەوتنە مەراقی مێردەکانیان بەتایبەتی هی باوکی عەلی کە نەخۆشی دڵی هەبوو، ئاخری حەپسەخان ڕۆژیٚ پەتی پچڕی و گوتی: منالینە بەخوا من ئەچمەوە سەرێک لەو پیرەمێدە ئەدەمەوە بزانمحاڵ و ئەحواڵی چۆنە، مەراقی ئەو خەریکە بە تەواوەتی ناڕەحەتم ئەکات، ڕوناکیش ئەبەمەوە لەگەڵ خۆم"

عەلی کەزانی دایکی گەیشتوەتە تینی و سورە لەسەر ڕۆین، چاری نەما کە لە بارەی ڕوناکەوە ڕاستی پێبلیٚ بۆیە گوتی: "دایە گیان خۆت ئەڕۆی خوات لەگەڵ بەڵام نابیٚ ڕوناک بەریتەوە چونکە ئەمری گرتنی دەرچووە، یەکیٚ لە گیراوەکان بەرگەی لێدان و ئازاری نەگرتووە و ناوی هەندیٚ کەسی چالاکی سەر بە پارتی گوتووە، ڕوناکیش یەکێکە لەوانە کە گوایە بەیانامەی بۆ بردووە "

حەپسەخان کەوتە هاوار و گریان و ئەیگوت: هەی لەڕێی خوا بۆچی ئەم کچە بەستەزمانەتان لە ئێستەوە توشکرد؟ هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمی دێت!!؟.

عەلی لە دڵی خۆیا ئەیگوت: ئەی ئەگەر ئەتزانی کە ماڵەکەشمان گەڕاون و باوکیشمیان دوو ڕۆژە گرتووەو ئەمری گرتنی سەبریش دەرچووە ئەوسا چی ئەکەی؟ دەی هەرچۆنێبیٚ نابیٚ لێرە ئەوانە بزانیٚ ئەگینا ئەیکا بە شین و شەپۆڕ

و هەموو خەڵکەکەمان بەسەرا دائەبارێنی، با بڕواتەوە شار لەوێ چی ئەکا با بیکا".

حەپسەخان لەبەر ڕوناک ماوەی دوو هەفتەیەی مایەوە کە هەمیشە خەریکی شەڕ و دەمەقاڵێ بوو لەگەڵ منالّکانی و ئەوانیش هەموویان سەریان کردبووە سەر سبری کە بۆچی ئەو ئیشە پڕ مەترسیانەی بەو منالّە کردووە کە ئەبوو هەمووی خۆی بیکا، ڕوناکیش سەری خۆی کز ئەکرد و لە دڵی خۆیا ئەیگوت: ئای قوڕ بەسەرم ئەگەر بزانن چ فەرتەنەیەکم ناوەتەوە و چۆن سەری عەسکەرم شکانووەو چەند بێگوناهم لەو ڕووەوە توش کردوەو چۆن چومەتە ئەو کۆلانە چۆڵانە و بەیننامەو کاغەزم بردووە بۆ ئەو کوڕە هەرزەکارانە، بەخوا هەر سەری سەبری نا هی منیش ئەتاشن ئەگەرچی من گوناهیشم نەبوو چونکە نەمئەوێرا بڵێم ناچم"

***

حەپسەخان کە زانی مانەوە هیچ دادێک نادا بڕیاریدا کە بە تەنیا بگەڕێتەوە شار. کوڕەکانیش ولاخیان بۆ بەکرێگرت لەگەڵ دایکی و دو پێشمەرگەی تر کە هاتبوون بۆ سەردانی کوڕەکانیان بڕوا.

حەپسەخان وەک مەرکانە و کوپەی بێسەروبنی لێهاتبوو ئەوەندە لە ترسی سەرمای ڕێگا و لەبەر ئامۆژگاری تۆفە و خوشکی، خۆیی پێچابوەوە.

لە بەڕێکردنا ئامە خان ئەوەندە شپرزەبوو ئەتگوت خوشکی ئەچێ بۆ سەفەری قەندەهار! بە پەرۆشەوە پێی ئەگوت بڕۆ خواتلەگەڵ، دڵت لای کەس نەبێ. دو هەنگاو ئەچوە ژورەوەو لەپڕ ئەگەڕایەوەو هاواری ئەکردێ:" وەکیلی سەلامبە.. بیرت نەچێ کەواکان لە جانتا سورەکەی بەردەرکی گەنجینەکەدان: (ئەیویست قسەی تر بکات تۆفە هەڵیدایە و گوتی: ئەشهەدو ئەنلائیلاهە ئیلەلا.. خوایە تۆبە ئەمە یەک هەفتەیە، ئەم مالّە تەگبیر ئەکەن و کاغەز ڕەش ئەکەنەوە کە چی بێنێت و چی نەیەنێت کەچی ئێستەش ئەوەتا خانم باسی کەوای ناو جانتا سور ئەکات؟؟ وەلا لە شەوێوە بیستجار زیاتر باسی ئەو جانتاو کەوایەیان کردووە.. دەبەسە خوشکم بیبڕنەوە! " ئامە خان خەریکی دوعا خوێندن بوو بۆیە تا لێنەبوەوە فوی بە دوای خوشکیا نەکردوو جوابی نەدایەوە، ئەوسا ئاوڕێکی لێدایەوە و وتی: ئەی تۆ بۆ بەشەو و بە ڕۆژ هەسانات کردبوو بیرت

ئەخستەوە کە قەمسەڵە هەمانەکەت بۆ بهێنێت؟؟" سەبری لەولاوە هەڵیدایە و گوتی: بەو حسابە ئەبێت لۆرییەک شتتان بۆ بهێنێت؟ پاش ئێستێک بە زەردەخەنەیەکی تەوساویەوە قسەکەی تەواوکرد: ئەڵێی ئاگاتان لە دنیا نەماوە؟ بیرتان چۆتەوە چۆن ئەو هەموو شتەی بۆ دەرئەچێت؟ خەڵک خوا خوایەتی خۆی دەربازکات لەناو ئەو هەموو(ڕەبیە) عەسکەرانەوە.

بێستونیش کەهاتبوو بەبیانووی بەڕێکردنی پورە حەپسەخانییەوە چاوێکی بە دیتنی ڕوناک ڕوون بکاتەوە. لەبەر دەرگا لەگەڵ کوڕەکان ڕاوەستابوو مات و مەلوول سەری دنیای لێهاتبوەوە یەک، پاڵی دابوو بە دیوارەکەوە، چونکە ئاگای لە بەزمی ناوهاتن و ئەمر دەرچونی گرتنی ڕوناک نەبوو هەر خەیاڵ ئەیبرد و ئەیهێنا. کەدی حەپسەخان بە تەنیا کەوتە رێ زۆر شڵەژاو دڵی داخورپا و سەرێکی بادا و لە دڵی خۆیا گوتی: ئەوە چی بوو؟ لەمن وابوو کە ڕووناک لە ژورەوە بەری نادەن کە بێ سواربێت هەقیشم دابونێ، چونکە چ گەوجێک هەیە ئێسک سوک و نازدارێکی وا بەرەڵا بکات تا تێر تێر ماچی نەکات با خوشک و کەس و کاریشی بن..؟ حسەین لە گیر و گرفتی دڵ و مێشکی ڕزگاری کرد کە پێگوت: کاکە نافەرمووی چاییەک بخۆینەوە خۆ جارێ هیچ کارێکی وا پەلەمان نییە؟ بێستون نیوە داچڵەکینێ داچڵەکی و گورج گوتی: باشە کاکە گیان زۆر سوپاس، ئەوەی ڕاس بێ زۆر خەمی پورە حەپسەخانمە، هەواکەی زۆر ساردە و لەوانەشە ببارێت" حسەین بەدەم ڕۆینە ژورەوە گوتی: بڵێم چی بەقسەی کێ دەکا؟ هەموو پێمان وت کە ئیمڕۆ نەڕوا وتی هەموو ڕۆژەکان هەر ساردن"

کە دانیشتن بێستون ئیتر ماتەمینییەکەی نەما و بە گەرمییەوە کەوتە قسەکردن. هێشتا چاییەکەی لەبەردەما بوو کە نەورۆز و شیروانیش هاتن، نەورۆز ڕوی کردە بێستون بە پێکەنینەوە گوتی ئەوە چییە ئەڵێی دنیا گۆڕاوە؟

چەند ڕۆژ بوو هەموو جنۆکەی دنیا دەوریان دابوی، ئەوە چۆنە ئێستە پێئەکەنی!؟ "(بێگومان نەیانئەزانی بۆچی مات بوەو ئێستەش بۆچ دڵخۆشە) شیروان بەدەم پۆتین داکەندنەوە گوتی: لام وایە لە مامە حاجی باوکییەوە فێربوە لە دڵی خۆیا دینارەکانی ئەژمێرێت، دەستکەوت و زەرەر لێک دەرەکا بۆیە وا ئەچێتە ژێری. هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین، تۆفەش هات بەسەر قسەکەدا و بەگەرمی و شەوقێکەوە لەسەر بێستونی کردەوە و دەستی بە ملیا

هێناو گوتی: حەیف نییە وا بە کاک بێستون ئەڵێن ئەو کەی هەر بیر لە پارە ئەکاتەوە؟ ماشاڵا پیاوە پیاو! دەستی برد پاکەتێ جگەرەی دەرهێنا  کە ڕۆژێ لەوەوبەر " کـاکە بێسـتونی گڵۆسـێکی بـۆ کڕیبـوو، جـگە لەوە کە هەر بەوەدا ئەگەیشت لایت و تەزبیح و دیارییەکی بداتێ ئیتر چۆن لەسەری ناکاتەوە؟)

بێستون گەڕایەوە ماڵی خۆیان و چوو دەستی کردە ملی دایکی و ماچی کرد و بەخۆشییەوە چوو بۆ لای براو خوشکەکانی، دایکی سەری سوڕما و لە دڵی خۆیا گوتی: ئەوە چی بوەو چی قەوماوە؟ خۆ هێشتا وردە شوشەکەمان بۆ کۆنەکراوەتەوە کە بەیانی لە تەڕەیدا شەقی لە سەبەتەی پیاڵەکان هەڵدابوو " واهات بەبیریا کە ئەبێت لە کردەوە نابەجێکەی خۆی پەشیمان بوبێتەوە و بۆیە چوو برا بچکۆلەکەشی ماچ کرد کە بەیانی بێ هیچ گوناهێ دابوویە بەر زللە؟

***

حەپسەخان گەیشتەوە سلێمانی، حاجی مێردی و شوبراو دشەکەی دەوریانداو کەوتنە پرسیارلێکردنی لەبارەی باری ژیانی ڕابواردنو چۆنی و چاکی مناڵەکانی و خۆیانو ئەو خەڵکەوە کە لە ماوەت کۆبونەتەوە.. ئەویش هەر لەو کاتەوە کە سلێمانیان بەجێهێشتبوو، هەتا هاتنەوە هەموو شتێکی بەڕاستی و دروستی بۆ گێڕانەوە و بەنەختێ ترش و خوێشەوە بۆ حاڵی خەڵکەکە و مناڵەکانیشیان گوتی کەوا هەموو بوون بە پێشمەرگە و بێباک و سەربەرز بە دڵخۆشییەوە خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ نەهێستنی ئەم زوڵم و زۆرە و خوشکی کچەکان و خەڵکەکەش کە ئەو چەکدارانە ئەبینن لە خۆشیانا گەز گەز باڵا ئەکەن. حەپسەخان دیسانەوە کەوتە پەناو پاسارپشکنینی ماڵی خۆیان و خوشکی گەیشتە پریاسکە خشڵەکانی خۆی و خوشکی و کچەکەی. لەگەڵ حاجی بو بە مشتو مڕیان کە ئایا بیانباتە شاخ باشترە یا لەوێبن لای ئەوان؟ حاجی ئەیوت ئێرە ئەمینتر و شوێنیان قایمەو لەهەردووکیان زیاتر کەس پێنازانێ و بردنی بۆ شاخ پڕە لە مەترسی جگە لەوەی کە گرتیان نەک هەر خشڵەکانیان لەدەست ئەچی، خۆشی توش ئەبێت و ئەشبێت بە سینەما بۆ خەڵکی شار "ئەویش ئەیگوت: لای من ڕێگاکەی لێدەرچی ئەوێ ئەمینترە ترسی گەڕان و پشکنینی پۆلیس و عەسکەری نییە. ئەڵێم نەوەک و وەک و ئەو ماڵەمان لێبکەن کە

چوبوون بۆ پشکنینی ماڵەکە بۆ بەیاننامەو کتێب و شتیوا، کەچی ملە لیرەی کچە کڵۆڵەکەیانیان دزیبوو بە پە پارەی کڵاو دروون و لفکە چنین کڕیبووی.
مێردەکەشی نەختێ بە توندی گوتی: کچی ئاخر ئەو کەرانە خستبویانە جانتاکەیەوە و لەژووری دانیشتنا دایاننابوو، کێ ئەقڵی پێ ئەشکێ و بۆ ئەوە ئەچی ئەو تاقە بڕوخێنێ کە سەماوەر و کاشیت لەسەر داناوەو صشتەکانی لابات بۆ ئەوەی خشڵەکانمان بدزێت؟؟
حەپسەخان سەیرێکی ئەملاو ئەولای کرد و بە ئەسپایی گوتی: ئاخر دار و دیوار گوێی هەیە بۆچی وا دەنگ بەرز ئەکەیتەوە؟
حاجی بە تووڕەییەوە گوتی: ئینجا کرا دەنگم بەرزکردۆتەوە! لەپاشا کوا بێگانەی لێیە؟ "حەپسەخان بێدەنگ بوو، چونکە ئەیزانی کەوا ئەوە چەند ڕۆژێکە مێردەکەی وەک و شتێک شەڕی پێئەفرۆشێ سەبارەت بەوەی لە قوڵایی دڵیا حەزی نەئەکرد بگەڕێتەوە بۆ شاخ و چەند جارێکیش دابووی بە بەر گوێیا کەوا بێتاقەتە و پێویستی بە خمەتەو ئەیەوێت کە لە نزیکییەوە بێت" ئەمیش ئەیماڵی بە سنگی خۆیا و ئەیگوت: ئەیەڕۆ منداڵەکانم چۆن بەرەڵا بکەم؟ تۆش ئەوە خوشک و برا و خشکەزات، خوا لێت نەسێنن لەلاتن خوشکت لە من زیاتر بە تەنگتانەوەیەو ئاگای لە ماڵەکەیە ئیتر پیرەمێرد ئەم بیانووانەت لە چییە؟".
حاجیش ناچار ئەبوو کە ڕازی ببێت بە تایبەتی کە دڵی زۆر لای ڕوناک بوو هەزار خەیاڵی ئەهات بە مێشکا ئەگەرچی لای پور و براو خوشک و کەسی بوو، بەڵام هەر دڵی لایبوو. لەگەڵ ئەوەشا زۆر بە کەساسی سەیری ژنەکەی ئەکرد وپێیناخۆش بوو کە بەجێیبهێڵێت چونکە زۆری خۆشئەویست و ئەمە یەکەمجاربوو کە بۆ ماوەیەکی وا زۆر لێیدورکەوێتەوە. هەرچۆنێبوو حەپسەخان گەڕایەوە لای منداڵەکانی و چونکە بە ڕێگاوبانەکە ڕاهاتبوو هیچ نارەحەتییەکی هەستپێنەکرد، بەڵام هەر ئەو گەڕایەوە ئیتر ئامەی خوشکی کێچ چووە کەوڵی کە ئەویش بڕواتەوە، زۆری لەگەڵ خەریکبوو کەسەفەرەکەی نەختێ دواخات کەڵکی نەبوو بۆیە ئەویشیان بەڕێ کرد بەڵام ئەمجارە زۆر دڵنیا و دڵخۆشبوو کەوا ئەیبینی منالّکەانی ئەو کوڕە باشانەیان لێدەرچوەو ڕەنجی بەخەسار نەچوەو شانازییان پێوە ئەکات کە بوونە بە پێشمەرگەو لەسەر خاک و میلەتەکەیان ئەکەنەوەو ئێستە ئەچێتەوە باسیان ئەکات بۆ خزم

و دۆست ئەوەندەی تر سەری پێیان بەرز ئەبێتەوە و ئیتر بیری نەخۆشی و دەستەپاچەییشی هەر بە مێشکا نایەت چونکە بەچاوی خۆی بینی کەوا لە چاو زۆر لە هاوڕێکانیانا زۆر چالاک و لێهاتوون و بۆ نازداریش ئەو ناوە پڕە لە کوڕی خەڵک کە هەریەکەیان لای دایک و باوکی خۆیان تاڵە موویەکی سەریان هەموو دنیا ئەهێنێت و ئەوا ئەوانیش وەک منداڵەکانی ئەم چەک بەدەست ئامدەی بەرگرین.

***

٢٠

پاش ڕۆیشتنی ئامە خان بە هەفتەیەک، شیروان چێشتەنگاوێ هاتە ماڵەوە و هەر لەوێوە بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد: سەبری! ئەوە لە کوێی؟" حەپسەخان هاتە دەرێ بە دەنگیەوە و نەختێ بە شپرزەییەوە گوتی: چییە ئەوە شیروان گیان خێرە؟ بەو پەلە پەلە سەبریت بۆ چییە؟ ئاوەرە سەبری ئەوە تۆ لە کوێی؟ شیروان ڕوی کردە خەسووی و گوتی: نەقڵ بووم بۆ بنکەیەکی تر زۆر دوور نییە لێرەوە هەروا دو سەعاتێک ئەبێت" خەسووی گوتی: بۆچی لێرەش نەقڵ و شتیوا هەیە؟" ئەیچۆن خەسوو گیان؟ وچی تۆ وا ئەزانی هەموو پێشمەرگە هەر ئەمانەی ئێرەن؟ شکور زۆر زۆرین و گەلێک و شوێن و بنکەشمان هەیە"

- کەواتە ئەڕۆیت و سەبریش ئەبەی؟
- ئەی چۆن من بەتەنیا لەوێ چیبکەم؟ نانێکە ئاوێکە؟
- حەپسەخان بە نیوە تورەییەکەوە گوتی: ئینجا چی تیایە تۆش وەک و ئەو هەموو پێشمەرگانە، خۆ لەسەدا یەکێکیان ژن و ماڵیان لەگەڵ نییە، بەخوا سەبری نابەیت، سەبری چی ئەکا لەوێ بەتەنیا. خۆت بڕۆ، کەوا نزیکیشە زو زو سەمان لێبەرەوە.." لەم قسانەدا بوون سەبری گەیشت و گوێی لە قسەکانی دایکی بوو، لە دڵی خۆیا زۆری پێناخۆشبوو کە دایکی وای بە شیروان گوت، بەڵام ڕوی نەهات دەریبڕێ هەر ئەوەندەی پێکرا کە بڵێ: ئەیەڕۆ شیروان نەقڵی چی؟ دایکم ڕاست ئەکا جارێ تۆ بڕۆ خاویەک کولانەیەک پەیاکەو بزانە ڕێ و شوێنی چۆنە ئەوسا وەرە بەدواما، " ئینجا ڕوی کردە دایکیشی و گوتی: بەخوا دایە خۆگۆڕینێکیشە بۆ هەموومان ئێوە سەرمان بدەن و ئێمە سەرتان ئەدەین، ناخۆشە وا هەریەک لە شوێن خەریکە تاقەتمان ئەچێت. "دایکی بە ساردییەکەوە گوتی باشە کچم خۆتان چۆنتان پێخۆشە وابکەن!

***

یەکەم مانگی زستان بوو، هەورەتریشقە و ڕەشەباو زریان هەمیشە زرموهوڕیانبوو، لە درزی دەرگاو پەنجەرەوە و دیوارو لەوحە تەنەکە و دەڕابە شکاوەکانەوە دەنگیان وەک فیکە و لورەو هەلهەلە ئەهات!! درەختەکان ڕوت و داماڵراو و داماو و بێدەسەڵات سەریان شۆرکردبوەوە بۆ شەکان شەکانی

ڕەشەبا، گەڵاکانیشیان سیس لە ژێریانا کەوتبوون با بە ئارەزوی خۆی بەملاو ئەولادا ئەیهێنان و ئەیبردن..

لەم کاتانەشا ئەوە هەر بارەدار و قەل و مریشک و گوێز و مێوژ و باسوق و سجوق بوولە ماڵی بێستونەوە ئەهات بۆ ماڵی حەپسەخان بەبیانووی ئەوەوە کە لە سلێمانی زۆر نانی ئەوانی خواردوەو زۆر نمەکی کردوون! ئەم کارەی بێستون بەتەواوی باوکی شڵەژاند نەیئەزانی چی بکا بەرامبەر بەم دەسبڵاوییەی کەوتبوە بۆڵە بۆڵ لای ژنەکەی. ئەویش هەر زو بێدەنگی ئەکرد کە پێیئەگوت: بۆ خاتری خوا قسەی وات لە دەم دەنەچێت و بەر گوێی کورەکەت نەکەوێت.. بەو خوایە هەر سوسە بکا وات گوتووە یا سەری خۆی هەڵەگرێ و ئیتر چاومان پێیناکەوێتەوە، یا کەتنێک ئەکات کە هەتا ماوین پەنجەی پەشیمانی بگەزین و نان و فرمێسک بخۆین!! ماڵەکە خزمەتیان کردووە و چەکەیان بەسەریەوە هەیە وا ئێستە ماڵ و حاڵیان بەجێهێشتوەو هاتونەتە ئەم کەژ و کێوە و لای ماڵی باوکی ئیتر چۆن ئەبێ پشتیان تێکات؟ و گوێیان نەداتێ؟" مێردەکەشی چاری نەئەما لە ترسی کوڕەکەی بێدەنگ ئەبوو!

بێستون وردە وردە خۆی خۆشەویست کردبوو لای حەپسەخان و ئەهلی ماڵەکەی، هەروەها ڕوناکیش کەوتبووە پێکەنین بە نوکتەو قسە خۆشەکانی، خۆ تۆفە ئەوە بە جارێ هەر بوو بوو بە ئەوقات و پارێزەری و سەری پێوەنەبوو لە عاستی چونکە هێندە دیاری و شتی ئەدایە، وەعدی دەمانچەیەکیشی دابوویە کە بەم زوانە بۆی پەیدا بکات، بۆیە ئیتر هەر بە شان و باهویا هەڵیئەدا. بێجگە لەمانە بێستون خۆشی کوڕێکی قۆزی کەڵەگەتی چوارشانەی بە حورمەت و خۆشەویستەنی و گاڵتەچی و قسەخۆشبوو و لەناو هاوڕێکانیا زۆر دیار و بەناوبانگ بوو.

***

نزیک نیوەڕۆیەک حسێن کردی بەماڵا، دایکی خەریکی چێشتلێنان بوو نەسرین جلی ئەشت و ڕوناکیش خەریکی گەسکدان بوو، ئەویش ڕوی کردە لای دایکی سڵاوی کردو گوتی: حەپسەخان ئەوە چیت بۆ لێناوین؟ "بێئەوەی کە ماوەی دایکی بدا جوابیبداتەوە گوتی: ئەزانی کە ئەبێ سبەینێ بەیانی زوو نان و چاو ڕایەخ و هەندێ شت بەرن و بچنە ئەو شیوەی تەنیشتمانەوە وەک و نیوە

سەیرانێک! "دایکی کەوگیرەکەی دەستی خستە ناو قاپێکەوەو بە سەرسوڕمانەوە گوتی: سەیران و نیوە سەیرانی چی ڕۆڵە؟ چیتە ئەوە وڕێنە ئەکەی؟" حسەین تۆزێ خۆی گورج کردەوەو گوتی: نەبەخوا بەڕاستمەو گاڵتە ناکەم!.
نەسرین لەولاوە قیژانی: چی چی؟ بەخوا هەر سەیرانمان کەمە! بەم تۆف و سەرمایە خەڵک لە ژورەوە جێبەخۆی ناگرێ.
حسەین هەستاو چوو لە تەنیشتیەوە بە چیچکانەوە دانیشت و بە پێکەنینێکی لەسەرخۆوە گوتی: دە بەخوا ئەبێ بەیانی ئەم سەیرانە بکەن ئیتر تۆف بێت و هەرچییەک بێت ئەوە ئەملاو ئەولای ناوێت!!"
نەسرین بە توڕەیی دەستە سابووناوییەکەی داتەکاند و لەگەڵ دایکی هەستان بۆی، بە جوتە ڕوی دەمیان تێکرد: چییە؟؟ بۆچی ئێمە منالین گاڵتەمان پێئەکەی؟ سەیرانی چی؟ سەیران بەزۆر ئەکرێت؟ لەپاشا کەی ئێستە وەختی سەیرانە؟؟" حسەین بە دەمێکی تێکەڵ و پێکەل گوتی: ڕاستان ئەوێ سبەینێ لەوانەیە حکەمەت ماوەت و ئەم ناوە بۆردومانکاو لە مەکتەبی سیاسییەوە ئەمر دەرچووە کە بەیانی زوو ئەبێ هەمووماڵەکان چۆڵکرێن و ژن و منال و خەڵکی لەناو دێدا نەمێنن هەمو بچن بۆ ناو شیوو پەنا بەردو ئەو کەژ و کێوەو هەتا دنیا تاریک ئەبێ نەگەڕێنەوە، و پێشمەرگە هەموو لە ئێنزاران بۆیە ئیمشەو تەنیا بەختیار یەتەوە ماڵێ و بەیانیش تۆفەتان لەگەڵ ئەبێ. ئەڵێن لە ئەزمڕ شەڕێکی قورسە ئێستا.
بەم قسانە هەموو دڵیان داخورپاو سست بوون و ڕوناک گسکەکەی فڕێداو چاوی زەو بوو. حسەینیش شڵەژاو لە دڵی خۆیا زۆر پەشیمانبوو لەوەی کەوا بێ پێچ و پەنا هەموو شتێکی پێگوتن بۆیە دەستێکی هەڵگلۆفت و کەدی دایکی وا زۆر تێکچووە گوتی: ئای دایە گیان ئینجا ئەوەی بۆچییە؟ خۆ هەر ئێمە نین، با تەیارەش بێت ئەتوانێ چی بکات تا ئێستا چەندەها جار هاتووە لەناو ئەم کەژوو کێوەدا چی پێ ئەکرێت؟" دایکی بە بێزارییەکەوە گوتی: تۆش هەر بتوانە بڵێ "خۆ هەر ئێمە نین، خۆ هەر ئێمە نین" لەشاریش هەر واتان ئەگوت.. بەخوا ئەمە زۆر خۆشە سلێمانیمان بەجێهێشت وتمان قەیناکا، کەوتینە ئەم شاخ و کێو و بەفر و سەرما و سۆڵەیەش، ڕەزاین بە ڕەزای خوا وا دیارە ئینجا نۆرەی تەیارەیە!

ئەی چۆن دایە گیان ئەمانەوێ ماسی بگرین و قولەپێمان تەڕنەبێت، ئەی تاک و خەڵک ئەزیەت نەبینێت و ماڵ کاول و دەربەدەری نەچێژێت و قوربانی نەدات چۆن میللەت بە ئاواتی خۆی ئەگات؟؟ ئێمە داوای هەقی داگیرکراوی خۆمان ئەکەینئەبــێ بە زۆر و بە زەبـــری چەک و بە فیـــداکاری لە دوژمنەکانمـــانی بستێنینەوە.. ئەوەتا چەند ساڵە کورد وا دانیشتووە بزانە هیچمان دەستکەوت؟ ئێستەش ئەمە شەڕەو شەڕیش هەر وا ئەبێت و هەقیش هەر وا ئەسەنرێتەوە، ئەی هەروا بە ئاسانی هەقەکەمان بۆ ئەخەنە سەر سینی زیو ئەڵێن ها فەرمون برا کوردەکانمان؟ بەتایبەتی ئەم حکومەتە زۆردار و پیاوکوژ و ڕەگەزپەرستانە کە بە فیڵیش زات ناکەن دان بە هەقەکەمانا بنێن نەخوزەڵا بە ڕاستی بۆیە ناچارین کە بە زەبری چەک پێیان بسەلمێنین.."

حەپسەخان تاقەتی ئەم قسانەی نەبوو بۆیە بێزارانە گوتی: "بیکە لە ڕێی خودا دەستم داوێنت بەس ئەم وەعز و نەسیحەتانەمان بۆ بڵێرەوە، گوێچکەمان پڕ بووە، ئەوەتەی گوێچکەم ڕواوە من هەر ئەم قسانە ئەبیستم. تۆ جارێ پێم بڵێ کە قوڕی کوێ بکەم بەسەری خۆما و ڕوبکەمە کوێ؟"

حسەین زانی قسەکردن لەگەڵ دایکی بێسودە، بە زەردەخەنەیەکەوە ڕوی کردە نەسرین و گوتی: ها بیرم چوو کە پێتان بڵێم نابێ جل و شتی واش هەڵخەن لە حەوشەو، شتی سپی و تەنەکەو مەنەکەش نابێ لەو ناوانە بێت؟" حەپسەخانیس هەر دەستی ئەدا بەیەکاو ئەیگوت: ئەیەڕۆ شیوی چیو قوڕبەسەری چی؟.."

(لێرەدا درا لە دەرگاو حسەین چوو بە لۆقێ کردییەوەو بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئۆە کاکە بێستون.. یاخوا بەخێربێیت فەرموو ژورەوە!"

هاتنە ژورێ، دوای سڵاو و بەخێرهاتن حسەین پێکەنی و گوتی: کاکە ئەوە دایکم تورە بووە کە سبەینێ تەیارە یەتە سەرمان.. "بێستون بە پەرۆشەوە گوتی: خۆ منیش ئەوی ڕاست بێ بۆ ئەوە هاتوم بە پورە حەپسەخان و مناڵەکان بڵێم کە ئێمە کونە تەیارەی زۆر باشمان هەیە و ئەمین و قایمە ئەشکەوتێکی گەورەیە لە پێشا ئەلیکی ئاژەڵی تیابوو بەڵام ئەوەتەی شەڕ دەتی پێکردە باوکم وای لێکردووە ئەڵێی خانووە بەڕە و فەرش و نوێنی زۆری تیا داناوە و دوریش نییە هەر وا بەقەد شاخەکەی تەنیشت دەرگاکەمانەوە. (حسین هەر زو قسەکەی قۆستەوە و گوتی:

ئەرێ بەخوا، بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر باشبوو زۆر سوپاس برا گیان!ماڵتان ئابێت لە شیو و پەنابەرد ڕزگاربوون." بێستون بەشەرمێکەوە گوتی: ئینجا کاکە حسەین ئەوە سوپاس ئەهێنێت؟ ئێمەو ئێوە فەرقمان چییە؟ خەمی هیچ شتێکتان نەبێ تەگبیری ڕێو شوێنی هەموتانمان کردووە باوکم زۆر وردە بۆ ئەو ئیشانە" ئینجا سەیرێکی حەپسەخانی کورد و گوتی: حەزەکەن لە ئیمڕۆوە فەرمونە ئەوێ، بۆچی بەیانی بەو پەلە پەلەو بەو سەرمایە خەو و ئیسراحەت لە خۆتان تێک بدەن؟"

حسەین گوتی: نە کاکە با بەیانی بێن باشترە.. دایکی بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەی حسەین گوتی: وەڵا هەر ئێستە ئەڕۆین، دەی کچینە خۆتان کۆکەنەوە!؟ نەسرین پەلاماری جلی ناو تەشتەکەی داو ئاوێکی پیاکردو لە ژورەوە تەنافی بۆ هەڵخست، و کەوتە خۆکۆکردنەوە. بێستونیش لە خۆشی ئەوەی کە شەوێ ڕوناک لەگەڵ دایکی و نەسرین لای ئەوان ئەنوێت وەختە بوو باڵ بگرێت و لەوانەبوو دوعا بۆ بۆردومان بکا، لەگەڵ ئەوەشا چونکە کوڕێکی زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوو کەس هەست و بۆنی هیچی لێنەئەکرد.

بەیانی شەوەکەی دایکی بێستون ڕاپەڕی، حەپسەخان و ئەوانیتر و منداڵەکانی، کە لە ژمارە نەئەهاتن، هەموویانی خەبەر کردەوە و چونە ناو ئەشکەوتەکە، نوێن و پەتوی گەرم و گوڕی لێبوو هەموو منداڵەکان لاڵ و پاڵ لێی کەوتنو بۆخۆیان نوستنەوە، بەڵام گەورەکان کە لە ترسی تەیارە چاویان بە حەوت ئاو شۆرابوەوە، زیت و قیت دانیشتن، دایکی بێستو خەریکی چالێنان بوو کە هەر شەوێ سەماوەر و تفاقی بۆ ئامادەکردبوو، لەگەڵ ئەوەشا ماڵەکەیان هەمووی چەند هەنگاوێک دووربوو، زوو چا پێگەیی و کەوتنە بەرچایی کردن و بەدەم ئەوەشەوە حەپسەخان و ئەوان مەتحی خۆشی جێگەکەیان و سەلیقەی ماڵەکەیان ئەکرد دایکی بێستوون ڕیزێکی تر چای بۆ تێکردنەوە و گوتی: کێ ئەڵێت ئەمجارەش وەک جاران نابێ چونکە زۆر جار وایان گوتووەو هاتووین وەک و ئێستە خۆمان شاردۆتەوە کەچی نە تەیارە هاتووە و نە هیچ! "حەپسەخان پێکەنی و چایەکەی لە دەس وەرگرت و گوتی: هانام کردە دەمت! نوخشەبێ لەمجارەش! هێشتا پیاڵە چایەکەی نیوە نەبوبو کە لە باخەکەی بەردەمیانەوە یەکێ قیڕانی گوتی: "خەڵکینە تەیارە هات خۆتان مەڵاسکەن؟ دوو سێ جار ئەمەی گوتەوە. حەپسەخان زۆر شڵەژاو ڕوناک پەلامادریداو خۆی پێوەنوسان، نەسرین دەمی بەسترا بەڵآم دایکی بێستون ئەوەندە تێکنەچوبوو کەوتە دڵدانەوەیان و گوتی: مەترسن مەشڵەژێن بەوخوایە ئەوەندە بە بەرزی دێن و بۆمباکە ئەهاون لە سایەی خواوە تا ئێستا بۆمبایەکیان بەر ئەو شوێنە نەکەوتووە کە بۆی ئەهاوێژن! "هێشتا قسەکەی لە دەما بوو کە تەیارە گەیشت و زرمەی لەوناوە هەستاند و بەجارێک دارو بەردی هێنایە لەرزین، لە ناو شاخ و لێوەدا دەنگی ئەدایەوە و ئەتگوت شاخەکان جوابی ئەدەنەوە و ناڕەزایی و بێزاری خۆیان دەرئەبڕن لەو کردارە دڕندانە و نائینسانیانەیان! هەرچەندە گرمە ئەهات حەپسەخان ئەیکێشا بە خۆیاو ئەیگوت: "یا ڕەسولەڵا هاوار! وەی دایکتان بمرێ بەخوا ئەمەیان زۆر نزیکبوو، گوێی شەیتان کەڕبێ بە (مقەڕە) نەکەوتبێ! هەی هاوار ئینجا چیبکەم؟ "دایکی بێستونیش هەرچەندە ئەیویست خۆی بێترس نیشانبدات بەڵام لەگەڵ هەموو گرمەیەکا "وەی دایکت بمرێ"یەکێ لە دەم دەرەچوو. منداڵان بە گریان و زریک و هوڕ خەبەریان بوەوە، هی وایان هەبوو

نەئەگریا بەڵام هەردوو گوێچکەی گرتبوو و خۆی خزاندبوە پەنا نوێنەکانەوە. هەرچۆنێک بوو لای گەورەو بچوکیان بەیانییەکی بەسام و ناخۆشبوو.
تەیارەکان چەند جار بەسەر ناوچەکەدا سوڕانەوە دوایی دەنگیان نەما. هەموو ڕەنگ هەڵبزڕکاو بە پەرۆشەوە خۆیان گەیاندە بەر دەرکی ئەشکەوتەکە، حەپسەخان دوو سێ جار سەری کێشایە دواوە و سەیرێکی ئاسمان و بەردەمی ئەشکەوتەکەی کرد و هاتەوە ژورێ ئەوەندەی پێنەچوو تۆفە بە هەڵەداوان گەیشتە لایان و گوتی: شکور هەموو سەلامەتن هەر مەراقی ئێوەمان بووئەمانگوت ئاخۆ لە چ حاڵێکدان" تۆفە لەم قسانەدا بوو بێستون و حسەینیش هاتن و هەریەکەیان شتێکی باس ئەکرد لەبەرەی ڕوداوەکەوە بەڵام بێستوون کە هەموو خەیاڵی لای ڕوناک بوو، بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵی حەپسەخانەوە و نەگەڕێنەوە ماڵی خۆیان گوتی: ئێستەش بە دوری نازانم کە جارێکیتر بگەڕێنەوە سەرمان! چونکە هەندێک جار بۆ فێڵ بۆ ماوەیەک دور ئەکەونەوە تاکو خەڵکەکە دڵنیائەبنەوە و ئەگەڕێنەوە جێ و شوێنی خۆیان ئەوسا لەپڕ دێنەوە سەریان!" ئەو لە قسەکەی بوەوە و حەپسەخان گوتی: بەخوا کەواتە ئەبێ ئیمشەویش لێرەبین، ئەگەرچی داخم ناچێ ئەبین بە ئەرک بۆ دایکی بێستون گیانیش!" دایکی بێستون لەولاوە هاتە قسەو گوتی: تخوا وا مەڵێ حەپسەخان گیان ئێمە سەرمان پێیبەرز ئەبێتەوە، لە پاشا ئێمە هیچ شتێکی تایبەتیشمان بۆ ئێوە نەکردووە، ئێوە لێرەبن و لێرە نەبن ئێمە ماشەڵا بەم کۆمەڵە مناڵەوە هەر ئەبێ شتێ بخۆین، ئێوەش خۆتان خاوەن ماڵن.." بێستون ئەم قسانەی دایکی زۆر پێخۆشبوو. ئیتر ئەو شەوەش حەپسەخان و ئەوان مانەوە.. بەیانی کاتێ بیریان لە گەڕانەوە ئەکردەوە تەیارە هاتەوە سەریان و چینێکیکەش ئەوناوەی گولەباران و بۆردومان کرد و دیسان ونبونەوە.
لەگەڵ ئەوەشا کە بۆردومانی ئەمجارە زۆر لەناکاو چاوەڕوان نەکراوبوو بەڵام زیانی یەکجار کەم بوو: تەنیا پیرەمێردێکی پەکەوتوو کە ویستبووی ڕابکاتە ناو شیوەکەوە و فریا نەکەوتبوو پارچە بۆمبێک بەر سەری کەوتبوو بێتاوان شەهید کرابوو، لەگەڵ دوو سێ سەر ئاژەڵ کە گوللەی شەستیریان بەرکەوتبوو ئەوانیش کوژرابوون. جگە لەمانە لەگەڵ دڕندانەیی هێرشی فڕۆکەکانیشا خوێن لە لوتی یەکێکی تر نەهاتبوو!

ڕونــاک کە لای دایکیــیەوە بێــدەنگ دانیشــتبوو گــوێی لە باســی کەمزیــانی بۆردومانەکـانی حکـومەت بـوو زۆری پێخۆشـبوو هەسـتاو لە پەنـجەرەکەوە سەیرێکی دەوروپشتی ماوەت و دێهاتەکانی ئەو ناوەیکرد کە بە جوانی لێوەی دیاربوون ورەی هاتەوە بەر و لە دڵیخۆیا گوتی: ئەی بە قوربانیخوابم کە ئەم وڵاتەی داوە بە کورد خۆ ئەڵێی ئەو شاخ و کێوە سەختانەی بۆ پاراستنی ئێمە دروستکردووە! بەو خوایە ئەگەر کوردستان دەشتان و بێکەژ و کێو و ڕووت بوایە ئێستە دەمێکبوو دوژمنەکانمان لەناویان بردبووین!"

حەپسەخان دوای ئەوەی کە دڵنیابوو کە کوڕەکانی و هاوڕێکانیان سەلامەتن بە پەرۆشەوە ئەیپرسی: "ئەرێ بەقوربانتانبم ئەوە دێیەکەی سەبری لێیە حاڵیان چۆنە؟ نازانم چی بکەم؟ چۆن خەبەریان بزانم؟! "دەستی ئەدا بەیەکاو ئەیگوت: ئەی نەگبەت ڕەنگە ئێستە شیروانیش لەوێ نەبێت ئینجا ئەبێت ئەو کڵۆڵە حاڵی چیبێت، بەوخوایە هەر تۆقیوە!"

بێســتوون دەســتی دا بە ســنگیاو گــوتی: لە مەراقــی ســەبری خــان و کــاکە شیرواندای؟ هەر ئێستە یەکێ ئەنێرم کاغەزی دەسخەتی خۆیانت بۆ بهێنێت بۆ ئەوەی ئیتـر دڵـت هـیچ نەکـا! حەپســەخان گەلــێ دوعـای خێـری بـۆ کـردو بە خۆشییەوە گوتی: بەڕاستی لە دوێنێوە ئارامم نییە ئەوەندە لە مەراقام بۆیـان! ئۆە ڕۆڵە خوا دەست بە عەمرت بگرێ و ناخۆشـی نەبینیت چنکە ئەوەنـدە بە تەنگ دڵی خەڵکەوەی!! "ئیتر بێستون وا خۆی بردە پێشەوەو چووە دڵیانەوە کە ئەگەر تاقە ڕۆژێک دەرنەکەوتایە هەموو تاقەتیان بۆی ئەچوو و ئەکەوتنە باسی ئەوەندە بیریان ئەکرد.

دایکـی بێسـتوون بەو چەنـد ڕۆژەی لایـانبوون بـاش ڕاهـات لەگەڵیـان و زۆری خۆشویســتن. بــۆیە هەر کە وڕە وڕی تەیــارە نەئەمــا دائەنیشــتن و بە خۆیــان پێئەکەنــین کەچیــان وتــووە و چیــان کــردوە وەک و ئەوەی چــۆن کە دایکــی بێستوون ڕای کردووە بەرەو ئەشکەوتەکەو پێشمەرگەیەک قیڕانویەتی: خوشکم سەرپۆشــەکەت داگرە! دایکـم سەرپۆشــەکەت داگرە! ئەویـش بەدەم ڕاکـردنەوە مەحکەمەی کردووە و گوتویەتی: کورە باوکم تۆ هەقی سەرپۆشـی منت چییە تۆ ئاگات لە خۆتبێت "ئەویش قیڕاندویەتی کچێ خوشکم سەرپۆشەکەت سپییەو تەیارەچییەکە ئەمانبینێت! ئەمیش گوتویە: کەواتە تۆش ئەوەندە مەقیڕێنە گوێی

لە دەنگی تۆش ئەبێ! ئیتر ئەکەوتن بە گازی پشتا.. لەگەڵ ئەمەشا جار بە جار بە پیرەمێردە شەهیدەکە ئەگریان.

***

پاش بۆردومانەکە بە ماوەیەک، ڕۆژێ دایکی بێستون بانگی کردە کوڕەکەی و گوتی: ڕۆڵە! ئەرێ ئەڵێیت چی بۆچی خوازبێنی ڕوناکت بۆنەکەین؟ بەخوا زۆر چۆتە دڵمەوە، خۆ دایکیشی ئەوەندە ژنێکی باشە هەر لە باسکردن نایەت، بەخوا هەموویان ماڵی باشن!"

بێستون لەگەڵ ئەوەشا کە خەریک بوو لە خۆشیانا گەشکە بکا، بەڵام نەیبردە سەر خۆیی و گوتی: نا دایە جارێ وەختی ئەوە نییە، ئەم قسەیەت لەدەم نەیەتە دەرێ، چونکە لەوانەیە بیبەنەوە ئیتر هاتوچۆمان نەکەن و بڵێن کەواتە بۆیە وا بە گەرمی دەورو خولمان ئەدەن بەتەمای کچەکەمانن! کچەکەش بەم قسەیە زۆر نارەحەت ئەبێت چونکە هێشتا منالەو ئەوانیش شارین کچ وا زوو نادەن بە شوو وەک لای خۆمان نییە کچی بەسەزمان لە دوانزە و سیانزە ساڵیدا ئەدرێن بە شوو!! بەخوا نەک هەر گوناح کفریشە!

- دەباشە کوڕم کەواتە جارێ قسەی لێناکەین، بەڵام بەخوا هەر چاوم لەسەری داناوە، ماشەڵا کە ئێسک سوک و بە حورمەتە!".

بێستون کوڕێکی ئاقڵ و هێمن بوو، ئەیزانی چۆن ئەجوڵێتەوە. نەیئەویست بە هەڵەشەیی هەموو شتێک لە خۆی تێکدا" جارێ ئەوە نییە وردە وردە خۆی بردۆتە پێشەوە و خۆی خۆشەویست کردوەو ئەو ڕوناکەی کە هەر گوێشی نەئەدایە و لە سلێمانی هەرچەند بچوایە ماڵیان لەگەرمەی قسەدا بوایە هەڵئەستاو ژورەکەی چۆڵئەکرد و ئەچووە ژورێکیترو شوێنێکیتر، هەر ئەو ڕوناکە ئێستە وایلێهاتووە نەک هەر لای دائەنیشێت و بەخێرهاتنی ئەکات بە نوکتەکانیشی پێئەکەنێ و هەنێ جار قسەوشتیشی لێئەپرسێ، ئەویش جارێ ئەوەندە بەسە.

بەیانییەک حسەین هێشتا خەریکی بەرچایی خواردنبوو، چاوێکی گێڕا بە دەوروبەر و پشتی خۆیا کەس دیار نەبوو تەنیا دایکی لەبەر سەماوەرەکە دانیشتبوو، بەبیانووی ئەوەوە کە ئەیەوێ چایەکی تر بخواتەوە چوو بۆ لای و بە ماتییەکەوە گوتی: دایە گیان ماوەیەکە قسەیەکم لە دڵایە کە پێتی بڵێم و

هەرچەند ئەکەم یا هەلم بۆ هەڵناکەوێ یا ڕووم نایەت نازانم ئێستە پێتی بڵێم یا نە؟ دایکیشی زۆر بە شەوق و خۆشییەوە گوتی: جا بەسەدەقەت بم بۆچی شەرم ئەکەی؟ بڵێ بزانم قسەکەت چییە؟ لەدەست منابێ بە چاوان بۆتی جێبەجێ ئەکەم" حسەین سەری داخست و گوتی: ئەرێ ئەوە منو نەسرین تاکەی وابین؟ خۆ وادیارە وەزعەکە نەک هەر ڕوو لە چاکی نییە بگرە بەرەو خراپتریش ئەڕوا. ئەم چەشنە حکومەتە خوێنخۆر و خوێنمژانە پیاو نابێ قەت چاوەڕوانی خێریان لێبکا، بۆیە ئەڵێم با بیگوێزمەوەو ڕزگارمان بێت!"
دایکی تۆزێ ڕەوەستاو بیری کردەوە و ئینجا گوتی: بەخوا ڕۆڵە خۆ قەول بوو یەکەم مانگی پایز شاییەکە بکەین وا ئێستە چلەی زستانیشە."

- باشە ئەی کەواتە چی بکەین؟
- ڕاوەستە با ئامەی خوشکم بێتەوە باسی لەگەڵ ئەکەم بزانم ئەو چی ئەڵێ: نازانم بۆچی وا دواکەوت؟ ئەبوو زوتر بهاتایەوە. ئێوارە لەگەڵ عەلیش قسەئەکەم.
- هەرچۆنێک بێ ببڕێتەوە باشە، بەتایبەتی کە نەسرینیش تازە ناگەڕێتەوە بۆ شار، چونکە مەترسی گرتنی لەسەرە لەوانەیە ئێستە ئەمری بۆ دەرچوبێت.
- نە گیانە باوەڕ ناکەم، چونکە نەسرینی بەسەزمان لە هیچا نەبووە.
- دایە بۆچی ئەو سەگبابانە لە هیچا بوون لە هیچا نەبوون ئەزانن؟ تۆ نایان ناسی چۆن کافرێکن.

(دایکی زانی کەوا حسەین دیسان نیازی محازەڕەی هەیە بۆیە هەر زوو گوتی:

- باشە باشە بەقوربانتبم وا ئەکەم کە ئینشالا بەم زووانە ئەم ئیشەتان ببڕێتەوە لەسەر خێران، کە لە شاربووم باوکیشت یەک دوو جار ئەم باسەی لەگەڵ کردمەوە، ئەویش زۆر مەبەستی بوو کە زوو ببڕێتەوە.
- بەڕاستی زۆر بیری باوکم ئەکەم..." هەستایە سەرپێ و ماچێکی دایکی کرد و گوتی: حەپسە گیان بیرت نەچێ هات! ئەمە حاڵ نییە.
دایکیشی پێکەنی و دەستی کردە ملی و ماچی کردو گوتی:
- دڵت هیچ نەکا خوایاربێ چاری ئەکەم.

ڕۆژێک شیروان بە سێ وڵاخەوە گەیشتە بەر دەرکی ماڵی حەپسەخان، ئەویش و کچەکانیش خۆیان حازر کردبوو چونکە دوو ڕۆژ لەوەوپێش جوابی بۆ ناردبوون کەوا دێت بە دوایانا بچن سەرێکی سەبری بدەن و چەند ڕۆژێکیش لەلایان بن، ئەوانیش هەندێ وردەواڵاو تورەکە و پریاسکەیان ئامادەکردبوو کەوا بیبەن بە دیاری، چونکە ماوەت لە چاو دێهاتەکانی دەوروبەریا شاربوو، دوکانی لێبوو شتی ئەمدیو ئەودیوی سنوریشیان ئەفرۆشت.

حەپسەخان و کچەکان سواربوون نەوشیروان و بەختیار و تۆفە و یەک دوو ڕێبواریش هەموو بەپێ لەگەڵیان کەوتنە ڕێ ئەوەندەی پێنەچوو سەرو جامانەو شان و کڵاشینکۆف و دو باڵای بێستونیش دەرکەوت ئەویش هاتبوو بچێت بۆ ماڵی خاڵی، کە پیاوێکی ناوداری ئەو ناوچیەیە بوو، وە بە قسەی بێستون ئەویش بانکرابوو لە ماڵی ئەوان، بەڵام نەئەزانرا کە بۆچی ئەو هەموو وەختە خاڵی بیری نەکردووە ئیمڕۆ نەبێت؟ هەرچۆنێ بێ بێستون کوڕی چاکەو هەڵەشەیی ناکا بۆیە هەموو کەس چاری نییە ئەبێ باوەڕ بە دەعوەتکرانەکەی بکات!

ڕونکا کە بێستون دەرکەوت دڵی داخورپا، لەگەڵ ئەوەشدا زۆری پێخۆشبوو، بەڵام نەشیئەزانی کە لەبەر چی وا پێیخۆشە، ڕەنگە هەموو هەر ڕاهاتن بێت کەوا هێندە لای گۆڕاوە وەک و یەکێ لە خزمەکانی لێهاتووە، قسەکانی زۆر بەجێن، خۆ نوکتەو دەمودوی هەر خەڵک ئەبورێننەوە لە پێکەنینا. بەڕاستی کوڕێکی زۆر بەڕەحمیشە، چاوی لێیە چەند دڵسۆزانە لەگەڵ دایکی ئەجوڵێتەوە نەوەکا ناڕەحەتبێ، زۆر کوڕێکی ئازاش دیارە" ڕوناک بەسەر پشتی وڵاخەکەوە ئەم بیرانەی ئەکردەوە. کوڕەکانیش بەدەم ڕۆینەوە قسەیان ئەکرد و پێئەکەنین و جارێ ئەمان پێش ئەکەوتن جارێ ئەوان.

٢٢

مـاڵەکەی سـەبری تیـابوو بریتـی بـوو لە هەیوانێـک و دوو ژوور، بەردەمـی هەیـوانەکە لایەکـی لیـژنەداری لێهەڵچنرابـوو هەم بـۆ سـوتاندن و بەکارهێنـان و هەم بۆ ئەوەی کە تا ئەندازەیەک بەری با و بۆران بگرێت.

ژوورەکـان گەرم و گـورِ بـوون فەرش و ڕایەخ و دۆشـەکی ئیسـفەنجیان لێڕاخرابـوو، دوو سـۆپای داریـش لە ناوەڕاسـتیانا دانرابـوو، هـی ژوورە گەورەکەیـان داگیرسـێنرابوو کتلـی و سـەتڵێکی ئـاوی لەسـەربوو بۆ دەستشـتن، گیزەی سـەماوەری سـەبریش ئەتگوت گۆرانی بـۆ دانیشـتوانی ژوورەکە ئەڵێت، بۆن و هەڵمی چاییەکە خەڵکی ڕائەکێشا.

خۆی کچێکی بە سەلیقە و ڕێک و پێک و شیروانیش گیرفانی ئاوەدانبوو چـونکە باوک و دایکی حاڵیان باشبوو، زوو زووش پارەیان بۆ ئەنارد.

هەیوانەکەیان ئەیڕوانییە سـەر دیمەنێکی دڵگیری خـۆش، شـاخ و کێوی جـوانی لێوەدیاربوو، چەمێکی خۆشیشیان بەبەردەمـا تێئەپەڕی، ئەگەرچـی لەبەر بـارانی زسـتان لێـڵ و قوڕاوییـوو بەڵام دڵ و دەرونـی ڕوون ئەکـردەوە، لەوپەڕی خانوەکەشیانەوە پلوسکێک لەوسەری شاخەکەوە بۆ خواردنەوەو نان و چێشت.

ژنێکیش لە مـاڵەکەدا خـۆی هەڵکردبـوو ئیشـی ئەکرد حەپسـەخان گوێیلێبـوو کە سـەبری هەر بە "بـوکە حەبیـب" بـانگی ئەکـات. کە ژنەکە دور کەوتەوە بە زەردەخەنەیەکەوە چرپانـدی بە گـوێی سـەبریدا و گـوتی: ئەیەڕۆ ئەمە بـووکی چییە؟ خۆ دانی لە دەما نییەو بەقەد نەنکت ئەبێ!" بە ئەسـپایی پێکەنـی و دەمـی خۆی گرت. سەبری پێکەنی و گوتی: دایکم ئەوە ژنی ئەم ناوە تورە ئەبن ئەگەر پێیـان نەگـوترێ "بـووک.." حەپسـەخان و کچەکـان سـەریان سـورماو پێکەنـین. سـەبری سـەیرێکی ئەمـلاولای کـردو گـوتی: کە تـازە هـاتبوومە ئێـرە شـیروان ڕایسپاردبوو کە ئەگەر میوانمان هەبوو، بێت یـارمەتییەکم بـدات و نانیشـمان بۆ بکـات. منـیش نەمزانـی پێمگـوت "پـورە حەبیـب" کەچـی تـورە بوبـو بەو کـوڕەی گوتبوو کە بۆی هێنابوین کەوا ئیتر نـایەت بـۆ لامـان چـونکە پێمگوتـووە "پـورێ" تۆفە کە گوێی لەم حیکایەتەی "بوکێ" بوو لە دڵی خۆیا گوتی: پێچکەی بـوکێ بە گۆڕم! بزانن ئێستە چۆنی بانگ ئەکەم. بێدەنگ بوو هیچ قسەی نەکرد تا وەختـی

نـان و سـفره دانـان، ئەوسـا تـۆفە چـووە هەیـوانەکە و گـوتی: ئـا "پـورە حەبیب" خێری ئیمانت ئەو سینییەم بدەرە دەست!

بوک حەبیب بوو بە فیشەکە شێتەو تورەبوو گوتی:

- کورە دایکت پورە! خوشکت پورە! ئەوە عەیب ناکەی؟ چروچاوی خۆت زۆر جـوانە! خۆتـت نەدیـوە؟ سـەروجامانەی تەپیـوت خـواتەوە، سـمێڵت ئەڵێی گسکی تەویلەیەو..." هێشتا ویستی قسـەیکەی پێبڵـێ تـۆفە بە درۆ خۆی گێل کرد و بەسەرسورمانێکەوە گوتی: بـۆ؟ بـۆ؟ بـۆچی مـن چیم گوتـووە؟!" سـەبری کە گـوێی لە دەنگیـان بـوو بە پەلە لە ژوور هـاتە دەرێ، تـۆفە هەر سـەری سـەبری دی ڕووی تێکـردو گـوتی: وەرە بـۆ خـاتری خـوا بزانە "پـورە حەبیب" لەسـەر چـی عـاجز بـووە لـێم نـازانم چیبـووە؟" تـا تـۆفە ئەم قسـانەی کردبـوو کە حەبیـب شـتەکەی دەسـتی فرێداو بەپەلەو بەدەم جنێوی ژێرلێوەوە سەرقۆڵ و فەقیانەکانی هێنـایە خوارەوەو گوتی: تاکو ماوم سەرناکەم بەم ماڵەدا!

سەبری لە تۆفە تـوورە بـوو پێیگوت: تـۆفە ئەوە دیسـان چ کەتنێکی کرد؟" ئیتـر شوێن بوکە حەبیب کەوت پەلی گرت لێی ئەپاڕایەوە دەتخـوا عـاجز مەبە، ئـاخر چی بووە؟ تۆ جارێ مەڕۆ پێمبڵێ بزانم"

بوک حەبیب خۆی ڕاپسکان لە دەستی و کەوتەڕێ، سەبریش بە دوویەوە ئینجـا گوتی: پێم ئەڵێ: پورە"!" سەبری ئینجا زانی مەسـەلە چییە، گـوتی: بـووک حەبـێ بـا واشـی گـوتبێ خـۆ کفـری نەکـردووە؟ لای ئـێمە بە هەمـوو ژنێـک دەگوترێـت "پوور" بەو خوایە هەندێ خزممان بە منیش دەڵێن "پورە سەبری" تکـات لێئەکەم ئەمجارە لێیببورە نەیزانیوە، هەر هـیچ نەبـێ لەبەر دڵـی دایکـم و ئەوان بگەڕێـوە" هەرچۆنێـک بـوو بەهەزار حـاڵ بـووک حەبیبـی گێـڕایەوە کەوا کچـی لە سـەبری گەورەتری هەبوو!.

***

میوانەکانی سەبری دی و ماڵەکەیان زۆر لا خۆشبوو، هەر یەکەم ڕۆژ دایکی گوتی: وەی ئێرە چەند دڵگیر و خۆشە خۆزگە ئێمەش لێرە بوینایە!" نەسرین هەڵیدایە گوتی:

- ئەی کورەکـان چیـبکەن بێئـێمە؟" ڕوونـاکیش بـێ ئەوەی بزانـێ بـۆچی ماوەتی لا خۆش و شیرین بووە گوتی:

- دایە ئێرە هەر لە لادێی تەواو ئەچێ بەڵام ماوەت ئەڵێی شارە، زۆر خۆشە!".

دوو شەو لەوێبوون وادیاربوو بێستوون ویستبووی، وەکو ئەڵێن، خۆی قورسو قەمەر بگرێ بۆیە دیارنەبوو، ڕۆژی سێیەم کردی بە ماڵاو بە شەوقەوە سڵاوی کرد و ئەوانیش بە گەرمییەوە چاک و چۆنییان لەگەڵ کرد. کە لێی پرسین دێیەکە چۆنە لەلایان، زۆر مەتحیان کرد کەوا شوێنێکی دڵگیر و فەرەح و خۆشە. دوای نەختێ قسەیتر بێستون سەیرێکی حەپسەخانی کرد و گوتی: ئەوە من بەناوی خاڵ و خاڵۆژنمەوە هاتوم بەخێرهاتنتان بکەم و ناردویانم بە دوتانا کەوا ئەم ئێوارەیە بفەرموونە ماڵی ئەوان. خاڵۆژنم و ئەوان زۆریش حەزیان ئەکرد کە خۆیان بێن، بەڵام من نەمهێشت گوتم من هەر ئەچمە لایان بەناوی ئێوەشەوە بەخێرهاتنیان ئەکەم و داوەتیشیان ئەکەم (ئینجا بە پێکەنینەوە) گوتی: بەڕاستی زۆربوون گوتم بێتاقەتتان نەکەن بانەیەن. ئێوە فێری لادێ نین! حەپسەخان بە پەرۆشەوە گوتی: ئەیەڕۆ بۆچی لادێی چییانە! بەو خوایە ئەوەندە خەڵکێکی چاکن نەبێتەوە، بەپێچەوانەوە من زۆرم خۆشەوێن و حەزەکەم هەمیشە لەگەڵیانبم" سەبریش هەڵیدایە خۆ من هەر زۆر زۆرم خۆشەوێن. ساویلکەو دڵپاک و پیاون و هەرە گەوجەکەیان هەزار شارستانی فێڵباز و بلۆفچی و دەسبڕ ئەهێنێ!" بێستون زۆر دڵی خۆشبوو بەم قسانەی دایک و کچ و بەم هەستو شعورەیان بەرامبەر بە خەڵکی لادێ، کە تەنیا گرێ بوو لە دڵیا بەرامبەر بە خۆشەویستی ڕوناک. بۆیە بە دڵ و دەرونێکی پڕ هیواو خۆشییەوە گوتی:وەڵا خۆ خاڵوژنم حەدی نەبێ لەڕوی خۆتانا زۆر ڕێک و پێکە، ئێستە ئیشەڵا ئەیبینن هەر ئەڵێی ژنە شارستانییە، بەڵام ماڵەکەیان تۆزێ سەرەو هەورازە ئەبێ لەسەرخۆ بڕۆین" حەپسەخان گوتی:

ئینجا کەواتە با هاتنەکەمان بکەوێتە سبەینێ ئێستە تازە درەنگە، تا ئەچین و ئەگەڕێینەوە ئەبێت بە شەو، وە بە شەویش زۆر زەحمەتە بۆمان بە تایبەتی بەم سەرمایە هەر ئەمرین!" بێستون بە پەرۆشێکەوە گوتی:

- خوا نەکا ئیشەڵا هەر خۆش و سەلامەت ئەبن. بەڵام ئەوەش بزانن کە هەر نایەڵن شەو بگەڕێنەوە، عادەتی لادێ هەروایە کە میوانیان چوو نایەڵن وا زوو بگەڕێنەوە!

ڕوناک کەوا پێش هاتنی بێستون خەریکبوو تاقەتی بچێت و تۆزێکی مابوو بە دایکی بڵێ کەوا هەفتەیەک زۆرە با بڕۆینەوە، ئێرە زۆر کشو مات و ناخۆشە، بەهاتنی بێستون گەشایەوەو پڕ بە دڵ بە قسەکانی پێئەکەنی و زو زو سەرپۆشەکەی ئەنا بە دەمییەوە! بەم بۆنەیەوە نەک هەر خۆی دڵخۆش بەڵکو شوێنەکەشی لا خۆشبوو.

***

هەستان خۆیانکۆکردەوەو لەگەڵبێستون کەوتنەڕێ هەتا بەینێ ڕێگاکە خۆشبوو بەڵام ئیتر بەرە بەرە گەیشتنە هەورازو سەختی، نەختێ ڕۆیشتن حەپسەخان ڕاوەستاو ئاوڕێکی دایەوە لەوانیتر و گوتی:

- وای باوکە ڕۆ خۆ من هەناسەم لەبەر بڕا" بێستون بە پەرۆشەوە گوتی: داخەکەم ڕێگاکەی سەختە بێگومان ماندوو ئەبن بۆیە باشتر ئەوەیە کە پەلە نەکەن و لەسەرخۆ بڕۆن.
حەپسەخان گوتی: دەی لەسەر خوا، چارمان چییە خۆ بشمانەوەێ ناتوانین خێرا بڕۆین (ئینجا بانگی کردە سەبری): ئەرێ سەبری تۆ هیچ هاتوی بۆ ئێرە؟"
سەبری گوتی: من نەوەڵا، بەڵام شیروان تا ئێستا چەند جارێک هاتووە، وابزانم ئەوسا خالۆژنی کاک بێستون لێرەنەبوو".
بێستون گوتی: بەڵێ ڕاستەکەی، چوبوو سەر لە ماڵی باوکی بدا نەخۆشبوو. "ئیتر هەموو بێدەنگ کەوتنە ڕێ، نەسرین چەند جارێ کەوت، سەبریش وەختەبوو بکەوێ بەڵام خۆی گرتەوە، حەپسەخان هاواری کردە تۆفە: کورە بمگرە کەوتم! و دەستی کرد بە پێکەنین: تۆفە هات و دەستی گرت و ڕایکێشا ئەویش هەر بەخۆی پێئەکەنی، خەریک بوو لەگەڵ تۆفە بە جوتە بکەون و بخزێن تا خوارەوە.
تۆفە دیسان قسەی نەستەقی هات وەیستی خۆی بکات بە دەمڕاستی جەماعەت لەبەر ئەوە بەدەم هەناسەبڕکێوە گوتی:

- ئەرێ کاکە بێستون گیان ئەوە ماڵی خاڵت ماڵیان نەدۆزیوەتەوە لەم سەری شاخە زیتر؟؟" بێستون گوتی: وەڵا کاکە تۆفە لێرە خەڵک بە سەرما، بە زستان بە بەفر ناجوڵێنەوە، ئێستەش وا ئەچین و

شوێنەکەیان ئەبینیت کە چەند پان و بەرین و خۆشە، هەمووی باخ و کانیاوە، زەراعەت و خێری زۆری تیایە، خاڵم بە تەنیا باوک و باپیریشی هەر لێرە ژیاون.

- باشە کە شوێنێکی ئەوەندە خۆش و باشە بۆچ نەختێ ڕێگاکەی خۆش ناکەن، ئەم پیادەڕێ باریک و لێژ و خزە چییە؟"

تۆفە وای گوت و ڕوناک زرمەت هات بەردێک خزا لەژێر پێیا، لەوانەبوو خراپ بکەوێ بەڵام بەختی بوو کە دارو بەڕوویەکی ڕوتەڵی لەلابوو خۆی پێگرتەوە، دایکی قیژاندی:

- لەڕێی خوا بگەنە ڕوناک!" هەر ئەوەندەی زانی بێستون وەک ئاسک بە دوو باز خۆیی گەیاندێ چونکە نەسرین و سەبری زۆر لە پێشەوەبوون و تۆفەو دایکیشی لە دواوە ئەڕۆیشتن، بێستون نزیکترین کەس بوو کە بتوانێ فریای بکەوێت و هەڵیسێنێتەوەو دەستی بگرێ تا لەو شوێنە سەختە ڕزگاریکات و بیگەیەنێتە شوێنێکی باشتری ڕێگاکە. ڕوناک بەو سەرمایە خەریک بوو لەشی بنیشێتە سەر ئارەق کە دەستی بێستون بەر دەستی کەوت! بە تەریقییەکەوە سوپاسی کرد و کەوتەوە ڕێ، بێستونیش لە خوای ئەویست کە هەموو ڕێگاکە وا سەختبوایە، بۆ ئەوەی بەشکو دەستی ڕوناکی بەرنەدایە (ئای خوایە لەو دەست و پەنجە خرپن و نەرمونۆڵە جوانە! بەڵام بۆ بەم سەرمایە دەستی ئارەقی کردبووەوە؟ خوایە ئەوە بۆنی ئەوەندە خۆش هەیە؟ باوەڕ ناکەم هیچ عەترێک بیگاتێ!) بێستون وەک مەستی لێهاتبوو تا شەویش ئەو بۆنە هەر لە لوتیابوو، تا بەینێکیش دەستی نەشت ئەیگوت بە دەستی ڕوناک گیان کەوتووە! ڕوناکیش بەپەلە خۆی گەیاندە دایکی و دڵنیایی کرد کە هیچی لێنەهاتوەو کەوتەوە ڕێ لەگەڵیان بەڵام جار بە جار دەستی ئەگرت بە قۆڵی تۆفەوە نەوەکا بکەوێ، تۆفەیش ئەیگوت: دەی دەی کەریخۆتان دۆزیوەتەوە تۆ لە لایەکەوە ڕامکێشەو دایکیشت لە لایەکەوە!" نەیئەزانی کە لەولایەوە بێستون خۆزگەی پێئەخوازێ و منەتیشی ئەبرد ئەگەر بکرایە ئەو ڕوناکی بکرادای کۆڵیشی نەک هەر دەستی پێوە گرتایە!

ئەوەنـدەی نەمـابوو بگەنەجـێ سـەرو کەلەی شـیروان و بەختیـاریش دەرکەوتن و گەیشتنە لایـان. خـاڵ و خـاڵۆژنی بێسـتون و چەند کچ و ژنێک هاتن بە پیریانەوەو بە گەرمی بەخێرهاتنیـان کردن و پێشـخۆیان دان بۆ ماڵەوە، پیاوەکان بران بۆ دیوەخـان و ژنەکـانیش بۆ ژورێکیتر، خاڵۆژنی بێستون وابوو وەک و باسـی بۆ کردبوو و زیـاتریش: ژنێکـی تـا بڵێیـت شـۆخ و شـەنگ، ئەگەر دوو کـوڕی خـان و ژن و مـاڵ و سـێکچی بە شـوی نەبـوایە نەگـوترایە زۆری ئەوانەی لەگەڵـی ڕاوەسـتابوون بـووک و کـچ و نەوەی بـوون، کەسـێ بـاوەڕی بەوە نەئەکرد کەوا عەمری لە جل سـاڵ زیـاترە. سپیکەلەیەکی چـاو و برۆ مەست، خەنە و وسمە سەرو پرچی هێندەیتر جوانکردبوو، پەرچەمێکی تۆزێ کورتی بڕیبوو، لەژێر سەروبەستەکەیەوە بەسـەر نـاوچەوانێکی سپی و سـافا هـاتبوە خـوارێ هەر لێی بوبو بە نەخش، لـوت و دەم و دانـی یەک لە یەکتـر جوانتربـوون، بـێجگە لەمـانە هەمـووی زۆر پـاکو تەمیز بوو، بۆنی گوڵاو و مێخەک لەسەرو گەردن و بەرۆکی ئەهات!.

میوانەکـان بەچـاوبڕینە ژنەکەو سـەیری یەکترکردنـی ناوبەناویـان دیـاربوو کە سـەریان سـوڕماوە لە کـاری خـوا. چـونە ژورەوە، ژوری چی؟ بەڕاستی هەر لە خاوەنەکەی ئەوەشایەوە: دڵگیر، خۆش، فراوان، دوو پەنجەرەی تیابوو ئەیانڕوانییە سـەر دێیەکە، چـوار پێنج تاقێک لە دیوارەکانیـا بـوون هەریاکەیـان پـارچەیەک بلـووری سـپی پـاکی تیـا ڕاخرابـوو، یەکـێ یـان چەنـد کاشـی و چینییەکـی قەدیمـی جـوانی تیـا ڕیزکرابــوو، یەکێکیکەیــان ســەماوەرێکی گەورەی وەرشــاوی بە قۆیەیەکی گوڵگوڵییەوە تیـابوو، دو سـێ ڕیـز مـێخەک و سـمڵ وەک و ملـوانکە کرابـووە ملـی سـەماوەرەکە، چەپکـێ گوڵەبـاخی وشـکیش خرابـووە جـامەکەی بەردەمیـیەوە، یەکـێ لە تاقەکـانیش قورئـانێکی گەورەی لە بەرگێکـی سـەوز و جوانـا تیـا دانرابـوو. ئەرزەکەشـی هەمـووی بە بەڕڕەو لاکێش داپۆشـرابوو. لای دەرگـاکە نەبێ، هەرسـێ لایەکەیتری ژورەکە بە دۆشەک و سەرین و پشـتی پـاک ڕازێنرابوەوە،

چەنــد ســنگێکی زەردیــش بە دیوارەکانیــا داکوترابــوون. تفەنــگ و کلاشینکۆف و فیشەکدانیان پیا هاتبوە خوارێ.

دوای بەخێرهاتن و چەند قسەیەکی عەرەب گوتەنی "موجامەلە" خەڵکی مــاڵەکە چــوون بەلای نــان و چێشــت و ســفرەدانان و ئیشــکردنەوە، میوانەکانیش هەرکە دییان ژورەکەیان بۆ چۆڵبوو کەوتنە چرپە چرپ و باسی ئەم ژنەو ئەم ماڵە: حەپسەخان سەیرێکی ئەملاو ئەولای خۆی و دەرگـاکەی کـرد سەرپۆشـەکەی گـرت بە لایەکـی دەمـیەوە و گـوتی: کچینە ئێستە زانیم کە ئەم پیاوە بۆچی ئەم خەڵکەی بەجێهێشتووە و بەم تاقە ماڵە هـاتۆتە سـەر ئەم شـاخە!! هەمـووی لە ترسـی چاوەزارە، نەوەکـا ژن و مـاڵ و منـاڵی بەچاوەوەببن! ئەرێ ئەبێ ئەم ژنە وەختـی خۆی چۆن بوبێ؟؟".

سەبری نەختێ لێوی خۆی هەڵقورتاندو بە هێواشـی گوتی: ئەوە ئێمە بەخێــرێ شارســتانین و بەم ژنەش ئەڵــێن لادێــی؟! ماشــاڵا ماشــاڵا! نەســرین بە زەردەخەنەیەکەوە بە چــرپە گــوتی: چەنــد فەیــزو لــووت بەرزییەوە هاتین! گوتـان ئـاخۆ چ مـاڵێکن کەچـی هەر تەریق بووینەوە" ڕوناک کەوت بە گازی پشتا و خۆی خستە پەنا دایکییەوەو گوتی: ئێوە چاوتان لە کاکە تۆفە نەبوو چۆن زەق بوبو سـەیری کچەکانی ئەکرد دایکـی سـیخورمەیەکی ئەسـپایی لێـداو گـوتی: کچـێ بێـدەنگبە نەوەکـا گوێیـان لێبـێ!" سـەبری بە پێکەنینێکـی هەتـا بتـوانێ بێـدەنگەوە سـەری لێهێنانە پێشەوەو گوتی:

- هەر خـوا ڕەحمـی ئەوەمـان پێبکـاو نەڵـێ حەزیـان لێکـردووم!" نەسـرین چرپانی گوتی: "ئا.. خزمی کاک بێستونن چۆن وایان پێ ئەڵێت؟!".

***

ســفرە ڕاخــراو چێشــت و نــان دانــراو ژنــی خاوەنمــاڵ هــات و بەشــەرمێکەوە پێیگـوتن: " دە فەرمـوون شـتێک بخـۆن ئەگەرچـی ئەزانـم خواردنەکەشـمان هـی ئێوە نییە بەڵا، دەسەڵات چییە..؟"

میوانەکان هەستان بەدەم مەدح و سوپاسەوە، کچێکی دە دوانزە ساڵەی ئێسک سـوک مەسـینەو لەگەنێکـی بـۆ هێنــان دەســتیان شــت و بەدەوری ســفرەکەدا

دانیشتن، ئەوەی لە خواردنەکانی سەر سفرەکە سەر هاتە بەرچاوی ئەمان، دوو شت بوو، یەکەم هیچ کوتە گۆشتێک دیار نەبوو کە بەلای میوانەکانەوە خواردنی دەعوەت ئەبێ گۆشتی لە هەموو شتێ زیاتر بێت. دووەم ئەوەبوو کە شلەیەکی تایبەتی لێنەنرابوو، لەتکە نۆک و لەتکە باینجان و تەماتەو پیاز و تاکە تاکەش بامیە هەبوو بە تێکەڵاوی کرابوون بەیەک چێشتی شلە. بۆ گلەیی بێگۆشتی هەر کەوچکیان برد بۆ برنجەکە تەریقبوونەوە چونکە دەوریـیە برنجەکانی کە بۆیان دانرابوو پڕبوو لە پلە گۆشت، تمەز ئەوانە عادەتیان وایە گۆشت ئەخەنە ناوەڕاستی قاپەکەوەو بە برنج دایئەپۆشن، حەپسەخان و ئەوان کە ئەمەیان دی سەیری یەکتریان کرد و قۆڵیان لێهەڵماڵی و کەوتنە تیکە گلاندن.

تا لە شێوکردن بوونەوە بە بە بە شەو لۆکسێک و دو سێ چرای دەستی و فانۆسی ئینگلیسی داگیرسێنرابوون، سەماوەر گیزای ئەهات... بەدەم چا خواردنەوە کەوتنە قسەکردن باسی بۆردومان و شەڕەکانی پێشمەرگەو حکومەتیان ئەکرد. هەریەکە باسی ئەو خزم و کەسانەی ئەکرد کەوا بوون بە پێشمەرگە، باسی لێبوردن و ئازایی و نەبەزییان ئەکردن لەگەڵ دوعای سەرکەوتندا. خاوەن ماڵ کە دی یەک دوانێ لە میوانەکانی کەوتنە باوێشک دان، بە کچ و بوکەکانی گوت کە نوێن بێنن بۆ حەپسەخان و ئەوان کەوادیارە ماندون و خەویان دێ، نوێنیان بۆ هێنان و ژورەکەشیان بۆ چۆڵ کردن.

سبەینێ نانی نیوەڕۆشیان لەوێ خوارد، ئەوجا هەرچی ماڵەکەش زۆریان لەگەڵ خەریکبوون کە نەڕۆنەوە و، ئەو شەوەش لایان بمێننەوە ڕازی نەبوون و بە سوپاس و ماڵئاواییکردنێکی گەرمەوە کەوتنە ڕێ دوای ئەوەی حەپسەخان تکایەکی زۆری لە خاڵوانی بێستون کرد و گەلێ سوێندی دا کە لە زوترین کاتدا بە خاو و خێزانەوە بێنە لایان، هەر نەختێ لە ماڵەکە دورکەوتنەوە حەپسەخان و ئەوان دەستیان کردەوە بە مەتحکردنی خاڵۆژنی بێستون و هەموو ئەهلی ماڵەکە. لە ڕاستیشا ماڵێکی باش و بەخزمەتبوون، هەمیشە بەو سەر شاخەوە لاو دیوەخانیان گەرمبوو، بەڵام هیچ گومان لەوەشا نییە کە ئەم خزمەت و بەدەوراهاتنەی ماڵی حەپسەخان دەستی بێستونیشی تیابوو، دە دەقیقەیەک نەبوبو کە کەتبوونە ڕێ تۆفە قیرەی لێهەستاو گوتی: "شتێکم لێبەجێماوە، هەروا

تۆزێ ڕاوەستن ئێستە دێمەوە" ئیتر بە هەڵەداوان بەرەو ماڵەکە ڕایکرد لەوێ کوڕەکەیانی پێگەیشت کە ئەویش ڕایکردبوو بە شوێنیانا کوڕەکە چاوی بە تۆفە کەوت کیسەیەکی دایە دەستی وبگوتی: "ها کاکە ئەوە سنگەکانە لەبیرت چوبون!" تۆفە لە دەستی وەرگرت بە سوپاسەوەو کردیەوە و سەیرێکی کرد و گوتی: " زۆر سەیرە خۆ ئەمانە هەر ئەڵێی قاوغە فیشەکن" کوڕەکە پێکەنی و گوتی: "ئەی قاوغە فیشەک نین چین؟" ئەمانە قاوغی ئەو گولە شەست تیرانەن کە تەیارەکان ئەیگرنە خەڵک و ئەوانیش ئەیدۆزنەوە و ئەیکەن بە سنگ.

سەیریان کە چەند جوانن هەر ئەڵێی ئاڵتونن!.." حەپسەخان لە دورەوە قیڕاندی و گوتی "زوبە ڕەقبوینەوە لە سەرماندا"

تۆفە گوتی: وا هاتم وا هاتم. بەگەرمی سوپاسی کوڕەکەی کردەوەو ڕایکردەوە بۆ لایان.

سەبری لێپرسی: "ئەوە بۆ وا بە هەڵەداوان چویت و بە شپرزەیی هاتیتەوە؟ ئەوە چییە بە دەستەوە؟

دایکە کە لە سەرماندا دەستی خستبووە ژێربالی گوتی: قوڕ بەسەر حکومەت کورد لە ناو ئەبا! نازانێ گولەی تەیارەکانیان کردووە بە سنگ و کلاشینکۆف و بڕنەوی پیا هەڵئەواسن! ها سەیری ئەم سنگانە بکەن" کچەکان بە سەرسوڕمانەوە لە دەستیان وەرگرت و سەیریان کرد، حەپسەخان هەردوو دەستی بەرزکردەوە و سەیری ئاسمانی کرد و گوتی: "ئۆە خوایە ئەم گولانە بەر سەری دڵی خۆیان کەوێ، ئاخر چ گوناهێکمان کردووە وا گولەباران و بۆردومانمان ئەکەن؟ دەک خوایە هەقیان لێبکەیتەوە؟! گولەکان هەر وەک گولەی تفەنگ وابوون بەڵام لەو گەورەتربوون یەکی بەقەد ترۆزییەک ئەبوون.

تۆفە هەر ئەمدیو ئەودیو ئەکردن و ئەیگوت: " چەند زەرد و جوانن" کەویستی کۆیانکاتەوە ڕوناک یەکێکیان برد بۆ خۆی، کەوتنە ڕێ بەڵام بەشبوو ئەمسەر سەرەولێژ بوو، زۆر ئاسان بوو بۆیان، ڕوناک لە کەوتنەکەیەوە ترسابوو بۆیە دارێکی گرتبوو بە دەستییەوە وەکو گۆچان ئەیچەقاندە ئەرزو وردە وردە ئەڕۆیشت.

کە گەیشتنە ناو دێکە سەیریان کرد بێستون وا خەریکە بەرەوژوور ئەبێتەوە، کە چاوی بەمانکەوت سستبوو پرسی: " ئەوە بۆ وا زوو هاتنەوە پەلەتان چیبوو؟ من ئێستا خەریکبوو بێمەوە بۆلاتان خۆ نارەحەت نەبوون لە ڕێگا؟"

حەپسەخان گوتی: نەوەڵا زۆرباش هاتین چونکە ڕێگەکەمان سەرەوخواربوو. بەڵام ماڵی خاڵت ئەوەندە خزمەتیان کردین و ئەزیەتیان کێشا بەدەستمانەوە، زۆر شەرمەزاریان کردین.

تخوا قسەی وا مەکە حەپسەخان خزمەتی چی و ئەزیەتی چی؟ ئەوان بە چونەکەتان ئەوەندە خۆشحاڵبوون هەر ئەوە نەبوو باڵ بگرن، ئەوان بەتەمابوون کە لای کەمی سێ چوار شەو لایان بمێننەوە، نازانم ئەم پەلە پەلی هاتنەوەیەتان لەچی بوو؟ بێستون کە ئەم قسانەی ئەکرد، وەختەبوو شەق بەرێ لە داخانا کە بۆچی زوتر نەهات لەڕێگا لەگەڵیان بوایە بەڵک و دیسانەوە ڕوناک پێویستی بەیارمەتییەکی ئەم ببوایە، یان هەر هیچ نەبێ خۆ دوور بە دوور تێر سەیری ئەکرد!

تۆفە بە هەلی زانی بۆ ئەوەی پشتگیری خۆی پشانی بێسوتن بدا گوتی: "جا حەپسەخان ئەوەش باش بزانە کا خاڵی کاکە بێستون زۆر کاکە عەلی و حسەین و ئێمەی خۆشەوێت، زو زوش دێتە ماوەت و جاریش نییە کە سەرێک لە بارەگا نەدات و هەواڵی هەموان نەپرسێت"

بێستون تا بەر دەرکی ماڵی سەبری لەگەڵیان چوو، لەوێ خوا حافیزی لێکردن و ڕۆیشت... حەپسەخان و ئەوانیش لەباتی هەفتەیەک دە ڕۆژ لەوێ مانەوە ئینجا ڕۆشتنەوە بۆ ماوەت دوای ئەوەی حەپسەخان و سەبری بە دزی نەسرینەوە لەبارەی مەسەلەی ئەو حسەینەوە قسەیان کرد، ڕێو شوێنیان بۆ جێبەجێکردنی دانا.

***

ڕۆژێک لای ئێواره دوو ولاّخ لەبەردەرکی ماڵی حەپسەخان ڕاوەستان، ئامر مەخفەرێک بە قاپوتی پۆلیسی و نیشانەوە سواری یەکێکیان بوبو. تۆفە کە لەم کاتەدا لە حەوشە داری ورد ئەکرد بۆ سۆپاکانیان لە سوچێکی دەرگاکەوە ئەمەی دی گورچ تەورەکەی دانا و بە حەپەساوی ڕایکرد بۆ لای دەرگاکە تا بزانێ ئەمە چییەو ئەم پۆلیسە کێیە کەوا خەریکە دایئەگرێ لەسەر ولاّخەکە. زۆر سەیر هاتە پێش چاوی بەسەرپێچ و لەچکیا لە ژن ئەچێت، نەختکیتر چووە پێشێ و لەپڕ قیژاندی: "ئای ئامە خان ئەمە تۆی؟"
کچەکان لەولاوە بە هەڵەداوان هاتن بزانن ئەم قەرەباڵغی و غەڵبە غەلبە چییە، ئەوانیش لە دورەوە حەپەسان کە چاویان بە جلی پۆلیس و خەو ت نیشانی سوارەکە کەوت. تاکو لێینزیک نەبوونەوە نەیانزانی کە ئەوە ئامەخانە!... ئینجا هەموو پەلاماریاداو هێنایان بەرەو ژورو بو بە هەلاّو پێکەنین، ئەو ئەیگوت ئەمە چییەو ئەو ئەیگوت ئەمەت لەکوێبوو؟ ئەویش لەوانزیاتر پێئەکەنی، لەگەڵ ئەوەشا لە سەرماناو لەبەر ماندویەتی قسەی پێنەئەکرا. تۆفە شتەکانی هێنایە هەیوانەکەو سەرێکی کێشایە ژورێ و سەیرێکی ئامەخانی کرد کەوا کچەکان تێیئالاّبوون خوشکیشی لەبەر پێکەنین وەختەبوو ببورێتەوە تۆفە گوتی: "ئەرێ ئامەخان ئەوە کەی بووی بە عامر مەخفەر؟ ماڵت ئاوابێ خۆ تۆ زەندەقت بردین، بەوخوایە وامزانی حکومەت داویەتی بەسەرمانا!"
ئامەخان لەسەخۆ گوتی" جارێ لێمگەڕێ با تۆزێ پشوبدەم، زوو ئاگرەکە خۆشکەن مردم لەسەرمانا، جلەکانم هەموو هەر ئاون با جارێ خۆم گەرم بکەمەوە " (پێکەنی و گوتی: ئەوسا باسی ئامر مەخفەرتان بۆ ئەکەم)".
کوڕەکان کە هاتبوونە ژورەوە و بە قاپوتی ئامر مەخفەر پێئەکەنین، کە گوێیان لەم قسەیەی ئامەخان بوو ژورەکەیان چۆڵکرد، ئامەخانیش پاش تۆزێ کەوتە لەچک کردنەوە و سەرپۆشلابردن و جل داکەندن و وشککردنەوەیان و خۆگەرمکردنەوە، کەلەوانە بوەوە جلی گۆڕی و خۆی گورج کردەوەو چاییەکی گەرم و گوڕی کرد بە دوو قوم ئینجا گوتی: "بڵێن بە کوڕەکانیش با بێنە ژورەوە باسی ئامر مەخفەرتان بۆ ئەکەم" کوڕەکان هاتنە ژورێ و ئەویش لەسەر قسەی خۆی ڕۆیشت و گوتی: "جارێ پێش هەموو شتێ مژدەی ئەوەتان

بدەمێ کە نەوبەهار شکورِ کورِی بوو، پێرێ تەلگرافیشیان نارد، هەموو دایان لە چەپڵەو کردیان بە قریشکو هورِ (تۆفە بەڕاکردن چوو مژدەبەرێت بۆ عەلی) حەپسەخان لە خۆشیانا گریان بەقوربان و لەدەورگەڕان دەستی پێکرد، پاش نەختێ هەموو گوتیان: باشە ئەی مەسەلەی ئەم پاڵتۆیە چییە؟"

ئامە خان چای سێیەمیشی نیوە کردو گوتی: وای باوکە سەرم چەند ژان ئەکا، دەی باشە، لە ڕێگا بارانێکی زۆری لێداین هەموو جلەکانمان بوبو بە ئاو، لەشم لەسەرمانا ئەلەرزی چۆقەی دانم ئەهات و زۆر بێحاڵبووم، کە گەیشتینە کونە ماسی و ئەو ناوە، منیان بردە چایخانەیەک لەگەڵ دوو ماڵی تر کە پێکەوە لە سلێمانی دەرچوبوین، چەند مناڵێکیشیان پێبوو، کافر ئاگری تێبەرئەبوو بۆیان، ئۆف خوایە هەقیان بسەنیت (لەگەڵ ئەم دوعایەدا ڕیزێ جنێوی پیسیشی بە حکومەت دا) قسەکەی تەواوکرد و گوتی: "کە چوینە چایخانەکەوە، چایخانەی چی ڕەق و تەق هیچی تیانەبوو لە دو سێ حەسیری شڕ زیاتر، دو سێ پێشمەرگە کە ئێمەیاندی بەو حاڵە بانگی یەکتریان کرد و تۆزێکی پێنەچوو، عەمریان درێژب لەگەڵ ئێوە هاتن بە چەند پەتویەک و هەندێ پیتۆڵە جلەوە بۆ مناڵەکان و ئەم قاپوتەشیان دا بە من چونکە زۆر تێکچوبوم، دوور لە ڕوتان هەر ئەڕشامەوە، کۆڵنجێکی زۆر پیسم کردبوو، ئەوەندەی ئاگام لە قسەکانیان بوو تێگەیشتم کە لەم ڕۆژانەدا مەخفەرێکیان گرتووە، جل و بەرگی پۆلیسی و پەتویەکی زۆریان دەستکەوتووە، ئینجا ئاگریان بۆ کردینەوە ونان و چایان بۆ هێنایین، بەو خوایە ئەوان ئەوەندە پیاو دڵسۆز نەبونایە لەگەڵمان، ئەو شەوە نەک هەر من یەک دوانێک لە مناڵەکانیش لە سەرمانا ئەمردین! ئەڵێن لەگەڵ هەموو ڕێبوارێک و خەڵکێکیش وا دڵسۆزانە ئەجوڵێنەوە، بە درێژایی ڕێ هەرکەسێکمان بینیوە مەدحی کردوون خوا لێمانیان نەسێنێ"

حسەین هەڵیدایە و بەگەرمییەوە گوتی: "ئینجا پورێ ئەگەر ئەوەندە باش و فیداکار و دڵسۆز نەبونایە بۆ میلەتەکەیان، ئیشیان چی بوو لەم کەژ و کێوە؟ بە سکێ تێر و بە دوان برسی، بەو خوایە جاری وا هەیە گەڵاشیان دەست ناکەوێ بیخۆن، ئەو ڕۆژە لە ئەزمەڕ شەڕ بوبو پێشمەرگە نانیان لێبڕابوو، زۆر برسی بوبون کە جاشەکانیان شکاندبوو، لە شوێنەکەیان هەندێ وشکە نان و قەراغە کولێرەی چەند ڕۆژەیان دۆزیبوەوە، گورج هەمووی کۆئەکەنەوە ئاوی لەکوڵی

پیائەکەن و ئەیخۆن، جا ئەم چەنشنە کەسانە کە نەک بەم حاڵە هەر ڕازی ببن، ئامادەشن بۆ مردن لە ڕێگەی گەل و نیشتیمانەکەیانا لە حەڵێکا کە کەس بەزۆر نەیهێناون و هەموشیان ماڵ و حاڵی خۆیان هەیە و زۆریشیان ژیانێکی تێر و تەسەلیان بوەو وازیان لێهانیوە، بۆیە ئەوەی لەگەڵ ئێوە و ئەو خەڵکە کردویانە و ئەیکەن ئەوەندە نابایەخ و ئاساییە هەر شایەنی باسکردن نییە!"

ئامەخان گوتی: " من هەقم نییە بەسەر ئەم قسانەوە و تا ماوم دوعای سەرکەوتنیان بۆ ئەکەم و قەت نەشمزانیوە کەوا پێشمەرگە ئەوەندە کوڕی باش و دڵسۆزن بەرامبەر خەڵک، وامئەزانی هەر شەڕ ئەکەن لەگەڵ حکومەت و بەس!"

ئاخر پورێ ئەان شەڕەکە بۆ کێ ئەکەن؟ ئەگەر بۆ ئەو خەڵکە نەبێ؟ ئینجا کە ئەوان ئێستە باش نەبن لەگەڵیان چۆن باوەڕیان پێئەکرێ کە دوای سەرکەوتن باش ئەبن؟ نیشتیمان پەروەری باش هەر ئەبێ وابێ...؟

تۆفە گەڕایەوە لای کاک عەلی کەچوبو مژدەی بۆ بەرێت و ڕویکردە ئامەخان و گوتی: تۆ جارێ لەوە گەڕێ با بزانین بۆ ئەوەندە دواکەوتیت ئامر مەخفەر؟ ئەوە بۆ دوو مانگ ئەچێ کە تۆ ئێرەت جێهێشتووە؟

" بڕوا بکە کە زۆر بیری ئێوە و ئەو کەژ و کێوەشم ئەکرد، بەڵام حاجی و کاکە حاجی ئیزنیان نەئەدام و هەروەها کەسو کاریش بوون ئەهاتن سەریان ئەدام، ئەوەندە سەرقاڵ بوبوم بەهەزار حاڵ توانیم ئەو نەختە شتەتان بۆ بکڕم و خۆم ئامادە بکەم، ئیتر هەروا فریا کەوتم تۆفەبەگ!"

دوای دوو ڕۆژ سەبری هات بۆ لای پوری بۆ بەخێرهاتنەوە کردنی ئەوو چاو دڵڕونی دایکی و ئەوان و چارەکردنی مەسەلەی حسەین و نەسرین. دیسانەوە بێستون خۆی تێهەڵقورتان. بەپەلە ژور و هەیوانێکی بۆ بوک و زاوا پەیاکرد لەنزیک ماڵی خۆیانەوە و هەر زو وەستاشی بردە سەر و هەرچی کون و کەلەبەرێکی تیابوو بۆی چاکردن، شیروان و عەلیش ناوماڵیان بۆ کڕینو حەپسەخان و سەبریش ماڵەکەیان بۆ ڕێکخستنو ئێوارەیەک نەسرین برایە ماڵی خۆی و ئەوانیش لەم دڵو کوتییە ڕزگاربوون.

بێستون و دایکی هەر بەڕێوەبوون، بەتایبەتی کە نەسرین و حسین بوون بە دراوسێیان، بێستون ئەوەندەی تر دڵی خۆشبوو بەوەی کەوا ماوەی هاتوچۆکردنی زۆرتر و خۆبردنەپێشەوەی زیاتر دەستکەوت تاوەکو زوتر لە ڕوناک گیان نزیکبێتەوە.

## ٢٤

ئێوارەیەک کوڕەکان  چەند برادەرێکیان لەماڵی حەپسەخان لە دەوری سۆپاکە دانیشتبوون، تۆفەش کردبووی بە ڕۆژی خۆی، باسی لوبنان و ئوردنی بۆ کردن ناوی ئەو ژنە گۆرانیبێژانەی بۆ ئەژماردن کە حەزیان لێکردبوو و ئەمجارە ناوی دوانی تریشی خواستبووە سەر ئەوانەی جارانی.

حسەین کە ئەوەندەی توانیبوی خۆی گرتبوو کە نەداتە پڕمەی پێکەنین گوتی: "کاکە تۆفە گیان خۆ تۆ هەموو جارێک هەر باسی دوانت بۆ ئێمە ئەکرد، بزانم ئەمجارە بوون بە چوار؟ تۆفە بە توڕەییەوە گوتی: "چەند جار ئەڵێم کە من قسە ئەکەم حەز ناکەم کەس قسەکەم پێببڕێت، ئەو جارانە بیرم ئەچوو، وا ئێستا بیرم کەوتەوە، ئەوە چی تیایە؟ کەس هەیە شتی لەبیر نەچێت یان غەڵەت نەکات؟"

دانیشتووەکان هەموو وەختەبوو ببورێنەوە لەبەر پێکەنین، بەڵام کەسیان نەیئەوێرا دەربیبڕێ لەبەر تۆفە، چونکە جگەی لەوەی کە ئێستە هەرچی نەشیایە و نەکرایە پێی ئەکردن، ئیتر قسەشی بۆ نەئەکردن، ئەوانیش قسەکانی تۆفە سەرچاوەی خۆشی و ڕابواردنیان بوو، جاری وا هەبوو هیچ فیلمێکی پێکەنینی نەئەگەیشتێ، بۆیە زۆر مەراییان ئەکرد و وایان پیشان ئەدا کە هەموو قسەکانی نەستەق و ڕاست و خۆشن و بە دڵ گوێیان لێئەگرت و هەوڵیان ئەدا کە زۆرتر قسەیان بۆ بکات و باسی ڕابواردنی خۆیان بۆ بگێڕێتەوە. ئەمان لەم بەزم و پێکەنینەدا بوون کە لە دەرگایان دا، نەورۆز ڕاپەڕی و چوو بزانێ کێیە، گەڕایەوە کاغەزێکی بەدەستەوە بوو دایە دەست عەلی و گوتی:"ئەمە بۆ تۆیە ئەحمەدی پێشمەرگە هێنای، لەگەڵیشی خەریک بووم کە بێتە ژوورێ، نەهات گوتی ئیشیکەم هەیە."

عەلی کاغەزەکەی بە پەلە کردەوە و کوڕەکانیش بێدەنگ بوون و چاویان بڕییە دەمی بزانن چی تیایە. عەلی چاوێکی بە کاغەزەکەدا خشان و تۆزێ دەموچاوی تێکچوو کاغەزەکەی پێچایەوە و خستییە گیرفانی و دەستی دایە کڵاو و جامانەکەی و گوتی:

- "کوڕینە هەستن با بڕۆین"

بێستون گوتی: "ها کاکە عەلی خێرە؟"

- با جارێ بڕۆین بۆ (مەقەڕ) ئینشاللا خێر ئەبێت.

لەگەڵ ئەوەشــا کە کوڕەکــان گەرمــی ژورەکە و دانیشــتنەکەیان ئەوەنــدە لا خۆشــبوو خــوا خوایــان بــوو هەروا بمێنــنەوە، بەڵام هەمــوو گــورج ڕاپەڕیــن و چەکەکانیــان کــردە شــان و بێــدەنگ پێڵاوەکانیــان لەبەر دەرکــی ژوورەکەدا دایانکەدبوو، لە پێ کردەوە.

حەپســەخان و ئەوان کە لە ژوورەکەی بەرامبەریــان بــوون لە ورتەوترپەیــان تێگەیشــت کە نیــازی ڕۆیشــتنیان هەیە، بۆیە ســەرێکی کێشــایە دەرێ و گــوتی: "ئەوە ئــۆغر ئەکەن؟ بــۆ وا زوو؟" عەلــی لێــی چــووە پێشــەوە و گــوتی: " دایە میوانمان هاتووە ئەبێ بڕۆین" دایکی بە ماتییەکەوە گوتی:

"ئەی تۆ بۆ ئەڕۆیت ئەی ئەمشەو نۆرەت نییە کە لە ماڵەوە بنویت؟ بۆچی بەم سەرمایە ئەچیت و دێیتەوە؟ وا حسەین ئەڕوات ئەو هەمو برادەرانەشتان لەوێن ئیتر میوان هاتن تۆی بۆچییە؟"

عەلــی پەلەی بــوو بەڵام لەبەر دایکــی وا پیشــان نەدا و گــوتی: تــازە خــۆم کۆکردۆتەوە، ئەڕۆم بەخێرهاتنێکیان ئەکەم و ئەگەڕێمەوە".

ئەوان ڕۆیشــتن تــۆفەش شــوێنیان کەوت، زانــی شــتێک قەومــاوە، دڵــی کەوتە مەراقەوە.

گەیشتنە بارەگا، برادەرانیان شپرزە بووبوون، ئەوەی لەســەر بێتەلەکەبوو، هەر قســەی وەرئەگــرت و یەکــێ لە تەنیشــتییەوە بــوو ئەینوســییەوە.. لە ئەنجامــا دەرکەوت کەوا حکومەت هێرشــێکی زۆر گەورەی کردوەتە ســەر چەمی ڕەزان و هێزێکــی زۆریشــی بەڕێــوەیە بەرەو ســلێمانی، بــۆیە ئەبــێ لە هەمــوو بارەگاکانەوە پێشمەرگە بنێرن تا بە زووی بە فریای پێشمەرگەی ئەو ناوچەیەدا بکەون، کەوا بەو هێزە کەم و چەکە خراپانەیان شەڕێکی قارەمانانەیان کردووە لەگەڵ هێــزی زۆر و پــڕ و تــازەترین چەکــی دوژمنــی درنــدەدار و زۆریــان لێکوشــتوون و برینــدار کــردوون و لە خۆشــیان تەنهــا چــوار پێشــمەرگە شەهیدبوون.

بارەگــا کەوتە کــۆکردنەوەی پێشــمەرگەی نــاوچەکە و بەپەلە ناردیــان بە دووی ئەوانەشــا کە بە ئیجــازە چووبــوونەوە بــۆ مــاڵی خۆیــان و گــورج نــاوی ئەو پێشــمەرگانەیان بڵاوکــردەوە کە ئەبــوو بەو شــەوە بــکەونە ڕێ بەرەو چەمــی

ڕەزان، نـــاوی عەلـــی و حســـەین و بێســـتون و نەورۆزیـــش لە ڕیـــزی ئەو ناوانەدابوون کە ئەبوو بچن بۆ جەبهە.
تۆفە خێرا خـۆی گەیانـدە مـاڵێ. حەپسـەخان و خوشـکی زۆر شـپرزەبووبوون لەوەی کە پێشـمەرگەکان وا بەپەلە ئەڕۆن بـۆ (مەقەڕ) لە شـپرزەییدا جێیـان بە خۆیان نەئەگرت، بە نۆرە ئەهاتنە بەر دەرگا ئەیانگوت: " بە خوا شتێک قەومـاوە کوڕەکان زۆر بەپەلە و شپرزەیی ڕۆیشتن، حەپسـەخان خەیـاڵی ئەکردەوە "تۆ بڵێـی خەبەری تەیـارە نەبێت کە بەیـانی بێتە سـەرمان، بەڵام نە، بـۆ تەیـارە وا شپرزە نـابن، عەلـی زۆر تێکچووبوو، ئەترسـم وەکـو ئەو ڕۆژە بـووبێ کە دوو پێشـمەرگە دەمەقاڵێیـان بووبـوو خەریـک بـو بیکەن بە ناخۆشـی و شـەڕ، هـاتن عەلییان بانگ کردا. نە ئەمەش ڕێی تێناچێ ئەو هەمـوو مەسئول و لێپرسـراوەی لێـــیە، بـــۆ ئەنێـــرن بە دووی عەلـــی و ئەوانـــا؟" ئەم خەیـــاڵانە بە تەواوی حەپسەخانیان شڵەژان، لەپڕ خورپەیە هـات بە دڵیا و گـوتی: "حـاجی یا بـراکەی شتێکیان لێنەهاتبێ؟" خوشکیشی هەر وەکو ئەو لەم چەشنە خەیاڵانەدا بـوو، کە تۆفە هات بەرەو ماڵ و ئامەخانی دی لە ناو دەرگـاکەدا وەسـتاوە پێیگـوت: ئەوە بۆچی لێرە چەقیویت بەم سـەرمایە؟ تـاقەتی نـرکە و نـاڵەی نەخۆشـیتمان نیـیە بـڕۆرە ژوورەوە" ئەویش گـوتی: وەڵا تـۆفە دڵـم زۆر کەوتە مەراقەوە ئەوە چـی بوو وا کوڕەکان بە هەڵەداوان هەستان و ڕۆیشتن؟"
تۆفە بە ماتییەکەوە گوتی:
"هیچ نییە هیچ نییە، تۆ جارێ وەرە ژوورەوە.."
حەپسەخان و ڕوونـاکیش لەگەڵ نەسـرین کە ئەو شـەوە لەگەڵ حسـەین هـاتبوو بۆ لایـان هەمـوو بە پەلە چـوون بەپیـر تـۆفەوە و بە پەرۆشـەوە سـەریان کـردە سەری و ئەیانویست بزانن چـی قەومـاوە، تۆفەش خـۆی لە خۆیـا خەریـک بـوو لێک بێتەوە لە داخی هێرشەکە و هیی کوڕەکان کە ئەبێ بچن بۆ شـەڕ، خەفەتـی چـوار شـەهیدەکەش خـۆ ئەوە لە هەمـوو دۆخێکـی کەی گرانتربـوو، سـەرباری ئەمانەش ئەترسا لەوەی کە ئەگەر مەسەلەکە بە ڕاستی و دروستی بۆ ئەمانیش بـاس بکـا، ئـاخۆ ئەبـێ چیبکەن، بۆیە دۆش دامـابوو، حەپسـەخان بە تـوڕەییەوە گوتی: چیتە ئەوە بۆچی قسە نـاکەی دڵمـان شـەقی بـرد، هەرچییەک بـووە بیڵێ، مردین!!"

تۆفە دەمی تێکەڵوپێکەڵ بوو ئینجا نەسرین هێرشی بۆ برد، ئەویش ئیتر چاری نەما و پێیگوتن، کەوا شەڕە لە چەمی ڕەزان میری هێرشێکی زۆر گەورەی کردۆتە سەریان و هێزێکی گەورەش بەڕێوەیە بەرەو سلێمانی. پێشمەرگەی ئێرەش ئەبێ بچن یارمەتییان بدەن"

حەپسەخان سڕ بوو دەمی وشک بوو بە ئاشکرا گوێی لە تەپە تەپی دڵی بوو، بۆ ئەوەی نەکەوێ هەر لە شوێنی خۆی دانیشت و بە دەنگێکی گریاناوییەوە پرسی: عەلی و حسەینیش؟ (تۆفە سەرێکی بۆ لەقان) ئینجا پرسی: ئەی نەورۆز؟" تۆفە بە دەنگێکی نزم گوتی: "ئەویش" ئامە خان لەم کاتەدا هێشتا هەر لە حەوشە دەستی هەڵبڕیبوو بۆ ئاسمان دوعای ئەخوێند و بە چواردەوری خۆیا فووی ئەکرد و ناوی کوڕەکانیانی یەکە یەکە ئەهێنا ئاگای لە قسەکانی تۆفە نەبوو، کە گوێی لە شینوشەپۆڕی کچەکان بوو، هاتەوە لایان و قۆڵی تۆفەی ڕاکێشا و قەمسەڵەکەی بادا و گوتی: "مەعز بۆ خوا!! وا دڵم ڕاوەستا پێم بڵێ چی بووە؟"

تۆفە هەڵچو گوتی: " ئێستە ڕوو بکەمە چ لایەک؟ قیبلە کامەتا؟ خوایە چۆن منت تووشی ئەم شێتانە کرد ئەگەر قسە ناکەیت، ئەکەونە سوێندان و قورئان هەڵبڕین، ئەگەر قسەش ئەکەیت ئەم لەملاوە ئەبورێتەوە و ئەو لەولاوە زمانی ئەشکێت؟؟!.

ئامەخان گوتی: "زوو قسە بکە وا ئەژنۆم شکا! تۆفە بۆ ئەویشی گێڕایەوە، ئەویش تا خواهێزی دابوویە بە هەردوو دەستی کێشای بە سەریدا و گوتی: "ئێستە هەموو مناڵەکانمان ئەبێ بچن؟" تۆفە گوتی: "ئەی چی ئەرێوەڵا ئەبێ هەموو بڕۆن بۆ شەڕ، ئەی فەرقیان چییە؟ هەموو هەر پێشمەرگە نین؟ وا ئێوە لێرەن و ئەزانن، ئەگەر دایک و باوکی ئەوانیش بزانن کەوا کوڕەکانیان ئەچێن بۆ شەڕ لە ئێوە خراپتر ئەکەن، چونکە کوڕەکانی ئەوانیش وەکو هینەکانی ئێوە خۆشەویست و نازداری لای دایک و باوک و کەسیانن، لەبەر ئەوەشە کە ئەم کوڕانە هەموویان بە ئارەزوو ڕەزامەندی خۆیان هاتوون و خۆیان حەزیان کردووە کە ئەم ڕێگەیە بگرن و کوردایەتی بکەن، ئەبێ بشچن بۆ شەڕ و بۆ هەر شوێنێک کە ئەمریان پێ کا؟".

نەسرین گوتی: دیسان قسەی نەستەق و وەعز و نەسیحەت دەستی پێکرد؟ ئەم قسانە بۆچییە؟ دیارە هەموو هەر بە ڕەزامەندی خۆیان هاتووین و پەشیمانیش نین!"

تۆفە جگەرەیەکی خستە بەینی لێویەوە، بەدەم گەڕانی گیرفانەکانییەوە بۆ شقارتە گوتی" باشە کە تۆ ئەوەندە ئەرەستۆی دە بە دایک و پوریشت بڵێ کەوا لە خۆیان نەکەن و بیدەنە دەست خوا و ئەجەلیش بەدەست خوایە، بە خوا ئەوەی ئەجەلی هاتبێت بیخەنە ناو شووشەی (فەرعان)ەوە هەر ئەمرێت، ئەوی ئەجەلیشی نەهاتبێت بیخەنە بەر هەزار گوللە و بۆردوومان هەر هیچی لینایەت! گوێ مەدەنێ و دوعا بکەن خوا ئاگای لە هەموویان بێ و سەریانخات بەسەر دوژمنەکانیانا، چونکە شەڕی حەق ئەکەن! ئەگینا وەکوتر قسەی کەسی پێناوێت، ئەوان خۆیان هاوار ئەکەن: یا کوردستان یا نەمان".

ڕووناک مات و مەلول لەبەر پەنجەرەکەدا وەستابوو: (ئەی بۆچی باسی بێستونی نەکرد تۆ بڵێی ئەویش بڕوات؟ بە خوا عەیب نەبوایە ئێستە لە تۆفەم ئەپرسی، بزانە هەر ناویشیان نەبرد! کە لە کوڕەکانیشیان باشتر و بە خزمەتترە بۆیان، دەی قەیناکە من ناهەقیان ناگرم زۆر شڵەژاون... ئای خوایە ئەمە چ شەوێک و چ خەبەرێک بوو؟؟)

ڕووناک لەم مشتومڕەدا بوو لەگەڵ خۆی کە وەک بێگیانێکی لێهاتبوو کە دەنگی دەرگا هات.

کوڕەکان هاتنە ژوورێ: ئامەخان لە لایەکەوە گرمۆڵە بووبوو، دیسانەوە پشتێنە حەوت گەزییەکەی بەستبوو کە بۆ ناوک کەوتن ئەیبەست و سەریشی جەڕاندبوو و بە کزی دانیشتبوو، هەردوو ئەژنۆی گرتبووە باوەش، نەسرین لەولاترەوە بە دزییەوە ئەگریا، ڕووناک ئەوەندەی تر چاوی کرا بووەوە لە ترسانا و ئەویش بێدەنگ و ڕەنگ هەڵبزڕکاو بوون، تۆفەیش مژی گەورەی ئەدا لە جگەرەکەی و تۆزێ دوکەڵەکەی لە سنگیان ئەهێشتەوە و دوایی لەسەرخۆ و بە هونەرنیشاندانێکەوە لە هەردوو کونەلووتییەوە دەیهێنا، وەک و دوکەڵکێشی سوپا.

بەم دیمەنەدا کوڕەکان تێگەیشتن کەوا تۆفە مەسەلەکەی بە ئافرەتەکان گوتووە، وەکو شتێک ئەمەیان پێخۆش بوو، چونکە ئەرکێکی گرانی لە کۆڵ کردنەوە کەوا دامابوون بەدەستییەوە، نەیانئەزانی کامیان پێیان بڵێن و چۆن و چییان پێبڵێن؟

عەلی بە پێکەنینێکەوەو وەک ئەوەی کە پیشانی بدات کە هیچ نەقەوماوە و ئەمان زۆر تەبیعی و لەسەرخۆن، چوو بە لای دایکییەوە و دەستێکیدا لە ڕومەتییەوە و گوتی:

"ئەوە چییە دایە گیان بۆ وا دڵتەنگی؟ ئینجا ئاورێکی دایەوە لە پوری و گوتی: هەی هەی! ئامر مەخفەر هەروا ئەبێت، ئەمە چییە؟ ئەوە بۆ واتان لە خۆتان کردووە، خۆ ئێوە لە کن خۆتان موسڵمان و نوێژکەرن و بڕواتان بە خوا و قەزاوقەدەر هەیە! کەچی لەباتی ئەوەی دوعای خێر و سەرکەوتنمان بۆ بکەن، سەیریانکەن هەموو بە جارێک ورەیان بەرداوە!؟ جارێکی تر چووە لای دایکییەوە و گوتی: ئەرێ ئەوە قسەکانت چییان لێهات؟ بیرتە کە ئەتگوت ئەیکە من نەیکەم و تۆ نەیکەیت و ئەو نەیکا کەواتە قسەی زلیش مەکەن، با هەروا سووک و سەرشۆڕ بین بەرامبەر بەو هەموو زوڵم و زۆرە ، وردە وردە میلەتەکان بتوێننەوە و زمانەکەشمان لە بیربەرنەوە!! ئەمە قسەی کێبوو؟"

دایکیشی هەر چاوی ئەسڕییەوەو بێدەنگ ئەگریاو هیچ جوابێکی نەئەدایەوە.

عەلی هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: " ئەم نوکە نوک و گریانەی پێناوێ، ئەگەر لە قسەکانت پەشیمانی فەرموون خۆتان کۆبکەنەوە با بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی، خۆ کەس بەزۆر نەیهێناوین، خۆمان هاتوین وەک ئەو خەڵکە، ئێمەش ویژدان و پیاوەتی نەیهێشتووە کە دانیشین بە سەرکزی و ملشۆڕی، دەی ئەڵێن چی؟؟ بەو خوایە کەسەر من و حسێن ئەچینە سەر دوکان و کاری خۆمان نەورۆز و بەختیاریش ئەگەڕێنەوە سەر مەکتەبەکەیان، حکومەتیش هەر ئەوەی ئەوێ لێمان کە بچین بڵێین تۆببە، هەقی نە کورد و نە کوردایەتییمان نییەو لەگەڵ ئێوەین؟!، دەی ئەڵێن چی؟؟."

دایکی جوڵە جوڵێکی پێکەوت، پوری دەستی برد بۆ سەرری وەکو ئەوەی بیەوێ بزانێ باش سەری بەستووە! تۆفە کۆکە گرتی دیسانەوە عەلی گوتی:

- دەی جواب بدەنەوە، سبەینێ ئەڕۆنەوە؟ ئیتر بزانین بە خێر و سەلامەتی ئەمانکەن بە جاش یان جاسوس!؟.

حسەین بە پێکەنینەوە گوتی: لام وایە من بە کەڵکی جاشێتی بێم، بەڵام تاقەتی سوڕانەوەم نییە بەم کۆڵان و بەو کۆڵانا بەدوای ئەم و ئەوا (دیسان پێکەنی و گوتی: ئەو ئیشە ڕەنگە بۆ بەختیار و نەورۆز چاک بێت چونکە سوکەڵەن!!"

ئامەخان خۆی گورچ کردەوەو بە توڕەیی گوتی:

"ئەی بەزیادی خێرم نەکرد (ڕیزێ جنێوی مزریدا بە میری و جاش و جەیش و جاسوس) ئینجا گوتی: وەلێ خوا نەکردە ئەوسا بە دەستی خۆم هەردوکتان ئەکوژم."

عەلی بەم قسانە دڵی خۆشبووڕوشی کردە دایکی و بە پێکەنینەوە گوتی: ئینجا حەپسەخان ئەبێت بە دایکی جاش و جاشولکە!" دایکی بەلکی سەرپۆشەکەی چاوی سڕی و گوتی: خوا ئەو ڕۆژەمان پیشان نەدا، یاخوا هەموومان بە ڕۆژێک بمرین و وامان بەسەر نەیەت!!"

"ئەی چی؟ ئەگەر حەزبکەین پێشمەرگەبین و خەبات بکەین و لەسەر حەق و شەرەف و ناموسی خۆمان و خەڵکی وڵاتەکەمان بکەینەوە ئەوە ئەبێت بچین بۆ شەڕ و بکوژین و بشکوژرێین ڕەنگە هیچیشمان لینەیەت! ئەڵێن میری تۆف و تانک و تەیارەی هەیە ئینجا ئەگەر ئەم چەکانە یا هەرچەییەک هەموو شتێک بووایە خۆ ئەبوو خەباتی تاقە یەک میللەتیش لەو دنیایە سەرنەکەوتایە چونکە هەموو ئەو حکومەتە زۆردارانەی کە گەلە زۆرلێکراو و چەوساوەکان شەڕیان لەگەڵکردوون و ئەکەن چەکی بگرە زۆر لەمەی ئەم حکومەتە زۆردارەی ئێمە زیاتر و چاکتر و لەشکری ڕێکوپێکتر و زۆرتریشییان بووە لەگەڵ ئەوەشا ئەوان هەر ژێرکەوتون و گەلانیش بە درێژایی تەئریخ لە ئەنجاما سەرکەوتو بوون. سەرەڕای ئەمە ئێمە شارەزای هەموو ڕێگەوبان و کون و کەلەبەرێکی وڵاتە شاخاوییەکەمانین کە ئەوان وەک و کوێر وان، بۆ ئیسپاتی قسەکانم ئەوە ئەزمەڕ بڕۆ سەیرکە پڕە لە لۆری عەسکەری سوتاو و دەبابەی شکاو، تا لە پێچێک دەرباز ئەبن پێشمەرگە پێچێکیتریان لێئەگرێت، ئەوجا سەری شاخیان لێئەگرین و گۆڕی بابیان ئەسوتێنین، ئێمە ئەم هەموو شاخ و کێو و ئەشکەوت و پەنا و پاسارانەمان هەیەکە ئەوان نەک هەر ڕێپێنابەن سەرشێتیش ئەبن تیایا، ئیتر ئەوە بۆچی ئەوەندە ترساون، لەم دوژمنە خوێڕییە؟. دەی هەستن ئیتر ناوی خوای لێبێنن با ئێمەش خۆمان کۆکەینەوە و بڕۆین، بێگومان ئێستا لە بارەگا چاوەڕوانمانن".

ڕوناک، بە درێژایی وەخت گوێی هەڵخستبوو، بەشکو ئەمە خوایە باسی بێستونیش بکەن، بەڵام بێستونیش هەروەک ئەمان چوبو دایک و باوکی هێمن بکاتەوە. ئەوانیش سەری دنیایان لێهاتبوەوە یەک، دایکی ئەگریاو باوکی قسەی پێنەمابوو لەتاو کوڕەکەیان، ئاوان زوتر لە حەپسەخان و ئەوان زانیبوویان کوڕێکی خزمیان کە پێشمەرگەبوو چوبو پێیگوتبوون لە کاتێکدا بێستون و کوڕەکان لە ماڵی حەپسەخان بوون و بە قسەکانی تۆفە پێئەکەنین

کوڕەکان ئەگەرچی کە دایکەکانیان بەم حەڵە ئەبینی بەزەییان پیایانا ئەهاتەوە، بەڵام ناچاریشبوون ئەبوو بڕۆن، تا زوو بگەنە هاوڕێکانیان و دوانەکەون. عەلی چوو بەلای دایکییەوەو دەستی کردە ملی و گوتی: "ئیشەڵا چەند ڕۆژێکیتر بە سەرکەوتویی و بە سەلامەتی ئەگەڕێینەوە بۆلاتان" سەری دایکی نا بە سنگییەوەو بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: "زۆری نەماوە.. هەر ئەم سەرماو سۆڵەیە نەمێنیٚ، ئەنێرم کوردۆ و دایکیشی بێن بۆ لات، ئیتر لە خۆشی ئەو سەگبابە ئەزانم کەسمانت لەبیر نامێنیٚ!" دایکیشی دوو دەستی تەزییوو لەرزۆکی لە ملی ئالاندو وەک و منالٚ دایە هاڕەی گریانێکی بەرز و بەکولٚ و دلٚ. ئینجا لەگەلٚ حسەین و نەورۆزیش دوعاخوازییەکی وای کرد، خوشکیشی لەو دلگیرانەتر بەڕیی کردن، ئیتر کوڕەکان هەر وەک و شتیٚ خۆیان ڕاپسکان لە دەستییان.. هەرچەندە دلٚیشیان پڕ ببوو بۆیان، بەڵام چاریان نەبوو هەر ئەبوو بڕۆن بە پەلە بگەنە هاوخەباتەکانیان، چونکە ئەو ڕێگایە خۆیان هەڵیانبژاردبوو گرتبویانەبەر هیچ هێز یان عاتیفەیەک نەبو بتوانیٚ لایانبدا لیٚی یان پێیان بگۆڕێت، وە یان کاریان تێبکا. بۆیە زۆر بە پەلە چونە دەریٚ و لە حەوشەو هەیوان دەستیان کردە ملی ڕوناک، حسەین لای خۆی ئەیویست هەندیٚ ئامۆژگاری بکات کە ئاگای لە دایکی و پوری بێت، بەڵام کە چاوی بە فرمێسکی نەسرین کەوت، چۆن بێدەنگ وەک پلوسک بەسەر ڕومەتیا دێتە خوارەوە، بۆی نەهات خۆشی نەیئەزانی چی ئەڵێت!.

تۆفە شوێنیان کەوت تا بارەگا بێئەوەی گوێبداتە عەلی، کە پێی ئەگوت بچیتەوە مالٚی لای دایکی و ئەوان. بەڵام چونکە عەلی ئەیزانیی کەوا تۆفە خۆی حالٚی لەوان باشتر نییەو هەر ئەوەیە کە ئەم ڕوی نایە بگری بۆیە لەگەڵی نەوت.

ئەوەندەی پێنەچوو بێستونیش دەرکەوت. کە لە دورەوە چاوی بە عەلی و ئەوان کەوت پشتیان لەوە و بەرەو بارەگا ئەڕۆن، نەختیٚ خوای دواخست بۆ ئەوەی نەیبینن و بە بیانوی هەواڵپرسینی ئەوانەوە سەرێک لە حپسەخان و ئەوان بدات و خواحافیزیان لەگەلٚ بکات و نەختیٚ چاویشی زاخاو بدات بە بینینی ڕوناک گیان! . بێستون خۆی کرد بەماڵاو بە گەرمی هەواڵی عەلی و ئەوانی پرسی و کەدی هەموو مات و خەمگینن کەوتە دلٚدانەوەیان و باسی

ئازای دایکی بۆکردن کە چۆن دەستی داوە بە پشتیا و بەخۆشییەوە بەڕێی کردووە .. وە گوتی " هەموو کەسوکاری ئەو پێسمەرگانەی ئەم ناوەش هەروەک و دایک ئەم کوڕ و خزمەکانیان بەڕیئەکەن، کە ئەچن بۆ شەڕ، بۆیە هەر بۆ کاک عەلی و کوڕەکانیش جوان نییە کە ئێوە وا خەم و خەفەت پیشان بدەن، ئەوە کچەکان قەیناکە، بەڵام حەپسەخان ئەمە لە تۆ ناوەشێتەوە، چونکە کاک عەلی ئەوەندەی باسی ئازایی و بەجەرگی ئێوەی بۆ کردووین، هەرچەند باسی ئازایی ژنی شار ئەکرێت پێشمەرگەکان ئێوە بە نمونە ئەهێننەوە، هەق نیە وابن، تەنیا دوعامان بۆ بکەن، ئینشائەڵا ئەوەندەی پێناچێت بەسەربەرزی ئەگەڕێینەوە بۆلاتان هەر زو زوش خەبەرتان بۆ ئەنێرین دڵتان هیچ نەکا".

قسەکانی بێستون هەندێ هیواو ئارامی خستە دڵیانەوە بە تایبەتی کە دییان وا ئەویش ئەڕوات بۆ شەڕەکە، ئەویش لای دایک و باوکی خۆی نازدار و خۆشەویستە و ڕۆحیان وا بە موییەکی سەریەوە، ڕوناکیش کە لە لایەکەوە هەڵتروشکابوو لە ژێرەوە هەر سەیری بێستونی ئەکرد و دڵی بۆ ئەویش ئەگوشرا.

بێستون دوعاخوازی لێکردن، ئەوانیش بە گەرمی بەڕێیانکرد، ئامەخان هەر لە حەوشەکە مایەوە، ئایەتە کوردسی ئەخوێند و لە خوا ئەپاڕایەوە، جاری وا هەبوو ئەگەیشتە نیوەی ئایەتەکە و لەبیری ئەچو حاڵی وایەو هێشتا لەو حەوشەیەدا بەوسەرمایە هەر دێت و ئەچێ، بە توڕەییەوە پێیگوت: "ئەوە هێشتا هەر لێرەی، لا حەولە وەلا..! کچێ دایکم هیچ نەبێ وەرە هەیوانەکە خوا لە هەموو شوێنێکە، لە کونی ژورەوەش هەر ئاگای لە خۆت و دوعاکنتە!!".

ئامە خان توڕەبوو گوتی: ئەترسی لەوەی کە بەم تۆزە ڕاوەستانەم لێرە سەرمابێ؟ ئەی دایکیان بمرێ ئەو عەزیزانەمان ئێستە چۆن بەم شەو و سەرمایە ئەکەونە ڕێ و ئەچن بۆ شەڕ و بۆ ناو گولە باران!! خوای ئەکرد ئەوەندە سەرمام ئەبوو ڕەق ئەبومەوەو ئەبووم بە بەرد".

تۆفە دەستی دا بە یەکا و گوتی: " فایدەی نییە لەگەڵی، خوا بکا ئاخری خێربێت" لێیدا چووە ژورەوەو بە پەرۆش و داخەوە گوتی: "فریای ئەو ژنە بکەون ئێستە ڕەق ئەبێتەوە ئەمرێت، لە حەوشەکەدا ڕاوەستاوەو هەر بە دەوری خۆیا ئەسوڕێتەوە، ئێوە بیگەنێ بە قسەی من ناکات!"

نەسرین و ڕوناک بە هەڵەداوان چون قۆڵی ئامەخانیان گرت و هێنایانە ژورێ.
شەوگار درەنگ بوو، سات خۆی ئەدا لە دوازدە، ئەمان هەر خەریکی قسەکردن بوون، هەریەکەیان باسێکی کوڕەکانی ئەگێڕایەوە، تۆفە گەیشتە تینی پێیگوتن: "ئەوە ئێوە نیازتان نییە ئەمشەو بنون" هەریەکەیان لە لایەکەوە پەلاماریداو گوتی: " نوستنی چی کێ خەویلێئەکەوێت" ئەگەر تۆ خەوت دێ بۆ ناچی بنوی".
تۆفە شانێکی باداو گوتی" وەڵا من لەبەر ئێوەمە ئەگینا من خۆم ئەتوانم هەر نەنوم، باشي، کەواتە با چایەک لێنێین".
حەپسەخان بە ماتییەکەوە گوتی: " وەڵا چا خراپ نییە! تۆفە پشکۆ و ئاگری لە سۆپاکە دەرهێناو نەسرین گورچ چووە بەر سەماوەر دانیشت خەریکی قۆری و پیاڵەکان بوو، ئامەخان دەستی گرت بە سەریەوەو گوتی: دەبا ئەمشەو نەڕۆیشتنایە؟! خۆ ئەوان بەیانی ئەکەونە ڕێ بۆچی لە ئێستەوە چوون؟ نەورۆز گوتی: "ئیمشەو لە منکە ئەنون.".
تۆفە لێوی خۆی گەست زانی کە نەورۆز لەبەر دڵی دایکی وایگوتووە، ئەگینا هەر شەوەکەی ئەکەونە ڕێ بەرەو جەبهە، لەم قسانەدا بوون دەنگی دەرگا هات، تۆفە چوو کردیەوە بەختیار هاتە ژورێ و گوتی: ئۆغریان کرد".
تۆفە گورج پەنجەی خستە سەر لێوی و گوتی: لەڕێی خوا لای ئەوان وا مەڵێ، بڵێ بەیانی زوو ئەڕۆن، شەو لە بنکە ئەنون، ئەگینا تا بەیانی حەیئەلامان بۆ ئەکەن خۆشیان ئەکوژن!"
بەختیار سلاوی کرد و دانیش خۆیگەرم کردەوەو چایەکی خواردەوە ئینجا باوێشکێکیداو گوتی: "هەستن با بنوین شەو زۆر درەنگە.. ئەوانیش هەموو لە مەقەڕ لاڵ و پاڵ لێیکەوتن، منیش بۆیە هاتمەوە گوتم با بۆ خۆیان بنون".
ئەمانیش گوتیان: "کەواتە با ئێمەش هەستین بنوین، بە ماتی و کزی چونە سەرجێگاکانیان، نەسرین ئەیویست خۆی بەورەتر نیشان بدات بۆیە بەرلەوەی بچێتە ناو جێگاکەیەوە بە گورج و گۆڵی ماڵەکەی کۆکردەوەو قۆری و پیاڵەکانیشی شت، بۆ ئەوەی بەشکو بەدەم ئیشکردنەوە بتوانێ نەختێ خەمی دڵیخۆی دامرکێنێتەوە، بەلام وادیاربوو سەرینەگرت چونکە تەنانەت کە هات بنوێ لەژێر لێفەکەیشەوە هەر ئەگریا بەئەسپاییو خەیاڵیسی بەدوای حسەین و ئەوانیترەوە بوو!

ڕوناکیش حاڵی لەو باشتر نەبوو، بەخەیاڵ پێش براکانی کەوتبوو و چوبووەوە ناو شەڕەکەوە. کە ئەمدیو و ئەودیوی کرد لە دڵی خۆیا گوتی: " تۆ بڵێیت، خوا نەکردە گوێی شەیتان کەڕبێت کاک عەلی و ئەوان یەکێکیان لەم شەڕەدا شتێکیان لێبێ و ئیتر نەیانبینینەوە؟ :لەپڕ وەکو کفرێکی کردبێ داچڵەکی و گوتی: " دەک خوا بمکوژێ بۆ خۆم و بیرکردنەوەم! وەیش خوا نەکا یاخوا بەقوربانیانبم، هەر بەڵایەک بۆ ئەوان دێتە خوارێ لە من بکەوێت! فایدەی نییە خۆ خەوم لێناکەوێبا بیر لە شتێکیتر بکەمەوە. ئێستا ئاخۆ باوکم حاڵی چۆنبێت؟ دیارە زۆرمان بیرەکات.. ئەوە چۆن ئەم هەموو وەختە لێی دورکەوتومەتەوە، بەڕاستی ئەم دنیایە سەیرە ئاخر کێ بەخەیاڵیا ئەهات من بتوانم نەک حەوت هەشت مانگ بگرە حەوت هەشت ڕۆژیش لێیدوربکەومەوە؟! خۆ ئێواران کە ئەهاتەوەو دەرگام لێئەکردەوە باوەشمپیائەکرد، ئەتگوت حەوت ساڵ نەمدیووە! ئای باوکە ئەگەر ئێستە بزانێ کە کاکە عالی و کاکە حسەین و کاکە نەورۆز سبەینێ ئەڕۆن بۆ ناوجەرگەی شەر ئاخۆ چی ئەکات؟ بەڵام شکور نازانێت" ڕوناک لەپڕ خەیاڵی ئەگەڕایەوە بۆلای ئەوانەی ئەچن بۆ شەڕ ئینجا بێستونیشیان لەگەڵبوو، وەک پەردەی سینەما دیمەنەکە بە مێشکیا تێئەپەڕی: " ئەوە بێستونە گولەیەک بەر قۆڵیکەوت نەختێ خۆیگرت و کەوت بە دەما، ئا ئەوە حسەین پێش پێشمەرگەکان کەوتووە، عەسکەرەکانیان وا داگرتووە بە دەسرێژ، هەر جێبەخۆیان نەگرن.. ها ئەوە تەیارەیەک هاتە سەریان، ئای چۆن بۆیان دائەنەوێتەوە خۆ وەختە بەریانکەوێت، ئای ئەوە کەوتە شەستیر تێگرتنیان، خوا بیانپارێزێت، ئای شتێک بەر کاک عەلی کەوت" ڕوناک وەک و شێت ڕاپەڕی و هەستا و دانیشت و دەستێکی هێنا بەدەموچاویا وەک بیەوێبزانێ نوستووە یان بەخەبەرە و لەبەر خۆیەوە گوتی: "وای خوایە گیان ئەمە چیبوو؟" دایکیشی هێشتا بە تەواوی نەنوستبوو هەر خەو ئەچووە چاوی و لەپڕ ڕائەپەڕی. لەبەربونەوەیەکیا چاوی بە ڕوناک کەوت دانیشتووەو قسەئەکا لەگەڵ خۆی گورج بە پەرۆشەوە گرتییە باوەش و (بیسمیلا)یەکی کردوە گوتی:

"وای دایکت بمرێ ئەوە چیتە؟؟" لەبەر تیشکی کزکراوی چراکە ڕوناکی زۆر درەنگ بزرکاو و تێکچوو هاتە پێش چاو خێرا دەستێکی درێژکرد شەوقی

چراکەی بەرزکرد بۆ ئەوەی بزانێ هەر ڕەنگی خۆی وایبەسەرهاتووە یا لەبەر کزی چراکە وادەرەکەوێ. ڕوناک دیسان ئەمجار توندتر دەستی بە دەم و چاو و سەرو ملیا هێناو گوتی: هیچ نییە وابزانم خەوم دیبوو واداچڵەکیم!"
دایکی توند گوشیی بە خۆیەوەو گوتی:" نە بەقوربان مەراق مەکە و مەترسە لەبەر کاکت و ئەوان، خوایان لەسەربێ ئینشالآ هەموویان دو سێ ڕۆژیتر هەموویان بەسەلامەتی ئەگەڕێنەوە، ئەوە بەو مەراقەوە نوستوی بۆیە خەوی وات دیوە. دە بنوەوە گیانەکەم با خەوەکەت لێ نەزڕێ"
ڕوناک لەبەر دڵی دایکی نەیویست بڵێ خەوی چی دایە ئەوە هەمووی هەر بیرکردنەوە بوو وای لێکردم هێشتا خەو نەچوەتە چاوم! بۆیە گوتی: " باشە دایە گیانوا ئەنومەوە دە تۆش بنو" چراکەیان کزکردو مات بوون.
بەیانی هێشتا سەعات شەش نەبوبو، حەپسەخان و ئەوان تۆفەیان نارد بزانێت هێزەکە ڕۆیشتووە یان نە؟ تۆفە هەرچەندە ئەشیزانی کە هەر شەو ڕۆیشتون بەڵام بێدڵی نەکردن و بێدەنگ ملی ڕێی گرت. هەرکەسێکی پێگەیشت لەو ڕێگەوبانە هەر ئەو باسەیان ئەکرد لەگەڵ یەک، هەندێ ئەچوون بۆ (مەقەڕ) هەندێک لە یەکتریان ئەپرسی هەموو لەمەراقا بوون بۆ کوڕ و خزم و ناسیاویان. پاش نەختێ سوڕانەوە تۆفە گەڕایەوە ماڵێ و بە ڕوویەکی خۆشەوە دو سێ فیشاڵی بۆ کردن و گوتی: "ئێستە ئیتر بروسکەو خەبەریان بەردەوام ئەبێت و لە هەموو شتێک ئاگادار ئەبین!" بەم قسانەی تۆفە دڵیان نەختێ خۆشی تێکەوت و ناچاریش وای لێکردن کە خۆیان بە وەزعەکە ڕابێنن.
لای چێشتەنگاو قەتارچییەک بە دوو ئێسترەوە لەبەر دەرگای ماڵی حەپسەخان ڕاوەستا، سەبری و کچێکی چوارده پازده ساڵەیان لێدابەزی و چوونە ژورێ، هەموویان ئەم هاتنەی سەبرییان پێخۆشبوو، وە هەر زو کە ڕووی خۆشی سەبریان دی هات بە بیریان کە ئەبێت ئاگای لە شەڕەکە نەبێت و شیروانیش نەنێردرابێ بۆ (جەبهە) ئەمیش هەر بۆ سەردان هاتبێ، بۆیە ئامەخان بە ماتی لێیپرسی: " ئەی ئەوە شیروان کوا؟" سەبری لەسەرخۆ گوتی: "ئەویان نارد بۆ شەڕ و ئەویش ئێمەی نارد بۆ ئێرە تا ئەگەڕێنەوە، ئەی کاکە عەلی و ئەوان نەچوون؟" دایکی و پوری لەباتی قسە بە فرمێسک جوابیان دایەوە.

نەسرین کە لە دڵی خۆیا بەغیلی بە خۆڕاگری سەبری ئەبرد، ئەوەندەی پێکرا خەم و خەفەتی خۆی شاردەوەو گوتی: شەوێ ئەوانیان بانگ کردو هەر شەوەکەیش ڕەوانە کردن" دایکی فرمێسکەکانی سڕی و گوتی: کارت ڕاستبێ کە خۆت هاتی، دڵم زۆر لای ئێوەش بوو، خەریکبوو تۆزێکیتر تۆفە یا بەختیار بنێرم بۆ لاتان، گوتم تۆ بڵێی شیروانیش ڕۆیشتبێ!؟"

سەبری بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتی: باشە ئێوە ئەم گریان و شیوەنەتان لەچییە؟ خۆ کەس بەزۆر نەیناردوون، بە ئارەزووی خۆیان هاتونەتە ئەم کەژو کێوەوە و بۆ سەیران وڕابواردنیش نەهاتون! لەپاشا هاوڕێ و خۆشەویستەکانیان بڕۆن و ئەمان نەڕۆن! پێشینان وتەنی: ( سەرێ لەناو سەرانا نەبێ بۆ بڕین باشە) ناوی خوای لێبێنن و سڵاوات بدەن لە دیداری پێغەمبەر و دوعای سەرکەوتنیان بۆ بکەن ئێوە لە باتی دڵی کەس و کاری پێشمەرگەکان بدەنەوە، ورەیان پێبەرئەدەن!" سەبری کە لەم قسانەی بوەوە سەری لەوە سوڕما کەوا هیچ یەکێکیان نە بە چاک نە بە خراپ وەرامیان نەدایەوە، بێگومان ئەم بێدەنگییەش هۆی جیا جیای هەبوو، هەرچی وەک و دایکی بوو لە حاڵێکا نەبوو کە دەمە چیکەنەکەی سەبری لەخۆی بخاتەکار، خۆ ئامە خانیش هەر وەک و لەوێ نەبوبێت وابوو، هەر خەریکی دوعاکردن و (ئەیەتلکورسی) خوێندنی خۆی بوو، ئەوانیکەش هەندێ قسەکانی بەدڵ بوو، ئەوانەی کەوا بەدڵیشیان نەبوو نە ڕوویان ئەهات و نە کاتەکەشیان بە باش ئەزانی بۆ دەربڕینی ناڕەزایی خۆیان. بەرامبەر بە بێدەنگییە سەیر و چاوەڕوان نەکراوەکەی دایکی و ئوان سەبری داینا کە ئیتر لەسەری نەڕوا بۆ ئەوەی نەیانوروژێنێ و ڕقیشیان هەڵنەسێنێ بەوەی کە خۆی وەک و مامۆستا و ڕێپیشاندەریان پیشان بدا، چاکتر بەلایەوە ئەوەبوو کە ئیتر مەسەلەکە بۆ خۆیان بەجێبهێڵێ. بۆیە هەر بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێت کەوتە پرسینی هەواڵی باوک و مامی و ئەم چەشنە باس و خواسانە!.

***

بوو بە ڕۆژی دووهەم ئەمان چاویان لەڕێگا بوو کە بەشکو، ئەمە خوایە یەکێک بێت و خەبەرێکی کوڕەکان و شەڕەکەیان بۆ بهێنێت بەڵام کەس دیار نەبوو، ئەم بێخەبەرییەش حاڵی تۆفەی یەکجار شرکرد چونکە هەموو خەڵکیماڵەکە، سەبری لێدەرچێ، هەریەکە لەلایەکەوە پەلاماری ئەدا: یاکیان ئەیپرسی ئەوە کوا بروسکە تۆفە بەگ خۆ تۆ گوتت پەیاتا پایتا بروسکە دەنگ و باسی شەڕەکە دەهێنن؟؟ ئەویکەیان ئەیگوت:: ئەرێ ئەوە کوا قوربان تەتەرەکانت دیارنەبوون؟ ئەویش بۆ دڵدانەوە ئەوەندەی درۆ بۆ کردبوون لە بێدەنگی بەولاوە هیچیکەی بۆ نەمابووەوە، بەڵام کە دی بێدەنگییەکەی هارتریان ئەکات، ڕووی کردە بەختیار کە ئەویش تا ئەندازەیەک لە درۆکانا هاوبەشی کردبوو و جارو بار تیر و توانجەکانیان ئەوی ئەگرتەوە، پێیگوت: "نایەی بچین بۆ بارەگا بەشکو خەبەرێکی خۆشیان بۆ بێنین" کە گەیشتنە بەرد دارگا تۆفە گوتی: " ئەم ماڵە زۆر سەیرن لایان وایە ئێمە سەرلەشکرین، یاخود هەموو پێشمەرگە تەلەفۆن یاخود بێتەێکی پێیە وەکو زۆری عەسکەرە نامەردەکان، نازانن تا تەنانەت هەندێ لە بنکەکانیش بێتەلیان نییە "تەتەر"ی بەسەزمانیش هەروا پیا ڕائەگەن، بەو خوایە پیاو هەر سەری سوڕئەمێنێ لە ئازایەتی و بەجەرگی ئەوانە، بە شەو و ڕۆژ بەناو ئاگدا دێن و ئەچن و هەمیشە بەشی دە جار کوشتنیش نامەیان پێیە کەچی بێترس و بێ باک وەک پەیتووکە دێن و ئەچن ئەوجا دەنگ و باسیش بە زووی ناگاتە هەموو بنکەکان، خانمەکانی ئێمەش ئەیانەوێ هەموو هێزی پێشمەرگە و بێتەل و تەتەرەکانیان هەر خەریکی ئەوەبن دەنگوباسی کوڕەکانینا بۆ بنێرن!!.

ڕۆژی چوارەم دوای چا خواردنەوە دایکی بێستون بۆ یەکەم جار هاتە لایان ئەگەرچی کوڕەکەشی ڕایسپاردبوو کە زو زو سەریان لێبدا و دڵخۆشیان بداتەوە و زۆر ئاگای لە دڵی ڕوناک بێت، بەڵام چونکە خۆشی وەک و ئەوان بڕستی لێبڕابوو هەرچەندی ئەکرد هەناوی ئەوەی نەبوو کە بچێتە لایان و نەیئەزانی چۆن پێیئەکرێ لە دڵە ناخۆشەی خۆی قسەی خۆش دەربێنێ کە دڵی ئەوانی پێبداتەوە!!.

ئەو بەیانییە قسەکانی بێستونی بیرکەوتەوە و وەک و شێت ڕاپەڕی و لەتاو کوڕەکەی ئاگری جگەر هەڵیگرت بچێت بیانبینێت بەتایبەتی ڕوناک کە ئەیزانی

بێستون چەند دڵی پێوەیەتی، هەر بە یادی ئەویشەوە و بۆ ماچکردنی ڕوناک و بۆ ئەوەی کە بۆشی نەبێ بە قسە چەند جار بە ڕیز هەموویانی ماچکرد و سەعاتێک لایان دانیشت و باسیش هەر باسی ئەو شەوەبوو کە کوڕەکانی تیابانگ کراوە و ئەمان لە چ حاڵێکا بوون؟

تۆفەش لەو کاتەدا لە بارەگا دانیشتبوو لە تەنیشت بەختیارەوە بە هیوای ئەوەی خەبەرێکی کوڕەکان بزانێ و دڵی حەپسەخان و ئەوانیپێخۆشبکات بە نائومێدییەوە دەستی دا بەیەکاو بە ئەسپایی بە بەختیاری گوت:

" ئەشهەدو ئەنلائیلاها ئیلەڵا نازانم ئێستا بچم درۆی چیان بۆ بکەم؟ بەوخوایە درۆمپێنەماوە! دە گیانەکەمی تۆ بچۆ و شتێکیان بپێبڵێ..!" بەختیار گوتی:

" بەخوا کاکە تۆفە تۆ خۆت بچی باشترە، هەر گاڵتە بە قسەکانی من ئەکەن ڕاوەستن ئێوارە خەبەر دێت، ڕاوەستن بەیانی بروسکە دێت ماڵیان ئاوابێت خۆ هەر بە تەواوی بڕستیان بڕاوە. بەسەری باوکم ماڵەکەم وا لەبەرچاو کەوتووە هەر حەزناکەم بچمەوە، باوەڕبکە ئەوەمپێخۆشتر بوو کە منیش بچومایە لەگەڵیان، لەوەی کە ئەم هەموو درۆیە بکەم بۆ دڵخۆشکردنی ئەمان.." دە بڕۆ دەی گیانەکەمی ئێستە چاویان لە ڕێگەیە!".

تۆفە ئۆفێکی کرد و کەوتە ڕێ هەمووی چەند هەنگاوێ ڕۆیشتبوو هێشتا نەگەیشتبووە لای ئەو دو سێ دوکانەی کە لە بەینی ماڵەکەیان و بارەگاکەدابوون دی زەلامێ بەرەو بارەگا ڕائەکات و هاوار ئەکات " ڕادیۆیان کەنەوە حکومەت ڕوخا!" ئیتر هەر خەڵک بوو ڕای ئەکرد بەرەو بارەگا. یا بۆ چایخانەی ئەولایەوە کە ڕادیۆی هەبوو، تۆفە بانگی کردە زەلامەکە بۆ ئەوەی بزانێ چی قەوماوە بەڵام کابرا ئاگای لە کەس نەبوو هەر ئەیقیژان: "کورە بەغدا بکەنەوە حەشرە حەشر ئینقیلابە ئینقیلاب!!!" بەم هاتو هاوارەوە کردی بە بارەگادا.

تۆفە تۆزێ ڕاوەستا بەڵام لە قریوەی پێکەنین و ئای دەستخۆش و بژی کورد و کوردستان زیاتری گوێلێنەبوو بۆیە بە پەلە خۆی گەیاندە ماڵێ و هەر لەبەر دەرگاوە قیڕاندی: مزگێنیم بەنێ بوو بە ئینقیلاب لە بەغدا، حەشرە حەشر! ژنەکان قاو و قیژیان تێکەوت ئامەخان هەر ئەوە نەبوو ببورێتەوە، هەموو دەوری تۆفەیاندا هەریەکەیان پرسیارێکی لێئەکرد و لایەکی ڕائەکێشا، وا

تێیئالآبوون کلاو و جامانەکەیان لەسەری خستە خوارەوە کردیان بەژێر پێوە کچەکان لەو بوونەوە کەوتنە باوەش بەیەکا کردن و یەکتر ماچکردن، دایکی بێستون قۆڵی (قەمسەڵە)کەی تۆفەی ماچ ئەکرد، سەبری کە هەر زوو ڕادیۆکەی کردەوەو چاوی زەق بوبو بڕوای بە گوێی خۆی نەئەکرد، جارێ ئەیخستە سەر عەرەبی جارێ ئەیخستە سەر کوردی، هەر بەیان بوو لە دوای بەیان ئەخوێندرایەوە بەرە بەرە هەموویان لە دەوری ڕادیۆکە کۆبوونەوە، ئامەخان بە پێکەنینەوە گوتی خۆزگە ئەمزانی هەلهەلە بکێشم!
خوشکی بەلکی بە سەرپۆشەکەی ئارەقەکەی سڕی و گوتی:
ئەی کوڕەکان خوایە چۆن خەبەرێکیان بزانین؟"
تۆفە سنگی دەرپەڕاند و گوتی: "ماڵت ئاوابێ لەمە خۆشتر! هەر ئەوەندەت زانی بە بەیەکتر شاد و شکور بوینەوە!!" (ئینجا هەردوو دەستی دا بە سنگیدا و گوتی)" خۆ بیرتە چیم پێگوتی؟ نەمگوت ئەم وەزعە هەروانابێت تا سەر؟ نەمگوت تا ئەم حکومەتانە حەکی کورد نەدەن و شەڕی لەگەڵبکەن خۆیان لەناو ئەچن و کورد هەر ئەمێنێت؟؟ با بیخۆن! عەمریان نەمێنێ لایان وایە کوردیان پێ لەناو ئەبرێت، نازانن ئەوە بۆ خۆیان باشترە کەا هەقی کورد بدەن و خۆشیان بمێننەوە، من هەروام ئەگوت!"
سەبری و نەسرین کە خەریکبوون بدەنە پڕمەی پێکەنین سەیرێکی یەکترییان کرد و توند دەمی خۆیان گرت. حەپسەخانیش لە دڵیخۆیا گوتی: "دیسان قسە زلەکانی دەسپێکردەوە، حەرام ڕۆڵە ئەگەر لە خەویشا قسەی وام لێبیستبێ دە سەیریکە ئاخۆ کێ ئەم قسانەی کردووەو ئەمیش کردی بە هی خۆی" بەڵام لەخۆشی خەبەرەکە بە تۆفەی گوت: "کوڕە تۆ؟؟ هەر باسی خۆت و قسەکانت مەکە هەقە هەموو بخرێنە ناو غزەتەوە! قسەی تۆ هەمووی نەخشی بەردن!"
سەبری کە وەک و یەکێکی خوێندەواری لەدنیا گەیشتوو گوێی لە ڕادیۆکە ئەگرت هەر هەوڵی ئەدا کە بێدەنگیان بکات، ئەوان هەر پەلەیان بوو کە بزانن چییە، ئەویش هەر ئەیگوت جارێ ڕاوەستن ئەوە ئینقیلابە ئینقیلاب، بەڵام ئینقیلاب بە ئێمە چی؟ ئەوە شەڕە سەگی خۆیانە لەسەر حوکم، بەچ مەعلوم ئەوانەی دێن لەمانەی ئێستە باشتر ئەبن بۆ کرد؟ هەموویان بەرامبەر بە کورد جاشی ماکەرێکن! دوور لە ڕووی ئێوە، هەر ئەوەندە مێچکە مێچکەمان بۆ

ئەکەن تا جێیخۆیان قاییم ئەکەنئیتر وەک و سەگی هار تێمان بەرئەبن.. بۆیە ئەگەر ئێستە دان بە هەموو مافەکانیشمانا بنێن من باوەڕیان پێناکەم چونکە ئەزانم بۆیە پێمان ئەڵێن "کاکە" کە چۆلەکەمان پێبگرن"

لەم کاتەدا بەختیاریش گەیشتبوە لایان کە گوێی لەم قسانەی سەبریبوو بە پێکەنین و شەوقەوە گوتی:

"تخوا جارێتر بۆمان مەقرێنە. با ئەوان بەربنە یەکتری هەی هوو جاریَ وا زوو ناپەرژێنە ئەوەی پەلاماری کورد بدەن تاکو ئەوساش خوا کەریمە!"

حەپسەخان ئەم قسانەی زۆر بەدڵبوو بۆیە گوتی: "وەی ڕەبی ماڵی خوا ئاوابێت! کچم تۆ قسەی چی ئەکەیت خۆ هەر هیچ نەبیَ جاریَ شەڕەکە ئەوەستیَ؟ خۆ پێشمەرگەو ئەو عالەمە پشوویەک ئەدەن و ئەحەسێنەوە، ئێمەش ئەوەندەمان بەسە، خۆ خۆ بەدەست ئێمە نەبووە تا پلان و ڕێو شوێنی بۆ دابنێین، خوای ئەکرد هەر مانگی ئینقیلابێک ئەکرا لە بەغدا!!" ئینجا بەخۆشییەوە دەستی خۆی گوشی و ڕوی کردە دایکی بێستون و گوتی:ئەمە پێو قدومی تۆبوو، شکور وا ئەم خەبەرە خۆشەمان بیست! تخوا تو سەری بێستون ئەگەر زو زو سەرمان لێنەدەی."

تۆفە جگەرەیەکی لە پاکەتەکی دەرهێناو بەجوانی دانیشت و شانێکی تۆزیَ خواردکردەوە لەگەڵ ملیاو پەنجەی بە جگەرەکەیا هێناو بردی و وا بە ئارەزوو خۆشییەوە سەیری ئەکرد ئەتگوت (کولەکەی دڵی) سەیر ئەکات و لەوە ئەچوو کە دڵی نەیەت بیخاتە بەینی لێوی و دایگیرسێنێت! هەرچۆنێبیَ نەئەزانرا لەبەرچی بردییە لای لێویەوەو گێڕایەوەو خستیەوە پاکەتەکەی و وردە کۆکەیەکی کرد گەروی پاکردەوە ( هەموو زانیان کە تۆفە نیازی وەعزدانی هەیە) لێرەدا نەسرین هەڵیدایە و گوتی: ئەوە چیبوو بزانم دڵت نەهات جگەرەکە داگیرسێنیت!." تۆفە کە هێشتا هەر پاکەتەکەی بەدەستەوە بوو گوتی: 'جگەرەم کەم ماوە گوتم با پەلەی لێنەکەم!"

ئامەخان پێکەنی و گوتی: شکور مەراقت نەما دە ئیتر بەس ئەو دوکەڵە پیسە بکەرە سنگتەوە!"

تۆفە بەزەردەخەنەیەکی خۆشەوە گوتی: 'ئامیر مەخفەر تۆ میکێشە! جاریَ بێدەنگبن بزانین ڕادیکە چیئەڵێت" ڕادیۆکەش هەر خەریکی بڵاوکردنەوەی

بروسـکەکەی فیرقەکـان و سـەرکردەکانی (جەیش)بـووکە بـۆ پشـتگرتنی بـزوتنەوەکەو حکـومەتە تـازەکەی و دژی حـوکمی پێشـو بۆیـان هـاتبوو. تـۆفە گـوتی: "هەر ئەم جارە پیرۆزباییـان نەکرد و هەلهەلەیـان نەکێشـا؟ ئـاخۆ ئێسـتا چەند جێگا شیوەنەو چەند کەس کوژرابن؟"

حەپسـەخان:" خـوایە لێمـان بەدووربێت! خـۆ ئێسـتە خەڵـک کوشـتن وەک ئـاو خـواردنەوەو یـاری منـاڵانی لێهـاتووە ئەو هەمـوو بەشـەرە جـوانە! ئەو هەمـوو کوڕە گەنـج و لاوانە، دایکیـان بمرێت هەر خـوا خـۆی ئەزانێت کە بە چ ڕەنـج و کوێرەوەرییەک پێگەیەنراون، ج نەبوونی و قوربەسەرییەکیان دیبێ، هەتـا بـوون بە خاوەنی ماڵ و حاڵی خۆیان، کەچی لەپڕ ئەڵێن بوو بە شـەڕ، یان ئینقیلاب و ئەوەندە کەسی تیاچوو، هەی ئـاگر لە سـەبەبکاریان بەربێ، ئەو بەشـەرە جوانە بێگوناهـانە وەک مەڕ سـەرئەبڕن، تخـوا تەمـاع و دەسـتکەوت و خۆپەرسـتی ئەو هەموو خوێنڕشتن و پیاوکوشتنە ئەهێنێت؟

تۆفە گـوتی: "چییە خەفەتیـان بـۆ ئەخـۆی؟ یـاخوا سـەری یەکتـری بخـۆن!: چـوار ڕۆژ بەسـەر هەواڵـی ئینقیلابـا تێـپەڕی حەپسـەخان و خوشـکی کەوتـنەوە پرسیارکردن لە تۆفە، بۆچی پێشـمەرگەکان دیـارنەبوون؟ کەی ئەگەڕێنەوە؟ بۆ ناچی هەواڵێکیان بزانی؟ ئەویش بێزارانەو بە بۆڵەبۆڵەوە بەرەو خـوار بـوەوە بـۆ بارەگـا ، ئەوەنـدەی پێنەچـوو بەهەڵەداوان گەڕایەوە بـۆ مـاڵێ و هەر لە دورەوە هەردوو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و گوتی: "ئۆە خوایە ماڵت ئـاوابێ وەک منـت لەدەسـت ئەم دوو خوشـکە ڕزگـارکرد، ئامـا خـان بە پەرۆشـەوە لە هەیوانەکەوە پرسی:

"چی تۆفە گیان؟ خوشکی چی؟ کێ هـاتووە؟ تۆفە کە لێی نزیک بـوەوە گـوتی: تۆو خوشکت ئەڵێم سەرفرازی لای خوابن وا شکور شـەڕ ڕاوەسـتاو هێزەکەش وا بەڕێـوەن ئەگەڕێـنەوە ئیتـر بەرۆکمـان بەردەن! وای ئەم چەنـد ڕۆژە چیتـان بەسەر من و ئەو بەختیارە فەقیرە هێنا..."

ئامەخـان لە خۆشـیانا کـردی بە هەڵاو مژدەشـی دا بە خوشـکی و ئەوانـیش، هەمـوو بـوژانەوەو هـاتنەوە سـەرخۆیان و هەرکەسـەیان پەلامـاری ئیشـێکیدا، ماڵەکەیـان ڕێـک خسـتەوەو خواردنیـان ئامـادەکرد و دانیشـتن و چاویـان بـڕییە دەرگاکەو گوێیان هەڵخست بۆ دەنگێ...

لای ئێواره هێزی پێشمەرگە گەیشتە جێ، حسەین و نەورۆز بەر لە هەموویان هاتنەوە ماڵێ، ئەوانیش بە سڵاوات و باوەش چوون بەرەو پیریانەوە.
حەپسەخان چەند جار ملی خوارکردەوە بۆ لای دەرگای حەوشەو چەند جارێکیش پرسی: " ئەی ئەوا کوا عەلی ئەی ئەوە ئەو بۆ دیار نەبوو؟ کوڕەکان هەر قسەیان ئەهێنا بەسەراو جوابێکی تەواویان نەئەیایەوە کە دڵی پێی ئۆقرە بگرێت، لەبەر حسەین و نەورۆزیش حەزی نەئەکرد خۆی بشڵەژێنێ و زۆر سەریان بکاتە سەر بەتایبەتی کە دیی چەند ماندوو دیارن و سەر و چاو و جل و بەرگیان ئەڵێی هەمووی هەر باراناو و قوڕە. هێشتا باش خۆشیان وشک نەکردوەتەوە، بۆیە ڕاوەستا تا هاتنەوە سەرخۆیان ئەوجا بە پەرۆشەوە پرسی: ئەی ئەوە عەلی بۆ نەهات؟ ئەی شیروان کوا؟ حسەین کردی بە دەنگە دەنگ و گاڵتەو گوتی: کاکە عەلی و شیروان لە تیپێکی تردان، بۆچی دایە تۆ وا ئەزانی ئێمە هەر ئەم چەند کەسەین بێقەزابی ماشەڵا پێشمەرگە هەر لە حساب نایەن؟؟ ڕەنگە ئەوانیش نەختێکیکە بگەنە (بارەگا)، لەوانەیە.. ئێستەش گەیشتبن" هەستایە سەرپێ و گوتی: "ئێستە هەر خوا خۆی ئەزانێ لە خۆشی ئەم ئینقیلاب و شەڕوەستاندنە کردبێتیان بە چ بەزمێک" لەو ناوانە هەندێک پێشمەرگە کەوتنە هەڵپەڕین و شایی گێڕان. چەند تەقەیەکیشیان کرد بە ئاسمانا بەڵام باشبوو سەرتیپەکەیان هەرزوو وەستاندنی و بێیگوتن براینە ئەوە چۆن ئەو فیشەکە نازدارانە هەروا بە هەوادا ئەتەقێنن؟ نازانن ماڵی شۆڕشەو ئەبێ هەر بۆ کوشتنی دوژمنانی کورد و کوردستان و سەرخستنی شۆڕش و دەستخستنی مافەڕەواکانی بەکاربهێنرێت".
پاش نەختێ بێدەنگی و نەبوونی هیچ هەواڵێک لەبارەی عەلییەوە حەپسەخان گوتی: باشە ئەی ئەوە تۆفە چیلێهات؟ ئەوە بۆچی نەگەڕایەوە لەگەڵ ئێوە؟؟".
نەورۆز گوتی: پورێ گیان مەگەر تۆ کاکە تۆفە ناناسی؟ ئەو تا کاک عەلی نەگاتە جێ دڵی ئاو ناخواتەوە" حسەین کەوا لای پەنجەرەکەوە وەستابوو سەیری دەرگای حەوشەی ئەکرد، ڕووی کردە دایکی و گوتی: ئینجا دایە گیان ئەو کەی گوێ ئەداتە هاتنەوەی ئێمەمانان؟ لای ئەو هەر کاک عەلی، حسێبە. ئینجا بەدەم جامانە بەستنەوە بە نەورۆزی گوت: هەستە با بچینەوە بارەگا بزانین دەنگ و باسیان چییە"

دوو سەعاتێکیتر بەسەر ڕۆیشتنە دەرەوەی ئەوانا تێپەڕی و تا ئەهات دڵیان زیاتر مەراقی تێئەکەوت و زۆرتر ئارامیان لەبەر ئەبرا، ئەوەندە شڵەژابوون لەگەڵ ئەوەشا کە دنیا تاریک بوبو یەکێکیان بیری نەبوو کە چراکە داگیرسێنێت ئەمان لەم حاڵەدا بوون تەقەی دەرگا هات لایت و چرا دەرکەوت دەنگە دەنگ پەیا بوو لەهەموان بەرزتر دەنگی تۆفە بوو کە ئەیگوت: لەسەرخۆ بەقوربانتبم هیچ نییە! یاڵڵا یاڵڵا، ئەها حسەین ئاگات لە شانیبێت!!" ژن و کچەکان بە دڵی داخورپاوەوە ڕاپەڕین و بەپەلەپڕوزێ هەریەکەیان بەلایەکا ڕایکرد و دەرگای حەوشە. حەپسە هاواری پێکەوت و گوتی: ئای قوڕ بەسەرم ئەوە چییە چیی بووە؟ ئەوە کێیە؟؟"

کە بینی عەلییەو بریناره، بەچەپۆک بەربوە سەروچاوی خۆیو کردی بە گریان و شیوەن، عەلیش بە پێکەنینێکی ئازاراوییەوە بە دەنگێکی بێهێزی پچڕ پچڕ گوتی:

"دایە گیان بەخوا هیچی وام نییە، هەر قاچمەو گولەیەکیش بەر قۆڵم کەوتووە، هەر گۆشتی بڕیوە هیچ ترسی تیا نییە، بەس نییە بە ساغی بۆت هاتومەتەوە؟ ئەی ئەگەر بکوژرامایەئەتگوت چی؟ ئێستە هەقە دڵت خۆشبێت؟ بەئەسپایی و لەسەرخۆ عەلییان گەیاندە ژورەوەو لەسەر جێگایەک پاڵیان خست. دایکیشی لەبەر دڵی ئەو و حەپەساوی خۆی ورتەی لێ بڕاو بەپەلەو بێدەنگ خۆی گەیاندە لایەوەو لەتەنیشت جێگاکەیەوە هەڵتروشکا. حسەین کە دایکی بەم حاڵە دی، لە دڵی خۆیا کەوتە سەرزەنشتی خۆی کە بۆچی لەگەڵ هاتنەوەیا بەجۆرێک دڵی دایکی ئامادە نەکرد بۆچاوەڕوانکردنی شتێکی وەک ئەوەی کەوا لە کاکە عەلی قەوماوە بێگومان ئەوسا هێنانەوەی کاکە عەلی بە برینداری ئەو تیرە کتوپڕەی نەئەدا لە جەرگی! بەڵام چاریشی نەبوو ئەترسا لەوەی دایکی خۆی بکوژێ، لەگەڵ ئەمەشدا هەر ئەبوو ئەگەر خۆشی قسەی نەکردایە لە نەورۆز بگەڕێ باسێکی پێشمەرگە کوژراو و بریندارەکانی بۆ بکا بەشکو بەوە نەختێ لە گرانی بەڵاکەی کەم بکردایەوە، بە تایبەتی کە ئەویش ئاگای لێبوو، کە کاک عالی و سێ چوار پێشمەرگە بریندارەکەی کەیان بردە خەستەخانە فەقیرانەکەیان تا گولەکانیان لەلەش دەربێنن و برینەکانیان بۆ دەرمان بکەن و بپێچنەوە، هەرچۆنێک بوو هەر ئەبوو یەکێکیان شتێک لەبارەی بریندابونی

کاک عەلییەوە بە یەکێک لە ئافرەتەکان بڵێن بۆ ئەوەی یارمەتییەکیان بدات لە کەمکردنەوەی کاری کتوپڕی هێنانەوەیدا بە برینداری، ئا سەبری بۆ ئەمە چاک بـــوو، زۆر بە جەرگ و تێگەیشتوشـــە بەڕاســـتی بەکەڵکیـــان ئەهـــات.. دەی هەرچۆنێکبێت تازە ڕۆیشت لەدەست چوو.. حسەین ئەم شتانەی لێک ئەدایەوە، دایکیشـی لە عەلـی ورد ئەبـویەوەو هەرچەنـدی ئەکـرد بـڕوای بە چـاوی خـۆی نەئەکـرد کە ئەوکەســەی ئەیبینێـت عەلـی کـوڕیەتی، ئەو کـوڕەی کە هەمـووی هەفتەیەک لەمەو پێش زرمەی ئەهات، قسەو گاڵتەو پێکەنینی دەنگی ئەدایەوە لە ماڵەوەو لە دەرەوەو لە بارەگادا. لەناو ئەمـان و لە نـاو هاوڕێکانیا بە گڕوتین و ڕوخۆشـی ئەجـولایەوە کە هەموویـانی هێنـابووە جـۆش، ئێسـتەش وا بێهێـز، بێدەسەلات، ڕەنگ پەڕیو، دەم و لێو وشک، بە جلی خوێناوییەوە، نیوە مردوو لەبەر دەمیدا کەوتووە!!.

دایکی کە ئەمەی ئەدی هەسـتی ئەکـرد کە وەک دوژمنێکـی بێـویژدان و دڕنـدە دڵـی خسـتبێتە بەینـی دوو بەردەوەو بە هەمـوو هێـزی خـۆی بیگوشـێتتاکو لە لێدانی بخات! هەستی ئەکرد کەوا کەللەی سەری پوچەڵبوەو مێشکی تیا نەمـاوە، حەزی ئەکرد ڕابکـات بۆ شـوێنێکی نادیـار. حەزی ئەکـرد لێیگەڕێن بقیژێنێت و بگـری وەک و منـاڵ! کە چـاوی ئەگێـڕا بە ژورەکەدا ئـاواتی بە دارو بەردەکەی بەو پەردە چیتە شـڕەی پەنـجەرەکەی ئەخواسـت و حەزی ئەکـرد کە یەکێ لەو شتە بێگیانانە بوایە بۆ ئەوەی هەستی بە حاڵی خۆی و کوڕەکەی نەکردایە!

عەلی کە چاوی کردەوەو دایکی لەو حاڵەدا بینی، بەزەیی پیا هاتەوەو بۆ ئەوەی کە تـــرس و خەمـــی کەم بکـــاتەوە بە هەمـــوو هێـــز و وورەی خـــۆی تـــوانی زەردەخەنەیەکی کاڵ بخـاتە سـەر لێوی و بە دەسـتە سـاغەکەی دەسـتی دایکی گرت و ماچی کرد و نای بە سنگییەوەو بە هێواشی گوتی: ئینجـا کە ئەمە حـاڵی ئێوەبێ بەرامبەر بە برینداربونێکی بێ مەترسی مـن، ئەی ئەبێ دایـک و بـاوک و کەسـو کـاری ئەوانە چـی بـکەن کەوا کوڕیـان شـەهید کـراوە؟ پەڕۆیە لە مـاڵی ئەوان دادڕن. عەلـی بە هێواشـی چاوێکی گێڕا بە کۆمەڵەکەی دەوریـا دی تۆفە چـــاوی خـــۆی ســـڕی و ڕایکـــردە هەیـــوان، عەلـــی ئەوەنـــدەی تـــوانی دەنگـــی بەرزکـردەوە گـوتی: کـاکە تـۆفە گیـان تـۆ نابێت نـاڕەحەت بـی چـونکە عاجزیت

لێنـایەت! ئەی (یـا کوردسـتان یـا نەمان)مـان بە درۆ گوتـووە؟؟ خـۆ ئەوەتە مـن ماویشم و هاتوشمەتەوە لاتان! دە تخوا ئیتر خەفەت مەخۆن.

خەریـک بـوو لەسـەر قسـەکردن بـڕوا بەڵام هاوڕێکـانی و حسـەینی بـرای لێپاڕانەوە کە قسەنەکات، ئیسراحەت بکا بۆ ئەو باشترە، ئەمەیان گوت ئیتر هەموو بڵاوەیان لێکرد دایکی و پوری نەبێت، دایکی قسەکەی هەر لە گوێچکەیا ئەزرنگـایەوە (ئەی ئەگەر بکوژرامـایە چیـت ئەکـرد؟؟) مـوچڕکێکی پیـا هـات، دەستێکی لەرزۆکی بەپەلە برد بۆ سەری و زۆر لەسەرخۆو بە ئەسپایی پەنجە تەزیوەکـانی بەسـەریا ئەهێنـاو ئەبـرد، وەک وڕێـنەی نەخۆشـێکی بێحـاڵ بە ترسێکەوە لەژێر لێوەوە گوتی: نە تخوا! ماڵت ئاوابێ خوا، بەس نەبوو.. وەی باوکە ڕۆ ئەوە چ قسەیەک بوو؟!

ئەم لەم حـاڵەدا کـاتێکی زانـی حسـەین لەگەڵ دکتـۆرێکی پێشـمەرگە کردیـان بە ژورا، ئەویـش گـوڕی دایە خـۆی هەسـتێ نەیتـوانی، دکتـۆرەکە دەسـتی نـایە سەرشـانی و گـوتی: نە پـورێ، ئەزیەت مەکێشـە مەجـوڵێ، هەروا بەسـەر پێـوە تەماشـایەکی بـرینەکەی کـاکە عەلـی ئەکەم و ئەڕۆم، لە عەلـی چـووە پێشـەوە سـەیرێکی برینەکـانی کـرد و بە زەردەخەنەیەکـی سـەرکەوتووانەوە ڕوویکـردە حەپسـەخان و گوتی: شـکور مەترسـی نەمـا، ترسـی خوێنەکەیم هەبـوو ئەویش گیرساوەتەوە، ئێستەش هەر بۆ دڵنیایی هاتم، ئیتر ئەتوانن بە شـێنەیی جلەکانی بگـۆڕن بەڵام ئەگەر ئەتـوانن شـتی نەرم و فراوانـی لەبەر بـکەن. ئینجـا دکتـۆر کردنـی بە گـاڵتە بـۆ ئەوەی نەختـێ خەم و دڵتەنگییەکەیـان بـڕەوێنێتەوە، بـۆیە سـەیرێکی عەلـی کردو گوتی: باشـە ئیتر بەم بیانووەوە بکەوەرە شـتی خـۆش خواردن، خوا ئەزانێ حەپسەخان چیت دەرخـوارد ئەدا، ئێمەش نـان و چـا فڕنـی فالۆزەمـانە!!. عەلـی بە زەردەخەنەیەکـی کـاڵ بەڵام خۆشـەوە گـوتی: ئینجـا کـاکە دکتۆر من چۆن بەبێ تۆ دەم بۆ شـتی خـۆش ئەبەم! دکتۆر بە پێکەنینەوە ڕوی کردە حەپسەخان و گوتی: خۆ گوێت لێبوو پورێ گیـان عەلـی چـی گـوت، ئینجـا لەمەولا هەرشـتێکی خۆشـت بـۆ لێنـا بنێـرە بە دوامـدا بڵـێ عەلـی بێتـاقەتە وەرە بزانە چییەتی!!. لەگەڵ حسەین دەستیان کرد بە پێکەنین. حەپسـەخانیش چاوی سـڕی و بەزەردەخەنەیەکەوە کە وەک هـی مـردو بـوو، هەردو دەسـتی خسـتە

سەر چاوی و بە دەنگێکی نوساوەوە گوتی: وەی بەسەر هەردوو گلێنەم، هەر تۆ و خواردنی خۆش؟!

***

بەهاتنی دکتۆر و قسەکانی خەڵکیماڵەکە مەترسی پێشویان نەما بەرامبەر بە عەلی و تا ئەندازەیەکیش هاتنەوە سەرخۆیان، سەبری کە لە هەموویان باشتر خۆی پیشان ئەداو هەر بەڕاستیش باشتر بوو و دڵی ئەدانەوەو بەڵاکەی لا سوک ئەکردن، باشە حسەین و نەورۆز لە سایەی خواوە بە سەلامەتی و کاک عەلی گیانیش بە برینداری هاتنەوە ئەی بۆ ئەو دیار نەبوو؟؟ بیرێ بە مێشکیا تێپەڕی، هەر وەخت بوو دڵی ڕاوەستێ و وتی نا.. وەی گوێی شەیتان کەڕبێ، دوربێ ئەگەر شتێکی وا بقەومایەهەر زوو هەواڵ بڵاو ئەبوەوە، ئەوە چییە ئەڵێی منیش بووم بە دایکم و ئەوانتەنها هەر ئەو نییە نەهاتبێتەوەئەوە بێستونیش دیار نییە. هات بە بیریا کە لەوانەیە بیری چوبێکە ئەم لێرەیە، چوبێتە ماڵی خۆیان!! نە لەوانە نییە، هەر هیچ نەبێ بۆ هەواڵپرسین و سەردانێکی کاک عەلی ئەهاتە ئێرە.. باشە ئەی بۆ نەچێ لە حسەین و ئەوان بپرسێ " هەستا بچێ ڕوناک و نەسرین هان بداو کە هەواڵی ئەوانیکە بپرسن.. چووە لایان بەرلەوەی دەم بکاتەوە دی ئامەخانی پوری ڕایکردە ژورەکەی خۆی و بەرماڵەکەی ڕاخست و چووە سەری نوێژ بکا، کەچی لەپڕ ڕایکردە حەوشەکە وەک بۆ شتێ بگەڕێ، بەڵام زوو گەڕایەوە ژورێ و سەر و سەرپۆشەکەی ڕێکخست و کەوتە نوێژکردن، کچەکان کە چاویان لەم شپرزەییەی ئامەخان بوو لایان سەیربوو، ڕوناک بە ئەسپایی گوتی: ئەوە من زانیم کە پورم ئەو هاتوچۆیەی لە چیبوو، چوو نوێژ بکا لە پاشا وایزانی کە دەستنوێژی نییە، چووە حەوشەکە دەستنوێژ بگرێت، بیری کەوتەوە کە دەستنوێژی هەیە ئینجا گەڕایەوە نوێژەکەی بکا، بەڕاستی فەقیرە هەر هۆشی نەماوە."

نەسرین بە ماتییەکەوە گوتی: ئینجا ناهەقیەتی؟؟ هۆش چۆن ئەمێنێ؟ بۆچی ئەمە کەمە؟.. دەی خوا خراپتر نەدا!.

حەپسەخان لە ترساندا ئەوەندە گریابوو، ئەوەندە بەسەروچاوی خۆیا ماڵیبوو، وەک بێهۆش لە ژووری خوشکی کەوتبوو، لەپڕ ڕاپەڕی وەکو شێت سەیرێکی

دەوروپشـــتی خـــۆی کـــرد و بیـــریکەوتەوە کە ئەمە لەوســـاوە ڕاکشـــابوو خەویلێکەوتوە، بەپەلە پڕوزێ هەستایە سەرپێ و ڕایکرد، بۆ ژورەکەی خۆی، بە شپرزەیی و سەرو پۆتەڵاکێکی شێوەو و بەدەنگێکی گڕی نوساو بەخۆی گوت: دەک کوێرایت دایەو خەوی مەرگت بێ!! ئەوە چۆن عەلیت بەجێهێشت و خەوت لـێکەوت و نوسـتی؟؟ کە سـەیر ئەکـا وا عەلـی بێتـاقەتە و سـەبری و نەسـرین و کوڕەکـان بەدیـاریەوەن و سـەبری پەڕۆ تەڕئەکـاو ئەیخـاتە سـەر نـاوچەوانی، کە ئەوانـی وا دی دڵـی داخورپـا و دەم و قـوڕگی وشـک بـوو و قەڵەمی ئەژنۆی شکا و لە شوێنی خۆی گرمۆڵە بوو، چۆقە چۆقی دانی ئەهات!! حسـەین کە هەسـتی کـرد دایکـی وا تێکچـووە بەپەلە هەسـتاو چـووە لایەوەو دەستی گرت و گوتی: دایە گیان ئەوە بۆ هەستای؟ کاکە عەلی شکور چاکە، دکتۆرەکـان خۆشـیان گوتیـان کەوا یـاک دو جارێـک ئەو نـیمچە تـایەی ئەبێت، بەڵام هیچ ترسی نییە.

***

٢٨

بۆ بەیانی هەر زوو سەبری حسەینی بانگ کردە ژورەکەی ترو بەکزی و مەلولییەوە گوتی: ئەرێ پێم ناڵێی ئەوە بۆچی شیروان نە دیار بوو نە کەسیش باسی ئەکات؟ بۆ لەگەڵ ئێوە نەبوو؟

با، ئەی چۆن، ئێمە هەموو لە جێیەک بووین بەڵام ئێمە لەبەر کاک عەلی و بریندارەکانی تر بەپەلە خراینە ڕێ، چونکە پێویست بوو کە زوو بگەیەندرێنە خەستەخانە، شیروانیش فەقیرە زۆری حەزئەکرد لەگەڵ ئێمە بێتەوە، بۆ ئەوەی لە کاکە عەلی دور نەکەوێتەوە، بەڵام خۆ هاتنەوەو نەهاتنەوە بەدەست ئێمە نییە، شکور سەلامەتە، بەڵام بێستون هەر خوا ڕەحمییێکرد... سەبری بە پەرۆشییەکەوە گوتی:

وەی خوا نەکا دە بڵێ بزانم چی بوو؟

بەسەزمانە لە دەسرێژێکی تەیارەدا پریشکە بەرد دای لە گوێچکەی و چاوی، هەر یەکتۆزیتر خێراتر خۆی نەدایە بە ئەرزدا دەسترێژی دووەم کوشتبووی، ڕوناک کە گوێی لە ناوی بێستون بوومووچرکێکی پیاهات و دڵی داخورپا و گوێی هەڵخست بۆ قسەکانی تری حسەین، بەڵام لێرەدا دایکی بانگی کرد کە بچێت ئاوی بۆ بەرێت، بەناچاری چوو بەلای دایکییەوە، بەڵام هەموو هۆشی لای قسەکانی حسەین بوو.

دای ئەم قسانەی حسەین، سەبری زیاتر دڵی کەوتە مەراقەوە، هات بە خەیاڵیا تۆ بڵێی شیروانیش شتێکی لێنەهاتبێ و حسەین لێمی بشارێتەوە؟! هەروەک و چۆن برینداریەکەی کاکە عەلییان لێشاردینەوە تا هێنایانە ماڵەوە هەر ئەیانگوت، ئیشی هەیە بۆیە دواکەوتووە؟ ئەم خەیاڵانە سەبری دڵتەنگتر و خەمبارتر کرد، خەفەتی ئەخوارد بۆ کاکە عەلی کەوا بریندار کراوەگورج ئەو پێشمەرگانەی هاتە بیر کە شەهیدکراون، کە یا برینەکەیان لەوەی کاک عەلی کاریگەرترە، ئینجا ئەهاتە سەر شیروان و بێستون، شەرمەزاری ئەوە بوو کە نەیئەتوانی وەک و ئەو خەفەتیان بۆ بخوات، هەرچەندە بۆ هەمووشیان خەفەتی ئەخوارد! لە داخا کەوتە دوعاکردن لە خۆی و لە حکومەت و بە بێزارییەکەوە گوتی: ئۆە قورمان بەسەر، دڵمان لای کێ بێ و لای کێ نەبێ؟ وای خوایە ئەمە چ ژیانێکە ئێمەی تیاین بۆ نایبەیتەوە بۆ خۆت؟..

بۆ سبەینێ بێستون و شیروانیش گەیشتنەوە جێ، باوکی بێستون هەر کە هەواڵی برینداربوونەکەی زانی بەهەڵەداوان لەگەڵ چەند خزمێکی، ولاخیان بۆ بردبوو، ڕۆژێ لەوەوپێش بردبوویان بۆ خەستەخانە، بەڵام شیروان سەلامەت بوو، هەر کە گەیشتنە ماڵێبەپەلەو پەرۆشەوە خۆی گەیاندە لای عەلی و کەوتە دڵدانەوەی خەسوی و ئەوان.

بێستون لەبەر ئازاری چاوی و گوێچکەی ئارامی لێبڕوابوو... بۆیە دایک و باوکیشی سەریان لێشێوابوو.. ماوەیەکی باش لەژێر دەستی دکتۆرەکانا مایەوە تا مەترسی لەسەر نەما ئەوسا ئیزنیاندا بڕواتەوە ماڵێ. بەڵام بێستون بەوحاڵەشەوە هەر دڵی لای ڕوناک و نارەحەتی عەلی بوو، کە ئاخۆ حەپسەخان چی کردبێ و ڕوناک چەند گریابێت!

کەلە خەستەخانە هاتنە دەرێ بەو ئێش و ئازارەوە بەباوکی گوت: بابە گیان با لە ڕێگاوە سەرێک لە کاکە عەلی بدەین بزانین چۆنە، دڵم زۆر لایەتی.

باوکی دڵی نەهات پێی بڵێ: ئەرێ کوڕم تۆ بەم حاڵەوە ئەچی بۆ هەواڵپرسینی چی؟ وا لە ئێستەوە پەڕۆکەی چاوت خوێناوی پیا دێتە خوارەوە زۆر بێتاقەتیت). بەڵام ئەو لە کوێ ئاگای لە دڵی بێستون بوو؟ ڕاستە عەلی خۆشئەوێت و زۆریش بە تەنگییەوەیە، بەڵام ئەو نەیئەزانی کە ئەگەر هەر گوێی لە دەنگی ڕوناک بێت هەرچی ئازاری هەیە لەبیری نامێنێت، نازانێ چۆن لە نزیک ڕوناکەوە هەست بە چ ئارامی و خۆشییەک ئەکات! چۆن قسەو پێکەنینەکانی دڵی ڕوناک ئەکاتەوە و مەست و سەرخۆشی ئەکات، باوکی چاری نەما سەرێکی هەڵری بۆ ئاسمان، وەک لای خوا گلەیی لە حاڵی خۆی بکات ئەوجا بە ئەسپایی گوتی:

باشي کوڕم باشە.. چۆن ئەڵێیت بەقسەت ئەکەم..

لەسەر خۆ بێستون کەوتە ڕێ لەگەڵ باوکی و کۆمەڵێ لە خزمەکانی. گۆچانێکی گرتبوو بە دەستییەوەو دەستێکیشی گرتبوو بەولایی سەریەوە کە پێچرابوو، بەو حاڵەشەوە لەپڕ دڵی داخورپا و هات بە بیریا کەوا هەموویان ناگەڕێنەوە سلێمانی؟؟؟

ئیتر خەتەر نەما لە چی ئەترسن؟ ئێستە کێ بە کێیە؟ هەی گیان بەخوا چاک ڕوناک ئەبینێت، ئەی چارەی چییە؟ چەند هەنگاوێکی تر ڕۆیشت و عەلی هاتەوە

بیر و لەبەر خۆیەوە گوتی: نە بابە چۆن کورەکەی بەم حاڵە بەجێ ئەهێڵێت و ئەگەڕێتەوە، قەت باوەڕناکەم... بەڵام هەر زوو نائومێدی وروژمی بۆ هێنایەوە: ئینجا بەشکم گوتیان: (کاکە عەلیش ئەبەینەوە لەوێ دکتۆر و خەستەخانەی چاکی لێیەو ماوە زۆرترە بۆ زوتر چاکبوونەوەی) ئەمە زۆر ڕێیتێئەچێت!

بێستون بەمە دڵی گوشراو هەستی کرد کە ئێشی چاوەکەی زۆر زیادی کرد و بەحاڵێکی پەرێشانەوە گەیشتە ماڵی حەپسەخان. هەموو خەڵکی ماڵەکە بە پەرۆشێکی زۆرەوە چون بە پیریەوەو بە دڵسۆزییەوە بەخێرهاتنیان کردن و هاودەردییان بۆ دەربڕین.

حەپسەخان کە بێستونی بەوحاڵەوە دی هەندێ غیرەتی هاتە بەر و زۆری قسەکانی هەر سوپاسی شوکری خودا بوو. بێستونیش لە ژێرەوە چاوە ساغەکەی بڕیبووە ڕوناک و لێینەئەتروکان، بێ ئەوەی هیچ کەسێ هەستی پێبکات، چونکە دەوروبەرەکەی ئەوەندە سەغڵەتی عەلی و ئەو بوون سەرنجیان بەلای هیچی تردا نەئەڕۆیشت. بێستون ویستی کە لەبارەی لەوێ مانەوەو نەمانەوەیانەوە دەمی دویان تاقی بکاتەوە گوتی: بەخوا ئەم ئینقیلاب و حکومەت ڕوخاندنە شتێکی خۆش و لەوەختا بوو هەق وایە بیکەین بە شایی!

چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و گوتی: مەپرسە کە تۆفە هات و مژدەی داینێ، دایکیشت لێرەبوو، لە خۆشیانا چیمان کرد (قوڵپی گریانی هەستاو بەدەم هەنسکەوە) گوتی: ئۆە کوێراییم دایە ئەوکاتەی ئێمە هەڵئەپەڕین ئێوە لە خوێنا گەوزتان ئەدا..

بێستون برینەکانی بیرچووەوە بە گەرمییەوە گوتی:

نە.. نە.. تخوا دڵی خۆت ناڕەحەت مەکە! وا شکور سەری ئەوانمان خوارد، وە ئینشاڵا زو چاکیش ئەبینەوەو دنیاش بە دڵی خۆمان ئەبێت.

ئیتر دانیشتوان هەموویان کەوتنە قسەکردن، تا باوکی بێستون ڕووی کردە کوڕەکەی و گوتی: کوڕم با ئیتر هەستین بڕۆین، وا شکور دڵنیابووین، کاکە عەلی ئەلحەمدولیلا چاکە، ئەمەی گوت و هەستایە سەرپێ و ڕوویکردە حەپسەخان و گوتی: یاڕەبی هەزارجار شکور سکمان نەسوتا. ئەبێ هەتا ماوین هەروا بڵێین!! ئیتر ئەوانیکەش هەستان کە بڕۆن. بێستون ئەگەرچی بە هاتنەکەی نەیتوانی کە بزانێ نیازیان چییەو چی ئەکەن و چیی ناکەن بەڵام بە

دیمەن و حاڵیاندا وا دەرئەکەوتکە هیچ نەبێ تاکو دە پازدە ڕۆژیتر، هەر بیریش لە ڕۆیشـتنەوە نەکەنەوە، بەتـایبەتی کە هێشـتا وەزعـی حکـومەت لەگەڵ کـورد ڕوون نەبوەوە، تەنیا هەر شەڕ ڕاوەستابوو.

***

ڕونـــاک بەتەواوی بـــۆی ڕوون بوەبـــوەوە کە بەدڵ بێســـتونی خۆشـــئەوێت و زۆرجار بیری لێئەکردەوە کەوا ئەو هەستەی ئەو بەرمبەر بێستون هەیەتی زۆر لە ڕاهاتن و نزیکی و تەنانەت خزمایەتیش زیاترە. بەڵام شەرم و حیاو ڕەوشت و خوی بەرزی بەو منالییەوە توانیبوی وابکات کە نزیکترین کەسیش کە دایکی بوو، بەهیچ جۆرێک هەست بە هیچ شتێک نەکات. لەبەر ئەوە ئەم هەموو ترس و ئاڵۆزییە هەر لە دڵی خۆیا بوو و مێشکیان شێواندبوو.

***

## ٢٩

دوو هەفتەیە بەسەر ئەم ڕوداوانەدا تێپەڕی، عەلی بەرەو باشی ئەچو، ئەیتوانی وردە وردە بە دارشــەق ئەم ژوور و ئەو ژوور بکـات، هەمیشــەش دەوروبەری پڕبــوو لە خەڵــک، کە ئەهــاتن بــۆ هەواڵپرســینی، بەو بۆنەیەشــەوە ئەکەوتــنە قسەکردنلەبارەی وەزعەوە بە گشتی و هەڵوێستی پارتی بەرامبەر بە ئینقیلابەکە لەبەر تیشکی ئەو بەیانەی تیا گوتبووی: هێزەکانی پێویستە لە شوێنی خۆیان بمێننەوە..

***

خەڵک کەوتنە هاتوچۆکردنی سلێمانی و شارەکانی تری کوردستان، هەروەها دەستە دەستەیش ئەچون بۆ لای کوڕ و کەسوکاری پێشمەرگەیان بە دەست و دیارییەوەو ئەوانیش ئەچوونەوە بۆ سەردانی ماڵ و منداڵ و خزم و کەس و ناسیاوەکانیان. حەپسەخانیش کە دی کوڕەکەی وا ڕوو لە چاکبونەوەیە ئەویش کەڵکەڵەی گەڕانەوەی کەوتە سەر و ئێوارەیەک لە عەلی پرسی: ئاخۆ ئەمان چی ئەکەن؟ ئەگەڕێنەوە یان ئەمێننەوە؟

عەلی گوتی: تۆ و پورم و کچەکەن کەی ئەڕۆنەوە بڕۆنەوە، بەڵام ئێمە تاکو نەزانــین ئەمــانەی هــاتونەتە ســەر حــوکم چیمــان بــۆ ئەکەن لەجێــی خۆمــان ناجوڵێین، وە ئەگەر بکرێت لەم هەلەشدا دەست بەسەر شوێنی تریشدا ئەگرین.

حســەین لەولاوە هەڵیــدایەو گــوتی: ئێــوە ئەتــوانن بــڕۆنەوە بەڵام ســەبری و نەسرین با جارێ لێرەبن! لەگەڵ ئەم قسەیەدا چاوێکی لە دایکی داگرت.

نەسرین دەستێکی برد بۆ سەر و سەرپۆشەکەی و گوتی:

وەڵا پێش هەموویان من ئەڕۆمەوەم ئەمە چ قسەیەکە؟

ســەبری گــوتی: قەینــا مــن جــارێ ناڕۆمەوەبــا بــزانم کوڕەکــان چــی ئەکەن.

نەسرینیش سەرێکی باداو گوتی: ئێ باشە منیش بیری لێئەکەمەوە.

حەپســەخان و خوشــکی و ڕونــاک خۆیــان ئامــادەکرد کەلەگەڵ تـۆفە بـڕۆنەوە. بێستون ئەوەندە دڵتەنگ نەبوو چونکە پێشەکی بڕیاری خۆی دابو کە ئەوەندەی پێنەچی دایک و باوکی بنێرێتە سلێمانی کە داوای ڕوناکی بۆ بکەن، باشتریش ئەوەیە کە ڕوناک خۆیشی لەوێبێ، هەروەها دڵنیاش بوبو لەوەی کەوا ڕوناکیش ئەمــی صۆشــەوێ، بەتـایبەتی لەم مـاوەی برینداریەیـدا، زۆرتـر ئەمەی بـۆ ڕون

بوبوەوە، هەستی بە چاوتێبڕینەکانی کردبوو کە چەند پڕبوون لە بەتەنگەوە بوون و دڵسۆزی. کاتێ کەلەگەڵ دایکی سەریان لێئەدان، خۆشی چاوی ڕوو لە چاکی بوو و هیچ مەترسییەکی لەسەر نەمابوو، بۆیە بە دڵێکی پڕ لە هیواو بە شەوق و خۆشییەوە قسەی ئەکرد و بەدەوریانا ئەهات و زۆر بە دڵنیاییەوە بەڕێی کرد.

کۆمەڵ کەوتنە ڕێ، بەڵام لە نیوەی ڕێگا لێیکردن بە هەورەتریشقە و باران و تەرزە و ناچاربوون لە (کونە ماسی) بمێننەوە. ئامەخان باسی ئەوسای خۆی بۆ ئەکردن کە لە هاتنیا پیا تێپەڕیبوو، سەری سوڕمابوو لەوەی کە ئەو چایخانە ڕەق و تەقەی مەگەر هەر خوا بزانێ شەوێکی چۆن تیا ڕۆژ کردبوەوە، لەم ماوە کەمەدا کە مەترسی شەڕ نەما، چۆن وا ڕێک و پێک خراو وگەرم و گوڕ و خۆشکرا بەچەشنێ کە خەڵک نەیناسێتەوە؟ سەیری لاکێش و بەڕەو سەرین بکەن، بۆنی هەڵم و هالاوی خۆشی چا و سەماوەرکەن، بەڕاستی زۆر خۆشە، ئینجا لەبەر خۆیەوە دوعای لەو حکومەتانە ئەکرد کەوا ئەم دێهات و شوێنە خۆشانە کاول ئەکەن و دەستی ئەدا بە سنگیاو ئەیگوت: ڕەبی ماڵی ئەوانیش کاولکەیت!

تۆفە کە بە ئیشێک چوبوە دەرێ گەڕایەوە لایان و بەزەردەخەنەیەکی خۆشەوە ڕوی کردە ئامەخان و گوتی: لێرەبوو کە کردنی بە (ئامیر مەخفەر)؟ هەموو دایانە قاقای پێکەنین، ئامەخانیش بەدەم پێکەنینەوە گوتی: بەڵێ قوربان دەمڕاستی گەڕەک لێرەبوو. تا درەنگ بەم قسانە ڕایان بوارد، لەپاشا لاڵ و پاڵ لێیکەوتن تا ڕۆژیان لێبوەوە. تۆفە هەستا سەرێکی دەرەوەی داو ئەوەندەی پێنەچوو بە شپرزەیی هاتەوەو گوتی:

بەخوا وا دیارە بە دو سێ ڕۆژی تریش ناتوانین لێرە دەرچین هەموو بە حەپەساوی پەرۆشییەوە گوتیان لەبەرچی؟ حەپسەخان دڵی داخورپا و گوتی: ئەیەڕۆ! بۆ چی قەوماوە لەڕێی خودا؟! تۆفە بە قوڕلە پێڵاو تەکاندنەوە گوتی:

تۆ برۆ سەیرکە، تۆف و لافاوێکە نەبێتەوە، چەمەکە وا هەستاوە پیاو ئەبات!! هەر ناتوانین لەو ئاوە بپەڕێینەوە ، ئەبێ لەوپەڕی ئاوەکە سواربین!

خاوەن چایخانەکە هەڵیدایە گوتی: کاکە ئەوە قەیناکا لەوانەیە نەختێکیتر ئاوی چەمەکە بنیشێتەوە، ئەوە لەبەر تۆفانەکەی ئیمشەو وایلێهاتووە، بەشکم ئیتر

خۆشـــیکاتەوە. ناچـــار هەمـــوو خۆیـــان پێچـــایەوەو بێـــدەنگ دانیشـــتن. لەبەر تۆفانەکەی شەویٚ ڕێبوارێکی وا لە چایخانەکە نەبوو، تەنیا حەپسـەخان و ئەوان و یەک دوو ژن و پیـاو دوو منـاڵی شـەش حەوت سـاڵەی لێبـو، کە ئەوانـیش ئەگەڕانەوە بۆ سلێمانی.

جەماعەت هەتا چێشتەنگاوێکی درەنگ دانیشتن، هەر دەمەش یەکێکیان سەرێکی دەکێشـا و سـەیرێکی دەرەوەی ئەکـرد و کە پەڵە هەورە ڕەشـەکانی ئەدی بە نائومێدی ئەگەڕایەوە.. لە بێزاریدا یەک دوو جار لەگەڵ تۆفەبەیەکدا هـاتن بەڵام لەبەر خەڵکەکەو لەترسی دەمی هەر زوو بێدەنگ ئەبوون.

تۆفە بە بێزارییەکەوە هەستایە سەرپێ و گوتی: یاڵڵا! خوایە لەسـەر تۆ (ڕوی کـردە حەپسـەخان و ئەوان) و گـوتی: دەی بـا بـڕۆن بـزانم بەشـکو چـارەیەک بدۆزمەوە، دانیشتن هیچی لێپەیا نابێت، ئەو لێیدا ڕۆیشت، ڕونـاک سـەری نـایە بناگوێی دایکی و گوتی: دایە گیان خەریکە تاقەتم ئەچێت، خۆزگە بگەڕاینایەتەوە لای کاکە عەلی و ئەوان!

دایکی بە زەردەخەنەیەکەوە گـوتی: ئینجـا کچـم فەرقـی چییە؟ بـۆ ئەوێـش هەر باران و تۆف نییە؟

ڕونـاک چـاوی بـڕییە دەرکـی چایخـانەکە و گـوتی: خـۆ ئەویٚ هـیچ نەبیٚ چەم و ئاومـان نـایەتە ڕیٚ، پـوری هەڵـیداو گـوتی: خـۆزگە هەر نەهاتباینـایە، بەڵام خـۆ غەیبمـان پێنەبـوو، چـوزانین دنیـا وایلێـدێت، دو سـیٚ ڕۆژ بـوو زۆر خۆشـی کردبـوو، خـۆ ئەو بەیـانییەی کەوتینە ڕیٚ یەک پەڵە هەور بە ئاسـمانەوە نەبـوو، کەچـی بە مـاوەیەکی کەم کـردی بەم تۆفـانە. کەواکەی جـوان لە قـاچ و قـولیەوە ئاڵانـد، سـەرێکی ڕاوەشـاند و گـوتی: بەقوربـانییم کەس لە ئیشـی نازانێـت.. کەڕوانیـیە ڕونـاک لەبەر دڵـی ئەو بەزەردەخەنەیەکەوە گـوتی: دەی گیـانە گـویٚ مەدەریٚ سـەفەری وا بە گۆبەنـگ خۆشـە، ئەوە مـاوەیەکی تـر وا خـۆش ئەیگێڕینەوە باسی ئەکەین وەک خۆشترین یادگار!

شـیوی دووەمـیش لەویٚ مـانەوە، بەیـانی زوو تـۆفە سـەری دەرەوەی داو بەڕوویەکی خۆشەوە گەڕایەوە لایان و گوتی:

ڕۆژەکەی شـکور زۆر خـۆش دیـارە، زوکەن بـا نـان و چاییەکەمـان بخـۆین و بۆیـدەرچینتەنیا ئـاوەکەیە لەوێـش بەسـواری وڵاخ ئەتـان پەڕێنینـەوە. ئەوانـیش

زۆریــان پێخۆشــبوو، هەرزوو نــان و چاییــان خــواردو خۆیــان پێچــایەوەو پریاسـکەو تورەکەیـان هەڵگـرت و شـوێن تـۆفە کەوتـن بـۆ لای ئـاوەکە، دنیـا ساماڵێکی خۆشبو، تەنیا چەند پەڵە هەورێکی سپی بچوک بە ئاسمانەوە بوو، ئەوانیش وا ڕایان ئەکرد ئەتگوت لە خێڵ بەجێماون و بە پەلە ئەیانەوێ بگەنە هاوڕێکانیان. شاخ و دار و بەرد پاک پاک بوبونەوە، گەردیان پێوە نەمابوو، ئەو بارانە زۆرە بەگوڕە واجوان شتبونی، خەڵکیش بڵاو بوبونەوە، ئەوەی بەڕەی حەسیری هێنابووە دەرێ و پەتوی هەڵئەخست کە دڵۆپە ەڕی کردبوون بەشکو هەوایەکیــان لێبــدا، ئەوەی هەردوو دەســتی خســتبووە ژێــر هەنگڵــی لەبەر بەرۆژەکەیـا ڕاوەسـتابوو گـوایە هەتـاو دەرکەوتـووە، هەنـدێ ژنـیش خۆیـان هەڵکردبـوو هەیەکە بە نیـازێ ئەهـات و ئەچـوو، زۆریـان بەرەو ئـاو و چەمەکە ئەڕۆیشـتن. ئەمـانیش خۆیـان هەڵکردبـوو وەک و ئەوان، بەڵام هەر چەمەکەیـان لێـدەرکەوت و دەرنەکەوت ئـامە خـان لە شـوێنی خـۆی چەقـی و گـوتی: ئەی باوکەڕۆ، چۆن ئێسـتا ئەبێ لەم ئـاوە بپەڕینەوە؟ بەخـوا دایکم هەنگاوم نـایەت، ئەترسم و بەرئەبمەوە، وڵاخی چی؟ بەسـەری ئەو پێغەمبەرە سـەرم بەقوربـانی سەرییبێت، زەلامەکەو وڵاخەکەش ڕائەماڵێت، وەی پەنا بەخوا من وا لە ئێسـتەوە گێژبووم!!

خوشکی قسەی نەکرد بەڵام ئەویش سڵەمییەوە، ڕونـاک قۆڵی پوری گـورت و گوتی: نە توخوا پورێ تۆ جارێ وەرە با بزانین چۆن ئەبێت.

تـۆفە پـێش ئەوان گەیشـتە سـەر ئـاوەکە و لەگەڵ دو سـێ پیـاو کەوادیـاربوو خاوەنی وڵاخەکان بوون کەوتە قسەو چیند پێشمەرگەیەکیش هاتنە لایان.

چەمەکە هـاژە هـاژی ئەهـات هەرچـی گڵەسـور و قـوڕی ئەو کێوانەبووهەمـووی لافاو دایماڵیبوو، لەهەندێ شوێن هەر لولی ئەخوارد و بنی ئەو دار و درەختەی دەوری هەموو داپۆشیبوو، هەندێ جار لق و پۆپ و داری بە ڕەگو ڕیشەوە تیا دەرەکەوت و نوقــووم ئەبــوەوە، هەنــدێ تــاوێر و بەردی گەورەش کە لە کەنارەکەی نزیک بوون، بەڵام تێکڕا ئاوەکەیان نەئەگەیشتێ، جـار جـار بە پەلەو شـڵپ و هـوڕ شـاڵاوێکی بـۆ ئەبـردن و بەسـەریانا تێئەپەڕی وەکـو بـیەوێ بە گاڵتەوە بیانترسێنێ!.

تۆفە ئاوڕی لێدانەوەو گوتی: دەی زووکەن وەرن! حەپسەخان بە ئەسپایی بە خوشکی گوت: بۆ خاتری خوا مەڵێ ئەترسم بەوخوایە ئەو تۆفە خواگرتووە لەبەرچاوی ئەو خەڵکە ئابڕومان ئەبات، باوەڕبکە لە تۆ خراپترم بەڵام چیبکەم بابزانین ئەم پیاوانە چیمان بۆ ئەکەن، هەموو خەڵکی ئێرەن و شارەزان و هەموو ساڵێکیش ئەمە حاڵیان، قابیلە نەزانن چی ئەکەن؟. ئەوەندەی پێنەچوو چەند پیاوێک وڵاخێک و گوریسێکیان هێنا، گوریسەکانیان بەناو قەدی خۆیانەوە بەست و خۆیان بە یەکتری بەو وڵاخانەوە توند کرد، ئینجا بانگیان کردن کە بێن سواربن، توەکو یەکە یەکە بێن بیانپەڕێننەوە.
ئامە خان چاوی زەق بوو و خوشکی ووشک بوو لە جێی خۆی، هەرچی وەکو ڕوناک بوو لە هەردوکیان باشتربوو، هەروەکو فلیمی سینەمایی ئەهاتە بەرچاوی، بۆیە بێباک چووە پێشەوەو گوتی: جاریێ من دێم لەگەڵتان! دایکی پەلی ڕاکێشاو گوتی: ئەیەڕۆ کچێ جاریێ ڕاوەستا با یەکەمجار تۆفە بچێ.
تۆفەش وەکو پاڵەوان سنگی دەرپەڕاند و گوتی:
زۆر باشە من ئەڕۆم، با ئەمان سەیرکەن تاکو ترسیان بشکێ!
تۆفە سواربوو کوڕەکان دوانیان لە پێشەوەچونە ئاوەکەوەو توند جڵەوی وڵاخەکەیان گرت و ڕایان کێشا، دوانەکەی کەش ئەمەلاو ئەولایان گرت، دیمەنێکی سیر و پێکەنین بوو، ڕوناک هەرئەوەبوو نەکەوت بە گازی پشتا، دایک و پوریشی فرمێسک لە چاویان دەرپەڕی و توند دەمی خۆیان گرت. شەکان شەکانی وڵاخ و پیاوەکان و لافاوی چەمەکەئەتگوت دوژمنن بەربونەتەوە گیانی یەکتری. هەرچۆنێک بوو لە ئاوەکە پەڕینەوە، تۆفە دابەزی و بەپێکەنینو خۆشییەوە کەوتە گوشینی دەرلنگەکانی شەرواڵەکەی کەوا زۆر تەڕ ببون و هەندێ سوپاس و باوکەکەم و کاکە گیانی بەسەر زەلامەکاندا بەشکردبەرلەوەی بگەڕێنەوە ئەوپەڕ بۆ لای ژنەکان، ئینجا هەردوو دەستی نایە لای دەمی و قیراندی: دەی خێراکەن، ئامەخان جاریێ تۆ وەرە! لەبەر هاژە هاژی چەمەکە بە باشی گوێیان لە قسەکانی نەبوو، بۆیە هەر پێی پێئەکەنین.
کە زەلامەکان گەیشتنەوە لای ژنەکان ئامەخان عەباکەی توند لەخۆیەوە پێچاو تەماشایەکی چەمەکەی کرد و گوتی: ئۆە خوایە خۆ ئینسان نیوە ڕۆح ئەبێت، ئەوە بۆچی پردێ بۆ ئەم چەمە ناکەن، خەڵکی لەم بەڵایە ڕزگارکەن؟ سەیر

ئەوەی جــاری دی کە بێــرەدا تێپەڕیموانەبــوو.. هەر ئاویشـــم نەدی! یەکــێ لە پیاوەکان بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: ئاخر باجی گیان هەمیشە وانییە هەروا جار و بار کە لافاو لەسەردا دێت، چەمەکە وا هەڵئەسێ ئەگینا زۆری وەخت خەڵک هەر بە بەردە باز لێی ئەپەڕنەوە! بۆیە پردی ناوێ، دور نییە پردیشی لەســەر دروســتکرێ لەوانەیە هەر یەک دوو ســاڵ جارێـک لافـاو بیبـات. دەی سواربن با بڕۆین. ڕوناک چووە پێشەوەو خۆی پێچایەوەو گوتی: وا من هاتم. دایکیشی لەولاوە گوتی: منیش دێم با هەردوکمان پێکەوەبین. حەپسەخان دڵی نەهــات کــچەکەی بەتەنیــا بنێرێــت، زۆریشــی لەبەر ئەوەی ڕونــاک منالکــارو جوانکەلە بوولە دڵی خۆیا گوتی: چۆن ئەهێلم ئەم پیاوانە بەتەنیا کچەکەم بەرن، خوا ئەزانێت لەوانەیە لە کاتی شەکان شەکانی ئاوەکەدا دەستیان بەرقاچ و قول و ئەملاو ئەولای بکەوێت! حەپسەخان کە ئەم خەیاڵانەی هات بەبیردا گوڕی دایە خۆی و تر س ومرسی هەر لەبیریش چوەوەو گوتی: دەی ڕوناک خێراکە!. دایک و کچ پێکەوە سواربوون، ڕوناک دەستی توند گرت بەناوقەدی دایکیەوە کەوا لە دڵی خۆیا هەر خەریکی دوعا خوێندن بوو تا لە ئاوەکە دەربازبوون.
ئینجا نۆرە هاتە سەر ئامەخان ئەویش پرتەو بۆڵەوە بەناچاری سواربوو، هەر گەیشتە ناوەڕاستی ئاوەکە هاواری لێهەستا: کوڕە باوکم لەڕێی خودا بمگرن کەوتم! ئای خوایە ئەم بەڵایە چیبوو، هیچم نەما تەڕبووم ئای تاکێ پێڵاویشم ئاوبردی.. ئاخری بەهەرحاڵێ بوو پەڕاندیانەوە.
پاش جلی تەڕگوشین و خۆوشککردنەوە و نەختێ پشودانی ژنەکان، تۆفە هات پێیگوتن کەهەستن خۆیان بپێچنەوەو بچن سواری (جێبەکە)ببن، ئەوانیش بەدووی کەوتن و چوون سواری ئوتومبێلەکە بوون، کەوتنە ڕێ.
پاش چەند جار چەقینە ناو قوڕ و دابەزین و پاڵ پێوەنان کە هەندێجار خۆشیان ئەچەقین و یان پێیان هەڵئەخلیسکا و ئەکەوتن و دەستیان ئەکرد بەپێکەنین و ئایانکرد بە هەراو بەزم، بۆ بانگی شێوان گەیشتنەوە سلێمانی. و لە پاش نەختێ کردیان بە ماڵا، دانیشتوانی ماڵەکە کە هەموو بەپەرۆشەوە چاوەڕوانیان ئەکردن گەشانەوە...
بەیانی دەرو دراوسێ و خزم و ناسیاو دەستە دەستە هاتن بۆ بەخێرهاتنەوەو چاوڕونی. خەڵکی تێکرا بە (کۆدێتا.ئینقیلاب)ە کە بوژابوونەوە، باس و خواسی بووە بنێشتە خۆشــەی ژێــر ددانــی هەمــوان، هەرکەســە بە جــۆرێکی بــۆ ئەچــو، هەریەکە بە

جۆرێکی بۆ ئەچوو، هەریەکە بە جۆرێ قسەی لێئەکرد، بەتایبەتی ئەوانەی کە ژمارەیەکی زۆریان لێچوبونە شاخ و بوبونەپێشمەرگە، ئەوانە سەری زمانیان و بنی زمانیان ئەو باسانە بوو، ئەگەرچی (لە هەزار ئاشیان ئەکرد یەکێکیان نەئەمالیەوە) یەکێک بە دڵێکی خۆشەوە ئەیگوت: ئەڵێن ئەوەی ئینقیلابەکەی کردووە دایکی کوردە، گوتویەتی کوردەکان چییان بوێت ئەیانەمێ!! ئەویکە ئەیگوت: ئینجا ئەگەر واشبێت چۆن ئەوێرێ لەبەر دەوروبەر و هاوڕێکانی هەروا زوو بە ئاشکرا ئەم قسەیە بکات؟ یەکێکیتر هەڵیئەدایەو ئەیگوت: هەموو ئەم قسانە درۆنئەوە بۆچی هەرکەسە هاتە سەر حوکم یان ئینقیلابێ شتێکیوای کرد خێرا ئەیکەن بە کوردا؟ (خۆ کاکە کەریممان) ئەوە دایک و باوکی هەر نەیانئەزانی بەعەرەبی باش قسەبکەن؟! کەچی دوای ئەوەی بەسەر کورد کە هێنای هێنای! تاکەی خۆمان بەمقسە قۆڕانە دڵخۆشکەین و تەفرە بدەین، بەلای منەوە کوردی دڵسۆز و چاک و پاک ئەوانەن کە لە کۆڕی کوردایەتیدان، ئاگینا ئەوانیتر کەوا لە ڕیزی داگیرکەرانی کوردستاندان (زۆڵە کوردن)!

یەکێکیتر کە گوێی لە ناوی عەبدولکەریم قاسم بوو گوتی:

بەلای منەوە ئەگەر ئەمانە عەقڵیان هەبێ پەند لە قاسم وەرئەگرن بزانن تا کوردی لەگەڵبوو چۆن بووکە لە کوردیش هەڵگەڕایەوە چی بەسەرهات! ئەمەش هەر قسەی من نییە، هەر دوای ڕۆژێ دو رۆژ لە ئینقیلاب و کەشتنی عەبدولکەریم بە گوێی خۆم گوێم لە (ئیستگەی ڕادیۆی پاریس)بوو کەوا بەعەرەبی لەبارەی حوکمی عەبدولکەریم و ئینقیلابەکەوە قسەی ئەکرد، ئەوەم قەت لەبیر ناچێتەوە کە لەدوای قسەکانیا کابرای بڵاوکەرەوە گوتی: (... لو عالج ای قاسم) قضية الاكراد بتعقل لما كان اليوم في عداد الاموات، واتە (ئەگەر قاسم مەسەلەی کوردی بە ئاقڵانە چارەبکردایە ئیمڕۆ لەناو مردوواندا نەئەبوو) ئینجا تخوا ڕاستی نەگەتووە؟؟ هەموو دانیشتووەکان گوتیان:

بەرێ وەڵا لەهەموو کەس باشتر بۆی چووە! ڕووی بابی سپی بێت. یەکێکیتر گوتی من هەرچەند بیر بە گژداچونەکەی عەبدولکەریم ئەکەمەوە وەکو پێوەدانی هەنگ دێتە بەرچاوم، چۆن هەنگ کە بەیەکێکەوە ئەدا، ڕاستە ئازاری پێئەگەیەنێت، بەڵام خۆی ئەمرێ، ئەویش بە کوردیەوە داو خۆی تیاچوو.

ماڵی حەپسەخانیش ئەم قسەو باسانەی تیائەکرا، بەڵام بوونی تۆفە وایکردبوو کە خـزم و دۆسـت و دەر و دراوسـێ هەر بەم قسـانە تێـر نەخـۆن، داوای گێـڕانەوە بەسـەرهات و ژیـانی خۆیـان و ئەو خەڵکەشـی لێـبکەن کە لە شـاخ ناسیویانن، ئیتر تۆفەش هەر چاوەڕوانی هەلێکی وابوو کە بکەوێتە هەڵڕشتنی پڕوپڕیاسـکەی خـۆی و گێـڕانەوەی چـاکەو خـراپەی خەڵـک کە بـۆ پێکەنینـی خەڵکەکە هەندێ ترش و خوێشی پێوە ئەکرد، خۆ جار نەبوو باسی پاڵتۆکەی (ئامیر مەخفەر) نەگێڕێتەوە، ئەوانیش ئەیاندایە قاقای پێکەنین، هەندێکیان هەر بە تۆفەوە نەئەوەستان، ڕوداوەکانیان بە ئامەخان و ئەوانیش ئەگێڕایەوە.
جارێک باسی پڕو پاگەندەو درۆ و فیشاڵەکانی حکومەت ئاکات یەکێک گوتی: خۆ من کە گوێم لە ئیستگەی صەوتل جاماهیر ئەبوو ڕوداوەکانی شـەڕی باس ئەکـرد تـا مـاوەیەک هەر ئەوەبـوو کە شـێت نەبـووم لە پاشـا کە زۆرپێچـو شـەڕیش هەر دەوامـی کـرد، ئەوسـا ئـاهێکم تـێگەڕایەوە، بـۆ بەدبەختـی لە شوێنێکبووم کەسی واشی لێنەبوو کە دەنگوباسی ڕاستم پێبڵێ.
لێرەدا بەختیار گوتی: ئینجا با من باسی درۆ و فیشاڵەکانی حکومەتتان بۆ بکەم: سەرەتای پایز بوو، ڕۆژێ لە بارەگا بووین دیمان چەند پێشمەرگەیەک بەچەکەوە شـەش حەوت عەسـکەرێکیان پـێش خۆیـان داوەو کردیـان بەژورا، لێپرسـراوی بارەگا کەدی ئێمە سـەرمان سوڕماوە گوتی: خۆتـان ئەزانن کە ژمـارەیەکی زۆر عەسـکەری دیلمـان، نە ئیشـیان هەیە و نـا کـار، هەر ئەخـۆن و ئەنـون، ئەمـانەم هێنـاوە سـاوەرمان بـۆ بکـوتن کەوا خۆشـیان ئەوەنـدەی ئێمەی لێئەخـۆن. یەکێک گـوتی: ئینجـا ئەوانە ئەزانـن سـاوەر بکـوتن؟ ئەویـش ئەی بـۆچی سـاوەر کـوتین چییە؟ خـۆ تەیـارە دروسـت نـاکەن وا کـاک خدریش خەریکیـان ئەبـێ، هەم ئاگـای لێیان ئەبێت و هەم ئەگەر پێویستبوو فێریشیان ئەکات، ئیتر ئێمە کەوتینەوە ئیشـی خۆمـان و نـاو بە نـاو گوێشـمان لە داریـۆکەی کـاک خـدریش ئەگـرت کە بـۆ عەسکەرەکانی خستبووە سـەر بەغـای عەرەبی حکومەت چەند بەرنـایەکی هەبوو، بۆ هاندانی عەسکەرەکانی و (جاشـە) عەرەبەکـانی کە پێـی ئەگوتن (فرسـان الولید) و جاشي کوردەکانی کە پێی ئەگوتن (فرسان صلاح الدین).
ڕادیۆکە گۆرانی لێئەداو لەبەینی گۆرانییەکانیشا کابرایەقسـەی ئەکردو ئەیگوت: (یا قواتنا المسلحة، یا فرسان الوالید الابطال، یا فرسـان صـلاح الدین الشـجعان..

وراهم بووية وراهم). ئینجا گۆرانییەکی کەی دەستپێئەکرد، گوایە ئەمە هانی ئەو هێزە چەکدارانەی ئەدا کە هێرشبەرنە سەر کورد و ئەیگوت: دوویان کەون.. دوویان کەون.
کە گەیشتە ئەمە گوێمان لێبوو عەسکەرەکان کردیان بە قرە قڕ و هەراو هوریا، ئێمەش چووین بزانین چی بووە؟ کاک خدر مەسەلەکەی بۆ گێڕاینەوە گوتی: عەسکەرەکان کە گوێیان لە کابرای ئیستگە بووە گوتویانە: ئەی هێزە چەکدارەکانمان! ئەی سوارە دلێرەکانی وەلید! ئەی سوارە ئازاکانی صەلاحەدین (یاخیەکان جێ بە خۆیان ناگرن)..
دوویان کەون باوکەکەمن دوویان کەون.. توڕە بوون و گوتویانە: (هي كلب بن الكلب قواتک المسلحة جاعدة تهبش)، واتە: هەی سەگی کوڕی سەگ، هێزە چەکدارەکانت ئەوەتە دانیشتون ساوەر ئەکوتن! (خەڵکەکە هەموو دایانە قاقای پێکەنین کە گوێیان لەم قسانەی بەختیار بوو).
یەکێک لە گوێگرەکان گوتی: لێپرسراوی بارەگاکەمان کوڕێکی زۆر زیرەک و کوردێکی زۆر دڵسۆزیشبوو نەیهێشت ئەم هەلە لەدەست بچێت، کەبوو بەقاوەڵتی بە خدری گوت: کە ئەسیرەکانیش بهێنێت هەموومان پێکەوە نان و چاکەمان بخۆین تاوەکو بزانن کە خواردنی ئێمەو ئەوان فەرقی نییەوهەندێ قسەشیان لەگەڵ بکا، بەڵام ئەوەی ڕاست بێ لە جنێو بە حکومەتدانا ئەوان لە ئێمەیان بردەوە یەکێکیان ئەیگووت: ئەو سەگبابانە خۆیان لە ئیسراحەت و کەیفا دانیشتون لە بەغداو ئێمە ئەنێرن بۆ شەڕو ئەڵێن: کورد کافرن و وان و وان.. هەر بە شالاوێک لە ناویان ئەبەن، کەچی سەریان داوە لە بەرد، کورد هیچ کافر نین و زۆریش پیاون، برا لێپرسراوەکەش پێیگوت: پێویست بە قسەی ئێمە ناکات، ئەوە ئەوان ئێوەیان ناردۆتە سەر کوردو ئەیانەوێ لەناوی بەرن، کوردیش لەسەر ئەرز و خاک و ماڵی خۆیان ئەکەنەوە و ئێمە نە پیاوکوژین و نە حەزیش بە شەر ئەکەین بە پێچەوانەوە گەلێک عەز بە برایەتی ئەکەین لەگەڵ هەموو کەسێکدا بەتایبەتی لەگەڵ ئێوەدا. ئەوان خەڵکی بێچەک و بێدەسەلات و بێگوناهی کورد ئەگرن و لەژێر ئازاا ئەیکوژن، نەخوازەڵا چەکدارەکانمان، ئێوەش ئەوەتا بە چاوی خۆتان ئەیبینن ئێمە چۆنتان سەیر ئەکەین و چۆن لەگەڵتان معامەلە ئەکەین!!

دوای چەنـــد ڕۆژێکیتـــر دەنـــگ بـــڵاو بـــوەوە کە حکـــومەت ئەیەوێ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش گفتوگۆ بکات، وا وەفدی کورد ئامادە ئەبێت کە بچێت بۆ بەغـدا. بەم هەواڵە خەڵکـی بە جارێـک وروژان، شـەقام و کۆڵانەکـانی شـار و بەردەرکـی سـەرا هەمیشـە جمـایەن ئەهـات، زۆر کەس کە بەسـاڵاچوو دنیـا دیـدەبوون، هەروا سـەریان ڕائەوەشـاند و هـیچ باوەڕیـان نەئەکـرد کەوا ئەم حکومەتەش ڕاست بکات و هەتا سەر نیازی باش بێتبەرامبەر بە کورد، بۆیە کە ئەو خەڵکەیان ئەبینی وا کوڕو خزم و لاوی خوێنگەرم خەڵکی خۆشباوەڕیش توشی دەمەقاڵێ ئەبوون، دنیا دیدەکان ئەیانگووت:

- تۆزێک خۆتـان ڕاگـرن و وا بە جارێـک خۆتـان دەرمەخەن و ئاشـکرا مەکەن، بە چ مەعلووم دیسانەوە وەزعەکە تێکناچێتەوە، ئەوسا هەموو بەسەرا ناکەوینە چاڵەوە؟ کێ ئەڵێ ئەمـانیش بە فێڵ دەستی دەستیتان پێنـاکەن تـا جێی خۆیـان قـایم و پتەو ئەکەن، ئەوجـا لەوانـی پێشـوش خراپتر نابن؟ تەجرەبەی ڕابردو زۆر باش دەریخستووە کە باس هـاتە سەر هەقی کورد، ئەمـانە هەموویـان وەک و یەکن ئەڵێی کورد داوای میراتی باوکە گۆڕبەگۆڕەکانیـان لێئەکـات، بە دوریشـی مەزانن نیازیـان لە وەفـد هـاتن ووەفـد چـونەش لەسـەرێکەوە ئەوە نەبێـت کە پشـتی خەباتکەرە کوردەکان سارد بکەنەوە، چونکو ئەواتا خۆتـان ئەبینن هـی وامـان هەیە هەر گـوێی لە نـاوی گفتوگـۆ بـوو ئیتـر دەسـتی چەکەکەی ناگرێت و بێخەم پاڵی لێئەداتەوە وا ئەزانێت ئیتر هەموو شتێک تەواو بـوەو دنیا بە کەیفی ئەو ئەبێت!؟ لەسـەرێکی تریشـەوە حکومەت بۆیە خۆی وا بە ئاشتیخواز و دۆستی کورد پیشان ئەدات کە لە مـاوەی ئەم گفتوگۆ و هـاتوچۆیەدا بتوانێت هەنـدێ تەفـرە بـداو بکڕێـت، و هەنـدێ لەنـاو بەرێـت و بە پێـی تـوانینی خـۆی و سـاردی و گەرمـی نێـوان کاربەدەستەکانی شـۆڕش و پـارتی تۆوی گومـان لەنێویانـدا بچێنێت و ناکۆکی دروست بکات؛ بە کورتی و بە کوردی ئەو کەسـەی ئەیەوێت خۆی گێل و گەوج بکات ناتوانێ بە هـیچ جۆرێکیتر ئەوە لەبیری خۆی

بەرێتەوە کە حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان هەرچی لەدەستیان بێت ئەیکەن بۆ ئەوەی ناکۆکی بخەنە ناو ڕیزی کوردەوە.
کە ئەمان ئەم جۆرە قسانەیان ئەکرد ئەوانیتر تورە ئەبوون و ئەبوون بە فیشەکە شێتەو ئەیانگووت:

- لای ئێوە هەروایە مەسەلە هەر وا بە گاڵتە گیراوە، نازانن کە هەموو شتێک بیری لێکراوەتەوەو هەمشی بە باشی دوایی دێت و هەقی کوردیش ئەدرێت، بۆچی بە ئارەزووی خۆیانە؟ نەیدەن شەڕ دەستپێدەکەینەوە. یەکێکی کەیان ئەیگوت: کوڕە بابە ئێوە ئاگاتان لە چییە، بەخوا یەکێک کە پەیوەندی بە کاربەدەستانی ئێرەوە هەیە ئەو ڕۆژە بە چاوی خۆی نامەیەکی ڕەسمی دیوە کە تیای نوسراوە هەموو سەرکردەکانی ئینقیلاب لەو ڕەئیسیەدان کە ئەبێ دڵی کورد ڕازی بکرێت.. یەکێکیتر ئەیگووت: من بڕوام هەیە بە ڕاستی ئەو قسەیە، چونکە ئەو شەوەی کە موزاهەرەکەی تیاکرابە بۆنەی ئەوەوە کە گوتیان، حکومەت ئەیەوێ گفتوگۆ لەگەڵ کورد بکات و وەفد خەریکە ئەچێ بۆ بەغدا هەندێ کەس لە خۆپیشاندەرەکان کە گەیشتنە بەردەرکی سەرا ویستیان بچنە سەر دەبابەکان قسە بکەن، عەسکەرەکان خۆیان دەستیان ئەگرتن و سەریان ئەخستن و تەقەیان لەگەڵ ئەکردن و پیرۆزباییان لە یەکتری ئەکرد و هەندێ ژنیش لە خۆشیانا چوونە سەر دەبابەکان (تانک) و هاواریان ئەکرد: هی خۆمانە!! هی خۆمانە! ئەم بەسەزمانانە بەبێ ئەوەی بزانن چی ئەڵێن بە ڕوویەکی خۆشەوە لەگەڵیان ئەگوتنەوە.. باوەڕ بکەن بەقەد ئێمەیان پێخۆشبوو.. نازانم ئێوە بۆ هەر خەیاڵتان بۆ شتی خراپ دەچێت؟ دنیا کونبڕ ئەکەن و بە قوڕی ئەگرن!؟.

***

وەفدێ چوو بۆ بەغداو پاش سێ چوار ڕۆژ گەڕایەوە بۆن شاخ، ئینجا وەفدی حکومەت چووە لایان، پاش گەڕاندنەوەیان بە چەند ڕۆژێک وەفدی کورد بە داخوازییەکانییەوە چووەوە بۆ بەغدا کە بیدات بە عکومەت، خەڵکیش ئارامیان لەبەر بڕابوو، بە پەرۆشەوە گوێیان هەڵئەخست بۆدەنگو باسی ڕادۆو قسەو

باسی خەڵک، هی وا هەبوو لە ءێستەوە مەڕی حازر کردبوو بیکات بە مەولود، هەبوو جل و بەرگی شایی کڕیبوو، هەندێ خێر و سەدەقییان بڕیار دابوو ئەگەر ئیشەکە بە دڵی کورد بوو بیکەن. هەندێ کەسی دیکەش خەیاڵ لە شایی و هەڵپەڕکێ و مەولود و قوربانیش تێپەڕ بوو بوو، خۆی بۆ وەزیفەی گەورەو دەستکەوتی چاکهەڵگرتبوو، لە دڵی خۆیانا ئەیانگوت: خۆ ئێمەش خلەنین، هەر ئەبێ لەم هەق وەرگرتنە پریشکێکمان بەرکەوێت.. هەندێکیش دەفتەر و قەڵەمی گرتبوو بە دەستەوە، لیستەی بۆ زەرەر و زیانەکانی خۆی ئەگرت و لای کەمی یەکی بە چوار و نرخی بە دوو، سێ ئەوەندەی خۆی دائەناو مرخی لە پارەیەکی باش خۆشکردبوو کە حکومەت ئەو زەرەرانەی بۆ ببژێرێت.

***

کە گفتوگۆکە نەختێ درێژەی کێشا، خەڵک کەوتنە لچ هەڵقورتاندن، ئەو ئەیگوت: بەخوا هەق نەبوو کورد وا زوو وەفدی خۆی بنێرێت بۆ بەغدا، ئەبوو تۆزێک خۆیان قورس بگرن پەلەیان چیبوو؟ ئەبوو جارێ ڕاوەستن.

هەندێ کەسیتر بە توندی جوابیان ئەدانەوە لەم قسەیەک و لەو قسەیەک تۆزێکی ئەما کە دەست بدەنە یەخەی یەکتری، ئەیانگوت: وەڵا ڕاست ئەفەرموون کورد زۆر پەلەی کرد کە جوابی حکومەتی دایەوە، ئەوە ئێوە قسی سەر دۆشەک ئەکەن کە دانیشتوون لە ماڵ و حاڵی خۆتاندا بێخەم و بێباک تیکە ئەگلێنن، هەر ئاگاشتان لە حەڵی ئەوان نییە، ئەوانەی لە شاخن لەژێر بارانی گوللەو بۆردومانا بێکەس و بێپشتیوان خەبات ئەکەن، باوەڕ بکەن هەندێجار نانی ڕووتیشیان دەستناکەوێت بیخۆن، لە چلەی زستان و قرچەی هاوینا بەو کەژ و کێو دەشت و دەرەوە بە چەکێکی کۆنو کەمەوە لەگەڵ هێزی پڕ چەکی تازە و زۆری حکومەت و تۆپ و تانکی شەڕ ئەکەن بە بێ ئەوەی کەسێلایەکیان لێبکاتەوە. زۆر جار نەک ڕێگایان لێئەگیرێ، لەخوا زیاتر دەستیان بە کەسا ناگات، ئێوەش هەر پاڵی لێبدەنەوە لرفی بێ بدەن و قسەی زل بکەن!!

ئەویتر ئەیگوت: باوکم ئەوان ئیشی خۆیان لە من و تۆ باشتر ئەزانن، هیچ باوەڕ ئەکەی ئەوان خۆیان لە خۆشی دنیا بێبەش کردبێ، گیان سەروماڵیان لە پێناو سەرکەوتن و بەدەستهێنانی هەقی میلەتەکەیاندا دانابێلە من و تۆ کەمتر بەتەنگ ئەوەوە بن کە ڕەنج بێبەر نەبن؟ بیریان لە هەموو بارێکی مەسەلەکە

نەکردبێتەوەو ڕێو شوێنیان بۆ هەموو ئیحتیمال (وێچوون)ێک دانەنابێ و هەروا گەجانە باوەڕیان بە قسەی حکومەت کردبێ و خۆیان خستبێتە داوییەوە؟؟ ڕاستە ئەم ئیش و کارە هەقی نەک هەر ئێوە هی هەموو کوردێکیشی پێوەیە چونکە سەرکەوتنی ئەوان سەرکەوتنی ئێمە و خوانەخواستە ژێرکەوتنیشیان سەرشۆڕی ئێمەیە چونکە هەموو کوردین و هەقەکە هینی هەموومانە، بەڵام بەلای منەوە هەقی ئەوەمان نییە ئێمە لێرەوە بکەوینە ڕەخنەلێگرتن و قسەپێگوتنیان، بڵێین بۆ وایان کرد و بۆ وایان نەکرد. بەتایبەتی کە ئاگامان لە کاروباریشیان نییە. ئەگەر ڕاست لە ناویانا بژین و خۆشی و ناخۆشییان لەگەڵ بچێژین، ئەوسا حەز ئەکەین دەست بکە بەچاوی ئەو کەسانەیانا کە هەڵە ئەکەن!!!

لەپڕ یەکێک لە دانیشتووەکان وەک بیری بکەوێتەوە ئەیگووت: کوڕە کاکە لۆمەیان مەکەن، پیاوم ئەوێت بەو بەفرو سەرمایە بتوانێ بەسەر ئەو شاخ و کێوانەیا سەرکەوێت، بەخوا سەربەرەوژوور و هەورازی وای لێیەکە شەوو ڕۆژ پێشمەرگە پیایا دێت و ئەچێ کە هەر مەگەر بزنە کێوی بتوانێ پیایا سەرکەوێ، هەر قاچیان بترازێ پارچەشیان نادۆزرێتەوە، لەگەڵ ئەمەشا وەنەبێ ئەوان لەو حاڵە بێزار بوبن، یان لە خەباتی خۆیان پەشیمان بن بەڵام وا حکومەت هاتۆتە پێشەوە لێیان و دەستی دۆستی بۆ درێژکردوون ئەڵێ وەرن ڕێکبکەوین، ئیتر بە درۆی بێت یا بە ڕاست ئەم قسەیە ئەکات، جا لەم حاڵەدا ئەمان ئەبێت بڵێن: نەء.. سەگباب نایەین ئێمە.. هەر لەسەر شەڕی خۆمان ئەڕۆین.. ئەگەر بیرتان بێتلە بەیانی کۆبونەوەکەی (عەودالان)ی کۆنفرانسی پارتیدا شەڕ بە هەنگاوێکی ناچاری دانرابووبۆ پاراستنی گەلەکەمان لە هێرشی هێزی دڕندانەی دوژمن دەستی پێکردبوو و پێشمەرگە وەک هێزێکی بەرگری نیشتیمانی ناوی نرابوو، بۆیە پێویستە لەسەر ئەمان بۆ کورد و بۆ گەلانی دنیاشی ئیسپات بکەن کە ئێمە ئاشتیخوازین و شەرمان بەزۆر بەسەرا سەپێنراوە، ئەوەش هەر بە قسە ناکرێت کە حکومەت گوتی وا من شەڕم وەستان و ئامادەی گفتوگعم لەگەڵتان، ئەبێ ئەمانیش بڵێن باشەو بەدڵ بکەونە گفتوگۆبۆ دەستخستنی مافی ڕەوای کورد لە ڕێی ئاشتی و دۆستییەوە ئەگەر حکومەت ڕاستی کردو مافی خۆمان داینێئەوا گەیشتین بە ئاواتێکی گەورە

بەنرخێکی لەچاو ئەوا کەم، خۆ ئەگەر درۆشیان کرد ئەوا لایدنای ڕسواتر ئەبن و کوردیش نە چەکیان داناوەو نە کۆڵیان داوە، مەسەلە ئەبێ بە پشودانێک بۆ شۆڕش وەکو لە یەکێکی ئاگاداریشم بیستووە پشودانەکەش بە فیڕۆ ناڕوات، لە هەمـــوو ڕوویەکەوە خەریکـــی تفـــاق دانـــان و زەخیـــرە کـــۆکردنەوەن بـــۆ بەرەنگاربوونەوەی خراپترین ئیحتیمان، بۆیە بەلای منەوە ڕەوای هەق نییە کە کوێرانە پلاریان تێبگرین، هەرچۆنێک بێت نابێ (کەوچک لە پشکۆ گەرمتر)بێ!.

ئێوارەیەک حەپسەخان خوشکی لەبەر دەرگا میوانیان بەڕێ ئەکرد کە لاندلۆڤەرێک هات و لەبەر مەڵەکەیانا ڕاوەستاو چەند پێشمەرگەیەکی لێدابەزی هەرکە چاویان بە پێشمەرگەکان کەوت قیژاندیان: وەی لە دەورتان گەڕێم خۆ ئەمە عەلی و ئەوانن!! هەر لە دورەوە عەلی گۆچانێک بە دەستەوە بە پێکەنینەوە هات بەرەو ژوور، لەگەڵ ئەوانیتر و هەموو کەتنە دەستەملانی یەک و چاوڕوونی کردن لە یەکتری و کردیان بە هەراو دەنگە دەنگێک لە حەوشەکەدا حاجی مەجید کە تازە هاتبوەوە مەڵێ و لە ژورەوە دانیشتبوو، بەسەرسوڕمانەوە لە پەنجەرەکەوە تەماشای حەوشەکەی کرد کەدی کوڕەکانن، ئەویش بە هەڵەداوان هاتە ناویان و کەوتە دەست لە مل کردن و ماچکردنیان، بەڵام لەگەڵ ئەو خۆشییەشدا کە ئەیویست نیشانی بدا بینینی عەلی کوڕی بە گۆچانێکەوە بە شەلە شەل، لاواز و ڕەنگ زەرد وا دڵی داخورپاندکە هەرچی کورد و کۆشا نەیتوانیمەتییەکەی پێبشارێتەوە. کە چوونە ژورێ، حسەین بۆ ئەوەی نەختێ خەمی باوکی بڕەوێنێتەوە کەوتە قسەی خۆشکردن ئینجا ڕوی کردە باوکی و گوتی:

- ئا حاجی گیان، هەقی ماتیت نییە، ئەوە کاکە عەلی بەبەرچاوتەوە شکور زرمەی دێت، دڵی خۆش و بەکەیفە. ئەگەر بۆ قاچیشی ئەڵێیت هیچی وای نییە کە جێگەی مەراق بێت، لە شەڕەکەی چەمی ڕەزاندا تۆزێک برینـدار بوو ئێستەش ئەگەر ئەوەندەی تۆزێکیش گون لە چاکبونەوەی ببوایە، دکتۆر نەیئەهێشت بێتەوە تا چاک چاکی نەکردایەوە، نازانم چۆن کوڕێکی لێزان و دڵسۆز تیماری کردوە، پێی گوتووە هەفتەیە دە رۆژ بە گۆچان برۆ تا قاچت هیچ ئازاری نەمێنێت. ئیتر ئەوە دەردی کابرا گوتەنی: ئەوە ئاوهایەو ئا!

عەلی قسەکەی لە دەم حسەین سەندەوەو بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە گوتی: ئیتر یا کوردستان یا نەمانە، بابە گیان خۆ من ماویشم، ئەوەتا زل و زەلام بەرامبەرت دانیشتوم!!

حاجی بە کزییەکەوە دەستێکی بەریشیا هێناو گوتی:

- یارەبی سەدجار شکور، وە هەندێ قسەی کەشی لەژێر لێوەوە کرد، وادیار بوو دوعای ئەکردو لە خوا ئەپاڕایەوە، زۆریشی لە خۆی ئەکرد

که نەوەکو فرمێسک دەستی بخاتە ڕوو، لێرەدا حەپسەخان کردی بە ژوراو ڕوی کردە مێردەکەی و گوتی:

- ئەوە چیتە پیاوەکە؟ لەباتی ئەوەی خێر بکەیت و شوکری خوا بکەیت کەچی مات بوی و خەریکی خەفەت ئەخۆی؟ دەستێکی خستە سەر شانی و بە نازێکەوە گوتی: دە ئیتر تو سەری عەلی خۆشییەکەمان لێ تێک مەدە، کوڕەکە چاکە شکور خەفەتی مەیەرێ!

ئینجا عەلیش بۆ دڵخۆشکردنی باوکی کەوتە قسەکردن، باسی وەزع بە گشتی و گفتوگۆکەی بۆ گێرایەوەو گوتی: ئەمجارە کە چوونەوە منیش لەگەڵیان ئەچم قسەکانی تا ئێستەیان خراپ نییە هیوا هەیە کە ئەمان باشبن هەرچۆنێک بێن هەر چوون چاکترە بزانین ئەگەینە چی؟ کەچوون کوردۆ دایکیشت لەگەڵ خۆم بۆ ئەهێنمەوە، ئەزانم زۆر بیریان ئەکەیت.

باوکی بە خۆشییەوە گوتی ئەرێ بەخوا زۆر حەزئەکەم بیانبینم. چەند ڕۆژک لەمەو بەر کاغەزی نەوبەهار هاتبو نوسیبوی: وا دیارە (کوردۆ) گیان پێو قەدەمی خێربووە، وا شکور ئینقیلاب کراو حکومەتی پێشو لابراو ئینشەڵا خێری زۆرتریشی بەناوچەوانەوە ئەبێت. حاجی هەستایە سەر پێی گوتییەوە: یاڕەبی ڕۆڵە بەخێربێیتەوە،ماڵی خوا ئاوا بێت و هەزار جار شکور... ویستی دوعایتر بکات عەلی قسەکەی پێبڕی و بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: "بابە گیان ئەوانەی شەهیدبوون ئێستە دایک و باوکیان ئەبێت چی بڵێن و چی بکەن. بزانە ئێوە بەو تۆزە قاچشکانەی من چیتان لێهات؟!"

باوکی سەریباداو گوتی: بڵێ چی ڕۆڵە بەخوا هەرچییەکیان بۆ بڵێم هێشتا هەر کەمە، بڵێم خوا سەبوریان بدات، بڵێم خوا جەزایان بداتەوە؟ نازانم چی بڵێم قسەیەکم بۆ نایەت لەقەد کۆستەکەیان بێت!!"

عەلی گوتی: بەخوا باوکە گیان ئەگەر باسی باوکی شەهیدێکت بۆ ئەگێڕمەوە هەر سەرت سوڕ ئەمێنێت، ڕەنگە کەس هەر باوەڕ نەکات!!"

باوکی خەریکبوو دانیشێتەوە، بەڵام عەلی بۆ ئەوەی کە تێیبگەیەنێ کە لە چاکبونەوەیایە خۆی هەستایە سەرپێو لای باوکییەوە ڕاوەستاو گوتی: پێش شەڕەکەی ئەم دواییە شەڕێکیتر قەوما لە ناوچەکەی ئێمەو لە خەڵکی دێهاتی ئەو نزیکانەمان پێشمەرگەیەک شەهیدکرا، کوڕێک تا بڵێی بە جەرگ و

هەڵکەوتوبــو، کــوڕی گەورەی دایــک و بــاوکی بــوو بڕیــار درا کە لە بارەگــا تەعــزییەی بــۆ دانــێن، هەر دەنــگەکە بــڵاو بــوەوەو نەبــوەوە گوتیــان بەوکــی شەهیدەکا هاتوە ئەیەوێت یەکێک لە لێپرسراوانی بارەگا ببینێت، ڕاستت ئەویٚ هەموو حەپەساین ئەو ئەیگوت تۆ بچۆ و ئەو ئەیگوت تۆ بچی چاکترە چونکە کەس دڵــی نەئەهــات کە بچــیٚ چــاوی بە بــاوکێکی کۆســتکەوتوی جگەرســوتاو بکەوێت. هەروەهـا ترسـی ئەوەشیان هەبوو کە دڵی گەرم بوبێت قسـەیەکی بە جۆرێک بکا ببیٚ بە هۆی دڵیەشان، چونکە بەڕاستی کوڕەکەی کوڕبوو نە گەڵتە! ئاخری بە ناچاری یەکێک چوو بۆ چاوپێکەوتنی، هەرچەندە دەستیشـی لەسـەر دڵی بوو.. عەلی وادیـار بـوو قـاچی هـاتبوەوە ئـێش بۆیە بە بـاوکی گـوت: "بـا دانیشین بابە گیان باسەکە نەختیٚ درێژە" ئینجا خۆیشـی خۆی بەردایەوە سـەر کورسـییەکەی نزیکـی و بـۆی دانیشـتەوەو کەوتەوە گێڕانەوەی بەسـەرهاتەکەو گوتی: "ڕاستت ئەویٚ نەک هەر ئەو، ئێمەش هەمووەمـان دەسـتمان لەسـەر دڵمـان بوو تا هاتەوە.." حاجی خۆی پێنەگیرا گوتی باشە بۆچی هاتبوو؟".

عەلی لەسەر خۆ گوتی: "بـاوکی شـەهیدەکە بە برادەرەکەمـانی گوتبوو بیسـتومە ئەتانەویٚ تەعزیە دابنێن بۆ عەزیـزی کوڕم کە دوێنـیٚ شـەهید کراوە، مـن ئەڵێم ئێـوە هـیچ خۆتـان بەو ئیشـانەوە خەریـک مەکەن، هەقـی کـورد وەرگـرن ئەوسـا تەعزییەکــی گەورە بگــرن، بــۆ هەمــوو شــەهیدەکان، ئەگەرچــی بە ئەقڵــی مــن ئاوســایش وەختــی شــایمان ئەبــیٚ نەک شــیوەن ! ئەگینــا ئەمە چــۆن ئەبێــت هەریەکێـک کـوژرا ئێـوە بـۆی دانیشـن، بە گیـانی مـن ئێـوە فرمـانی فەرزترتـان لەســەر شــانە کــوڕی باشــبن وەختــی بەنرخــی خۆتــان بەم چەنشــنە کــارانە مەکـوژن!" عەلـی دەسـتێکی خسـتە سەرشـانی بـاوکی، کە بـۆ بـاش گوێلێبـونی قسەکانی هاتبوە تەنیشتییەوەو گوتی:

- "ئینجا باوکە گیان بە باوکی وەک ئەم پیاوە ئەڵێیت چی؟"
- "ئەڵێم چی؟ ئەڵێم سـەد ڕەحمەت لە گۆڕی ئەو دایکو بـابەش بێت کە پیـاوی وا ئەخەنەوە، دەک سـەرفرازی لای خوابێـت بـۆ خـۆی و دڵ و دەرونـی. بەڕاسـتی دڵـم گەشـایەوەو گومـانم لەوەدا نەمـا کە کـورد هەر سـەرئەکەوێت، گیـانە کەمـن نابێت بە هـیچ جۆرێـک نـاوی ئەو چەشـنە قارەمانانەتان لەبیر بچێتەوە.."

- حسین لەم کاتەدا هات بەسەر قسەکانا، گوتی: "بابە گیان چۆن ئەو کەسانەمان لەبیر ئەچنەوە؟ ئەو کەسانە بە مامۆستای خۆمان ئەزانین و کردەوەکانیان ئەکەین بە سەرمەشق بۆ خۆمان و بۆ هەموو کوردێکی دڵسۆزیش."

هەموو بێدەنگ بوون تا حاجی بێدەنگییەکی شکاند، لە عەلی پرسی:

- تۆ بڵێیت ئەمانە شتێک بدەن بە کورد؟ ئەترسم ئەوانیش دەستی دەستیمان پێبکەن!".

عەلی کە وادیاربوو هێشتا هەر خەیاڵی لای شەهید عەزیز و قسەکانی شێخ سمایلی باوکیبوو، لە دەنگی باوکی هاتەوە سەرخۆو گوتی:" ئەوی ڕاست بێ بابە وەکو عەرزم کردیت هێشتا ئەنجامی گفتوگۆکە دەرنەکەوتووە، کە وەفدەکەمان ئەبینن و قسەیان لەگەڵ ئەکەن، وا پیشان ئەدەک کە هەموو داخوازییەکانمان هەر ئێستە جێبەجێئەکەن، کەچی هەر لە دانیشتنەکە بونەوە دیسانەوە ئەکەونەوە بڕوبیانو گرتنو ئەڵێن با هێشتا قسەی لێبکەین، یان با پرس بە حیزب بکەین.. ئیتر هەرچۆنێک بێت قۆرتێک تەگەرەیەک ئەهێننە پێشەوەو بیانوویەک ئەدۆزنەوە، لەگەڵ ئەمەشا هەندێکیان وەکو برادەران ئەڵێن بەدڵ حەز ئەکەن ئەم ڕێکەوتنە سەربگرێت، بەڵام زۆرێکیشیان هەن پێیان ناخۆشەو هەر تەگەرەی تێئەخەن. بەڵام هەرچۆنێک بێت وابزانم بەرەو پاش ئەڕوات، لە ئاخریا هیچیش نەدەن هەر باشە چونکە ئەم شەڕ وەستانە پشوودانێکە بۆ پێشمەرگەو بۆ خەڵکەکەش. جا ئەگەر خراپ بوون خراپیان پێئەکەین، چاکیش بوون چاکتر ئەبین لەگەڵیان. ئێمە شەڕخوازنین بەڵام دەست لە هەقی میلەتەکەشمان هەڵناگرین. سا بەشەڕ دەستکەوێت یان بە ئاشتی، بێگومان ڕێگەی ئاشتیمان پێخۆشترە ئەوانیش کەیفی خۆیانە"

- حاجی گوتی: بڵێم چی ڕۆڵە، خوا چاکیکات و خوا لەسەر ئەم کوردە هەژارە بێت.. ئێمەمانانیش هەر دوعای خێرمان لەدەست دێ."

- عەلیش گوتی: "لەسەر خوا بەقسە ئەڵێن ئەمجارە هەموو شتێک ئەبڕێتەوەو بەیان دەرەچێت.."

لێرەدا حەپسەخان و ڕوناک کردیان بە ژوراو بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتیان "دەی هەستن مناڵان لەودیو چاوەڕوانتانین بۆ نانخواردن!!".

دایکی عەلی دەستی کوڕەکەی گرت و گوتی: دە هەستە بەقوربانتبم شتێ بخۆ" ڕووی کردە مێردەکەیی و گوتی: دە تۆش بەرۆکی بەردە جارێ هیلاکە ئەوەندە پرس و پرسیاری لێمەکە پیرەمێرد!!"

***

پـــاش ۲،۳ ڕۆژ بـــرادەرێ نـــامەیەکی بـــۆ عەلـــی هێنـــا، تیانوســـرابوو کەوا ســـەرکردایەتی پـــارتی چـــونکە ڕاپـــۆرتێکی تەواوی لەبـــارەی داخوازییەکـــانی کـــوردەوە نـــاردووە بـــۆ (مەجلیســـی قیـــادەی ســـەورە) نـــاردنی "وەفـــد"بۆ بەغـدا هەفتەیەک دوائەخرێ بۆ ئەوەی هەلی لێکۆڵینەوە ڕاپۆرتەکەیان بدەینێ.
خەبەری ئەم دواخستەنەی ناردنی وەفد بۆ بەغداو ناردنی ڕاپۆرتێک لەبارەی داخوازییەکـانی کـوردەوە هەم شـەپۆلی قرەقـڕی خـاو کـردەوەو هەم باریشـی گۆڕی و خەڵـکەکە هەڵوێسـتی ڕاسـت و ڕێکـوپێکی دڵسـۆزانەی سـەرکردایەتی پارتی گەیشتن و بە دڵنیاییەوە کەوتنە چاوەڕوانی.
دواخستنی ناردنی وەفد بۆ بەغدا لای ماڵی عەلیش خەبەرێکی زۆر خۆشبوو، تەنـــانەت لای عەلـــی خۆیشـــی هەرچەنـــدە دەری نەئەبـــڕی، هـــۆی گەورەی پێخۆشـبوونەکەی ئەمـان ئەوەبـوو کە مـاوەیەکی زۆرتـر ئەدا بە عەلـی کە تیایـا چاک بێتەوە، بەڵام هینەکەی ئەو خۆی جگە لەمەو لەمەش گرنگتر ئەوەبوو کە هەلێکـی زۆرتـر ئەدا بە سـەرکردایەتی شـۆڕش کە کاروبـاری خـۆی باشـتر تیـا ڕێکبخات.
هەفتەیەک تێنەپەڕیبوو کە هـاتن بە عەلییـان گـوت: خـۆی ئامـادە بکـات سـبەینێ وەفد ئەچـێ بـۆ بەغـدا لەسـەر داوای حکومەت. "وەفـد" چـووە بەغـداو خەڵکیش کەوتـنەوە ڕمڵێـدان، حەپســەخان کە کوڕیشـــی لە وەفـدەکەدابوو لە زۆریـــان سەریقاڵتر و مێشکی ئاڵۆزتر و دەورووپشتیشی قەرەباڵختربوو.

***

چەنـد ڕۆژێـک پـاش ڕۆیینـی وەفـداکە چێشـتەنگاوێک حسـەین هـاتەوە مـاڵێ بەڕوویەکـی خۆشـەوە، دایکیشـی بە پەرۆشـەوە چـوو بە پیـرییەوەو گـوتی: "هـا دەنگ و باس چییە" هیچ نەبووە؟"

حسـەین بە شـەوقەوە پەلامـاری دایکیداو گـوتی: باشـە ئەگەر مژدەیەکت بەمـێ چیم مزگێنی ئەدەیتێ؟" دایکی بە پەلە دەستی خۆی ڕاپسکانو گوتی: زوکە هەی کافر مژدەکەت چییە پێمبڵێ و چیت ئەوێ بتدەمێ!" حسین گوتی:

"تەواو شوکر! ئیمڕۆ سەعات شەسی ئێوارە بەیانیش دەرەچێت.

ئیتـر چـی هەیە لەو خەبەرە خۆشـتر؟ بەیـانی لە بەغـداوە تەلەفۆنیـان کـردووە. "دایکە کە گوێی لەم قسەیە بوو وا هەڵیکوتـایە سـەر کوڕەکەی سـەرو پۆتەڵاکی شێواند و کەوتە مـاچکردنی و بە دەنگێکی بەرزیش کەوتە بـانگکردنی کچەکـان: "نەسـرین ڕونـاک کچینە ڕاکەن مژدەیەکـی خۆشـتان بـدەینێ!" کچـان و حەلاوی دراوسێشـیان کە لەوێبـووبەهەڵەداوان هـاتن بە هـاوارییەوەو کە خەبەرەکەیـان بیست کردیان بە قریوە قریوو هەرا. حەلاو هەر زوو ڕایکردەوە بۆ ماڵی خۆیان و لە ڕێگـا هەنـدێکیان هەر کە بیسـتیان گـورج ڕادیۆکانیـان خسـتەکار و دەنگەکەشیان بەرزکردەوە ئەگەرچی زۆریشیان هەر لە عەرەبی نەئەگەیشتن و لەوانەش نەبوو کە بەیانەکە بە کوردیش لەو سەعاتەدا بڵاوبکرێتەوە.

خەڵکـی بـازاڕ کەوا زوتـر خەبەرەکەیـان بیسـتبوو، دەسـتبەجێ دوکانەکانیـان هەڵگتبـوو، ئەوی ڕادیـۆی هەبـوو ڕۆیشـتبووە مـاڵەوەو ئەوی نەیبـوو چوبـو بـۆ چایخانەکـان،، کە گـوێ لە بەیـانەکە بگـرێ. ڕونـاک ئەگەرچـی دڵـی خۆشـبوو ئەویـش هەنـدێ لە هەیـوانەکە هەڵـبەزی، بەڵام گـورج مـات بـوو، لە دڵـی خۆیـا گـوتی: "تـۆ بڵێیت ئیتـر چـوونە شـاخ و مـاوەت نەمێنـێ" ئەی بێسـتون ئـاخۆ چـی بکات؟" بەڵام لەپڕ لەسەر دەنگی حسەینی برای هاتەوە سەر خۆ، حسەین خـۆی گەیانـدێ و دیسـانەوە پـرچە جوانەکـانی بەگـاڵتەوە ڕاکێشـاو گـوتی: "وەرە بـزانم زۆر دڵت خۆشـە کە (بەیـان) دەرئەچێت؟ دو سـێ زلەی بە ئەسـپایی لە ڕومەتە جوانەکـانی دا ڕونـاک خـۆی لە دەسـت حسـەین ڕاپسـکاندو گـوتی: "تخـوا کـاکە حسەین وامەکە تاقەتم نییە!"

براکەی گوتی: "ئەوە ئەڵێیت چی؟؟ چۆن لەم ڕۆژە خۆشەدا تاقەتت نیە؟؟ کەوتە زرمەزلێ و دەست بادانی، ڕوناک هاواری پێکەوت و پێکەنین هێزی لەبەر بڕی وەکو پەتکی لێهات بەدەست براکەیەوە. ڕوناک گوڕی دایە خۆی و پەلاماری دەستی حسەینی داو گازێکی چاکی لێگرت و ڕایکرد لە دەستی و ئەویش بە دوایەوە، دایکی هاواری لێ هەستاو گوتی: کوڕە ڕۆڵە بەسە، چەند حەز لە شەڕەشەق ئەکەی!" نەسرین بۆیان چوو، ئەمجارە حسەین ڕوناکی بەرداو لە نەسرین ئالا ئەو هاواری پێکەوت.

سەعات بوو بە پێنجو نیو جادەو کۆلان بێدەنگ و خاڵیبوون، هەموو گەڕابونەوە ماڵەکانیان، هەندێک چوبونە ماڵی یەکتر تا لەو وەختەدا پێکەوەبن.

ئامەخان و حاجی مێردی و کوڕەکانیشیگەیشتنە ماڵی خوشکی بەشپرزەیی و دڵەکوتێ نەوەکا گوێگرتنی بەیانەکەیان لەکیسچێت.

کاکە حجای ڕوی کردە ئامەخانی ژنی بە نیوە توڕەبوونەوە گوتی: "دڵت ئارامبوو؟" هێشتا چارەکێکیماوەو تۆ هەر ئەتگوت ناگەین پەلە بکەن و سەری دنیات لێ هاتبوەوە یەک!"

حسەین پێکەنی و گوتی: "پورێ گیان فریاش نەکەوتیتایە تاکو بەیانی صەد جاریتر بڵاوئەکرایەوە. خەمت نەبێ لەکیست ناچێ!" پوریشی بە هەناسە بڕکێوە ئارەقی دەموچاوی سڕی و گوتی: "ئۆخەی خوایە لێت بەزیابێ چ ڕۆژێکی خۆشە!"

هەموویان دانیشتن هەردوو حاجی بە تەنیشت یەکەوەو کوڕەکانیش هەرکەسەو لە شوێنێک دانیش. ئەو ئەیگوت تۆ وەرە لێرە دانیشە ئەوتی ئەیگوت ئێرە باشترە، ئەویکە ئەیگوت: "منال کە دەستی پێکرد بێدەنگبن کەس ورتەی لەدەمەوە نەیەت" نەورۆز قەڵەم و دەفتەری گرت بە دەستەوەو گوتیی: با مادەکان بنوسم باشترە، ئەگەرچی زۆر کەس تەسجیلی ئەکات".

حسین گوتی: بەیانی هەموو غەزەتەکانیش ئەینوسن "ئەویش قەڵەمێکی گرت بە دەستەوە.

حەپسەخان گوتی: "ئەی کەی نان ئەخۆن؟" مێردەکەی قیڕاندی گوتی: "ئێستە وەختی نانە! جارێ کێ نانی پێئەخورێ؟"

تۆفە گوتی: "وەڵا من برسیمە، ئەگەر بەشی من تێکەن بەدەم گوێگرتن لە بەیانەکەوە ئەیخۆم" هەموویان پێکەنین نەسرین دەمی خۆی گرت و گوتی: "بەڵام ملّچە ملّچ نەکەیت!!"
تۆفە خەریکبوو جوابی بداتەوە، حاجی گوتی: پیاوی چاک بە مەیکە بە هەراقسەیەک بوو کردی.. لێی ببورەو لێمان گەڕێن با گوێمان لە ڕادیۆکە بێت.."
سەعات پێنجی ئەویست بۆ شەش ڕادیۆ خرایە سەر ئەوپەڕی دەنگ بەرزی و ئێریاڵەکەی چەند جار ئەمبەرو ئەوبەر و ئەمـلاو ئەولای پێکرا بۆ ئەوەی بزانن لە کام لادەنگی باشتر دێت، خەڵکەکەش چاویان تێبڕی و گوێیان بۆ هەڵخست..
سەعاتی ئێستگەکە گرمەی ئەهات، هەندێ لە دانیشتوانەکان یەک لە دوای یەکلەگەڵ گرمەی هەر شەش جار سەعات لێدانەکەدا سەریان ڕائەوەشاند، یەکەم شت ڕادیۆکە بەباسکردنی چاوپێکەوتنەکانی ئەورۆژەی "ڕەئیس جمهور" دەستی پێکرد، گوێگرەکان منگە منگ و جوڵەیان پێکەوت. حاجی مەجید بە ئەسپایی و لەسەرخۆ، هەر وەکو نەیەوێت منالێکی هار و گڕۆز لە خەو هەڵسێنێت گوتی: "نەخێت! وادیار نییە بەیان هەبێت، ئەگەر ببوایە ئەبوو یەکەم خەبەر بێت".
حسەین هەر وەک باوکی ئەویش بە چرپەوە گوتی: "نا بابە گیان وانییە، بەیان لەگەڵ دەنگوباسی تر بڵاوئەکرێتەوە" ئامەخان هەردو دەستی دا بەیەکداو بە ئەسپایی دەستی ڕاگرت و چاوی لێکناو سەیرێکی سەقفی ژورەکەی کرد، وەکو لە خوا بپاڕێتەوە، تۆفەش فەقیرە ئەوەندە خەریکی ئەوە بو کەملّچەی نەیەت دو سێ جار نانەکەی لەبین گیرا، ناچا لەترسی کۆکە ڕایکردە حەوشەو لەبەرخۆیەوە جنێوێکی بە حکومەت داو گوتی:
- بەیان، بەیان!! بەیانی باش دەرچو"
تۆفە پاش ئەوەی لە نانخوارد بووەوە هاتەوە لای جەماعەت، تەماشای کرد هەموو بە کزی و داماوی دانیشتون و گوێیان شلکردوە ڕادیۆش هەر باسی ئەمـلاو ئەولا ئەکات، تۆفە بە ئیشارەت پرسی هیچ بووە؟ حسەین پەنجەی خستە سەر دەمی کە بێدەنگ بێت. ئەویش چاوێکی بە ژورەکەدا گێڕا دی حاجی مەجید بە ئەسپایی لائیلاهەئەلەڵڵا ئەکات براکەشی چاو ئەگێڕێت بە سەقفی ژورەکەدا هەروەکو تازە چاوی پێکەوتبێت. نەورۆزیش هەر تەماشای دەست و

پەنــجەو نینــۆکی خــۆی ئەکــات هەنــدێ جــار ئەنگوستیلەکەشــی لە پەنــجەی دەرئەهێنــاو دیســانەوە ئەیکــردەوە پەنــجەی. نەســرینیش وادیــار بــوو تاقــاەتی چوبێــت هەســـتا چــووە دەرێ و ڕونــاکیش شــوێنی کەوتتــۆفە کە ئەمەی دی بێدەنگ ئەمـیش هـاتە دەرێ. وردە وردە دەنگـو بـاس بـڕایەوە. هەمـوو سـارد بونەوە بێزاری و توڕەیی و ناڕەحەتی لە دەموچاویان ئەباری.. حاجی مەجید هەسـتایە سـەرپێ و گـوتی: کـوڕە ئەمـانە ئێسـقانیان بشـکێنی لە جیـاتی مـۆخ پیسایی تیایە! ئەمانە هیچ ناکەن هەقی کورد ئەدەن؟ خەیاڵی خاوە!؟ وای گوت بە تەڕەبونێکەوە بەرەو دەرگاکە ڕۆشت هێشتا نەچوبووە دەرەوە لەپڕ ڕادیۆکە گـوتی: ئەمشــەو ســەعات (١٠) بەیـانێکی زۆر مـوهیم بـڵاو ئەکەیـنەوە تکـایە چاوەڕێبن.

کە گوێیــان لەمە بــوو هەمــوو دایــان لە چــپڵەو کردیــان بە قریشــکو هــوڕ، حەپسـەخان ڕەنگـی گەشـایەوەو ڕوی کـردە مێردەکەی و دەسـتی ڕاوەشـان و گـوتی: ئەوە بـۆچی وا زوو دەسـتت کـرد بە جنێـودان، تۆزێـک دانـت بەخۆتـا بگرتایە، خۆ ئیشەکە گاڵتە نییە!؟

نەک هەر ئەمــان هەمــوو خەڵکــی کەش ئەمە حاڵیــان بــوو، هەر زو حەلاوی دراوسـێیان لەگەڵ دو سـێ دراوسـێی تـر هـاتن بپرسـن لە حسـەین کە بـۆچی بەیانەکە دەرنەچووە، ئەویش پێیگوتن کە ئینشـائەڵا سـەعات دە دەرەچێت، خۆ ڕادیۆکە خۆی گوتی کە سەعات دە گوێتان لە بەیانێکی موهیم ئەبێت!

بــاجی حەلاو گــوتی: بەخــوا بڵــێم چــی خــۆ مــن خــۆم عەرەبــی تێنــاگەم تەرجومانەکەمان برزوی پرشنگ خانە عەمری درێژبێت لەگەڵ ئێوە...

کە دراوسـێکان ڕۆیـن جوابەکە ببەنەوە بۆ ماڵەکانیـان، حسـەین بە پێکەنینەوە گوتی دە تخوا سەیری ئەم خەڵکە بەسەزمانە ناکەیت! چۆن سـەریان لێشـێواوە، هاتون لە حسەین بپرسن وەک حسەین تەلەفۆنی قەسری جمهوری لابێت!"

مامیشی هەڵیدایە گوتی: خوایە ڕەحمێ بەم عالەمە بکەیت، بەخـوا هەمـوو خەوو خۆراکێکیان لێ حەرام بووە لە تاو ئەم بەیانە"

سەعات نزیک (١٠)ی شـەو بوەوە هەمـوو دانیشـتوانی ژورەکە شـپرزەو دەسـت لەســەر دڵ، چاویــان بــڕییە ڕادیـۆکە، دو ســێ دراوسێشــیان هــاتن بـۆ ئەوەی لەوکاتەدا لەوێبن.

دیســـانەوە چـــارەکە ســـەعات نە، دەقیقەشـــیان لـــێ ببـــو بە ڕۆژ و لە بـــڕانەوە نەئەهات، ئەوانیش زۆریان پەلەبوو...
تۆفە خۆی پێنەگیرا هەستاو گوتی: هیلاکم تاقەتم چوو، ئەچمە ژورەکەی ئەولا پاڵئەکەوم، کە گوێم لە چەپڵەو هەراتان بوو دێمەوە" ڕوناکیش بێتاقەتبوو هەر باوێشکی ئەیا، بە دایکی گوت: من ئەچم ئەنوم بەڵام کە بەیانەکە خوێندرایەوە تخوا خەبەرم بکەنەوە".. وای گوتو هەستاو ڕۆشت، چووە سەر جێگەکەی پاڵکەوت و چاوی لێکناو بەخەیاڵ بەڵیگرت بۆ لای بێستون: ئاخۆ ئێستە چی بڵێ؟ تۆ بڵێی هەواڵی ئەم بەیانە بزانێت؟ خۆزگە ئێستا ئاگام لێبوایە کە چی ئەکات؟ خوایە ئەگەر بەیانیش دەرچێت و ڕێکیش بکەون هەر ماوەت چۆڵنەکەن! خۆ ئەو ڕۆژە کاک عەلیش وایگوت" ڕوناک بە بیرکەوتنەوەی قسەکەی کاک عەلـی زۆر دڵنیـابوو بەدەم خەیـاڵەوە ڕۆشـتو گەیشـتە دێـیەکەی کە سـەبری خوشـکی لێبـوو خـۆی بینـی وا بە هەورازەکەدا سـەرئەکەوێت بـۆ مـاڵی خـاڵی بێسـتون، دیسـان قـاچی تـرازاو خەریکبـوو بکەوێـت، بێسـتون زو پەلاماریـداو گـرتییەوە بەڵام ئەمجـارە کە دەسـتی گـرت تونـد گوشـی و ئیتـر بەریـنەداو وا دەسـت لەنـاو دەسـت سـەرەکەون، بـووک و زاوان، هەمـووی چەنـد ڕۆژێـکە گوێزراوەتەوە، ڕونـاک بەدەم ئەم خەیاڵانەوە خەویلێکەوتبوو تا لەسـەر دەنگـی لەدەرگـادان و قریشـک و هـوڕو چەپڵەلێـدان خەبەری بـوەوە لـێفەکەی تـوڕداو بەپەلە هەسـتاو ڕایکرد کە بچێت بۆلای دایکی و ئەوانهێشـتا نەگەیشـتبووە لای ئەوان کە تەقە دەستیپێکرد، ئەویش بە شـپرزەیی خۆیکرد بە ژوراو باوەشـیکرد بە دایکیاو بە ترسێکەوە گوتی: "دایە گیان ئەوە چی قەوماوە؟"
دایکیشـی بەڕوویەکی گەش و خۆشـەوە کە هەمـوو لەشـی پێئەکەنـی مـاچێکی کـردو گـوتی: "بەقوربـان ئەوە لە خۆشـی بەیـانەکە وائەکەن، لەخۆشـیانا تەقە ئەکەن.. شکور بەیان دەرچوو خوێندرایەوە" ڕونـاک تەماشـای کرد وا حسـین و پورزاکـانی سـەریان شـۆڕکردۆتەوە بەسـەر کاغەزەکـانی بەردەمیانـاو شـتێک ئەخـوێننەوەو پشـانی یەکتری ئەدەن و زۆر سـەرقاڵ دیارن، بـاوکی و مامیشـی گەشاونەتەوەو بە ئەسپایی لەگەڵ یەک قسەئەکەن بۆ ئەوەی سەر لە حسـەین و ئەوان تێکنەدەن. لێرەدا تـۆفە کە وادیـاربوو ئەویـش لە دەنـگە دەنـگ خەبەری بووبـوەوە، هـات بـۆ لایـان، کەدی نەسـرین وا لە هەیوانەکەگـوێ لە غەڵبەغەڵـب

وتەقەو دەنگی هۆڕن لێدانی ئوتومبێل و چەپڵە لێدانی خەڵک ئەگرێت، لێی پرسی: "ها (نەسە) چی بوو؟ بڕایەوە شکور کوڕەکەمان بوو؟ نەسرین بە خۆشییەوە گوتی:"ئەرێوەڵا شکور کوڕێکی ددان مرواریمان بوو".. لەم قسانەدا بوون دەنگی دەرگا هات، کە کردیانەوە هەندێ ناسیاو و دراوسێ هاتنە ژورەوە، یەکێکیان بە دڵێکی خۆشەوە گوتی: "بەوخوایە خۆ من وەها ناهومێد ببووم، کە چووم کوڕەکەم نواند خۆشم خەریک بو خەوم لێبکەوێت کە گوێم لە قیژەو چەپڵەی باوکی منداڵەکان بو ڕاپەڕیم و مژدە خۆشەکەی دامێ. "دراوسێکەی تریان گوتی: "کچی من هەر بەتەماش نەمابوم، گوتم تازە بەیانی چی و حاڵی چی؟ ئەترسام کە وەکو ئەو ڕۆژە دیسان خەبەرو بەیانە موهیمەکەی ڕادیۆ باسی هاتنی میوانێکی گەورەی ڕەئیس جمهور بێت؟!"
حەپسەخان ئاوڕی دایەوە کە دی کوڕ و خوشکەزاکانی هێشتا هەر خەریکی کاغەزەکانی بەردەمیانن و ئەم سەیری هی ئەو ئەکات و شتێک لە هینەکەی خۆیا ئەنوسێ و یەکێکیکەیان تەماشای هی دوانەکەی تریان ئەکات و شتێک ئەخاتە سەر هینەکەی خۆی، ئەویش لێیان چووە پێشەوەو دەستی بۆ درێژکردنو گوتی: "دەرۆڵە دڵمان شەقی برد ئەوە چیبوو؟ خۆ ئەڵێی ئێوەش خەریکن بەیانێکیتر دەرەکەن! دە بەسە ئیتر پێمان بڵێن چی ئەڵێن؟ تێمان بگەیەنن!".
مێردەکەی و شوبراکەشی کەوا تاقەتیان چوبو، ئەم قسەیەیان پێخۆشبو، لەگەڵ ئەوەشا عاجی مێردی بۆ ئەوەی خۆی بە بێباک و دڵنیا پیشان بدا گوتی: "دەی، دەی، تۆزێکی کەش دان بەخۆتانا بگرن، ئێستا هەموو شتێکتان پێئەڵێن؟"
حسەین کە گوێی لە قسەی دایکی بوو، هەر گورج کاغەزەکانی کۆکردەوەو بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە هەستایە سەرپێ و سەلامێکی عەسکەری بۆ دایکی کردو گوتی: "فەرموو حەپسەخان ئەمر ئەکەیقوربان!"! ڕوی کردە ئەوانیتریش و گوتی: "ئێوەش دانیشنەوە لە جێی خۆتان با من بۆتانی بخوێنمەوە".
حسەین دەستی کرد بە خوێندنەوەی مادەکانی بەیانەکە، جەماعەتیش هەموو بێدەنگ گوێیان ئەگرت، کە حسەین لە خوێندنەوەی مادەیەک ئەبوەوە، نەورۆز بۆی ڕون ئەکردنەوە کە چییەو چۆنە. قسەکانی بەیانەکە بە تێکڕایی خراپ نەبوون، بەڵام بەرامبەر بە گرنگترین داخوازی کورد کەوا هەڵسوڕاندنی هەموو

کاروبـاری کوردسـتان بـوو لەلایەن کـوردەوە دانـی بە هەمـوو شـتێکدا نـابوو، بەزۆری وەزعەکەی وەکو پێشوو هێشتبوەوە. بەڵێنی بەردان و دامەزراندنەوەی ئەو کەسـانەی دابـو کە سـەبارەت بە شـەڕ گیرابـون، یـان لە کـار و (وەزیـفە) دەرکرابـو، لەگەڵ بژاردنـی ئەو زەرەر و زیـانەی لەو ڕوەوە لە خەڵـک کەتبـوو، هەروەهـا ئـاوەدانکردنەوەی ئەو شـوێن و دیهـات و ڕێوبانـانەی کـاولکرابونو کـردنەوەی قوتابخانەکـان و یارمەتیـدانی گەشـەپێکردنو پێشخسـتنی (ثەقـافە)و زمان و ئەدەبیاتی کوردی. ئەوەشـی تیـابو کە پێشـمەرگە وەک هێزێکـی چەکدار بمێنێتەوە بۆ پاراستنی سنور و حکومەت بیانژێنێ وەک عەسکەرەکانی خۆی، بەڵام لە شوێنی خۆیان نەگوێزرێنەوە.

ڕوناک تاکو ئێستا هەرچەندە لەناویاندا بـوو، لەگەڵیـان دانیشـتبوو، بەڵام هۆشـی لەلای قسەکانیانەوە نەبوو، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە بزانێت چەندە پەیوەندی بە هـاتوچۆکردن و بینینـی بێسـتونەوە ئەبێت! بـۆیە هەر کە نـاوی پێشـمەرگە هـات موچڕکێکی خۆشی پیاهات، خەریکبوو بقیژێنێت و چەپڵە لێبدا، بەڵام گورج خۆی گرت و لەدڵـی خۆیـا کەوتە لۆمەکردنی خـۆی" ئـای ئەوە بەنـاخێری گیانـت خـۆ خەریکبوو ئابڕووی خۆت ببەیت، ئەی ئەو خەڵکە نەیانئەگوت ئەوە بۆچی خـانم تا ئێستا هەر خەریکی باوێشکدان بوو ئێستە لەپڕ کە ناوی پێشمەرگە هات خەو بەریـداو کەوتە چەپڵەلێـدان و قیـژە قیـژ؟هەزار خەیـاڵی خراپیـان لـێ ئەکـرد، ئەیـانگوت: "ئەمە بەخێـرێ کـچە عـاقڵە بەحـورمەتەکە بـوو، وا دیـارە پێشـمەرگە دڵیـان فڕانـدووە!! ئەگینـا ئەم چەپڵەلێـدان و قیـژو هـوڕەی لەچیبـوو؟ ئەی بـۆ مادەکانیتر بۆچی نقەی لێوە نەهات!؟؟"، نەء هەر خوا خۆی ڕزگاریکردم.. لێدانی دەرگـای حەوشـە لەدەسـت ئەم خەیـاڵانە نەجاتیـدا، هەسـتا چـوو بە دەنگیـیەوە، دەرگـای کـردەوەو سـەبری و شـیروان کردیـان بەمـاڵا لەگەڵ کۆمەڵێـک خـزم و ئاشناو دۆس کەوا لەبەر دەرکی سەراو ئەوانەوە بوو بوون.

سـەبری پەلامـاری دایکـی و پـوری و ئەوانـی داو دەسـتیان کـردە ملـی یەک و لەگەڵ ئەوانیکەش چاوڕونیان لەیەک کرد و بوو بە دەنگە دەنگو قاو و قریشـکێ هەر نەبێتەوە!

ئامەخـان دەسـتی دا بەیەکـاو دایە قاقـای پێکەنین و گـوتی: "ئەیەڕۆ خـۆ سـەعات نزیکـی یەکـی شـەوە، هەمـوو شـەوێ ئەم حەلە ئێمە سـێچین خەومـان کردبـوو

کەچی ئێستا کەس بیریشی نییە کە شەوە یا ڕۆژە! شیروان پێکەنی و گوتی: ئۆهـ ئامە خان ئینجا تۆ چیت دیوە، ئەگەر بچیتە سەر ئەو جادانە هەر سەر سوڕ ئەمێنێ نازانی ئەو هەموو خەڵکە لە کوێبوون، ئەڵێی ئەرز قڵیشاوەتەوەو ئەو هەموو خەڵکەی لێهاتونەتە دەرێ!!".
ئامە خان زوو گوتی: "زۆر باشە لەوێوە ئێمەش ئەچینەوەماڵی خۆمان" ڕوناک باوەشی پیاکرد و گوتی: "تخوا پورێ گیان مەڕۆنەوە لێرەبن!"
دایکیشی لەلاوە بە شیروانی گوت: "نە گیانە تاقەتی سوڕانەوەمان نییە بۆخۆمان دانیشتووین. "ئینجا چوو بەلای خوشکییەوەو گوتی: "ئەوە تۆ چیتە؟ ماڵی خۆتانی چی؟ بەخوا هەنگاوتان ناچێت، بۆخۆمان دانیشتوین لەم خۆشییەدا ئەبێت هەموومان پێکەوەبین".
خوشکی خۆی خست بە گازی پشتاو گوتی:
"وەڵڵا ئەمە خۆشە! کەواتە با هەر بەتەواوی بگوێزینەوە ئێرە، ماڵی خۆمانی چی دەردی تۆ ئەڵێی، ئەوەتەی گەڕاومەتەوە لە شاخ هەفتەیەک لەوێ نەبووین، ماڵیش چۆڵ و هۆڵ مەگەر مشک تەراتێنی تیا بکات"
بەیانی ئەگەرچی خەڵک چونەوە بەلای ئیش و کاری خۆیانەوە، بەڵام باس هەر باسی پیرە (بەیان) بوو، ئەو ئەیگوت: "کوڕە برام (بەیان)ی چی؟ هیچی تیا بەسەر نییە هەر قسە کۆنەکانی جارانە و نەختێ دەمەزەردیان کردۆتەوە، پاش ماوەیەکی تر ئەبینی هیچی لێ جێبەجێناکرێت و دیسانەوە ئەبێتەوە بە شەڕ"
هەندێکیکە ئەیانگوت: "وەڵا ئەم عالەمە سەیرن، کوڕە خۆ بەهیچ شتێک ڕازی نابن!! باشە باوکم کە ئەمەتان بەدڵ نییە بۆ خۆتان نافەرموون شتی باشتر وەرگرن؟، ئێوە شەرم ناکەن لە ماڵەوە پاڵتان لێ یاوەتەوەو هەر قسەی زل ئەکەن، فەرمون ئەوە ئەرز و ئەوە گەزکێ ڕێی لێگرتوون؟"
یەکێکیتر ئەیگوت: "باشە ئەی ئەگەر حکومەت نیازی چاک بوایە بۆچی (جاش)ی چەک نەکرد؟ بەو خوایە ئەڵێن کە حکومەت زۆر دڵی داونەتەوەو دو هێندەی جارانیش چەک و پارەی داونەتێ" ئەویتر ئەیگوت." کوڕە بەقوربانتان نەبم، کە حکومەت داخوازییەکانی کوردی جێبەجێ کرد و هێنانییە دی و هێزی پێشمەرگەی هێشتەوە و پڕچەکی کردن و مانگانەی باشی بۆ بڕینەوە ئیتر

خوای ئەکرد جاشەکانی خۆی ئەکردە کۆڵ، ئێمە چیمانە بەسەرە...!؟ یەکێکیتر هەڵیئەدایەو ئەیگوت:

" چۆن ئێمە هەقمان چییە؟ وەڵا وەک ڕۆژ دیارە بۆ شەڕی کورد و لەترسی پێشمەرگە دەستیان پێوە ئەگرێت و دڵیان ئەداتەوەهەرچەند ئەکەم ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم داگیرکەرانە دڵیان بەرامبەر بە ئێمە پاکبێتەوە!!

ئەویتر لەولاوە ئەیگوت: برایینە ئێوە چی ئەڵێن ئێمە ئەو هەموو خزمەتەی عەبولکەریممان کرد دڵی پاک نەبوەوە لە ئاستمان کە بە حساب عەرەبییەتیشی نەئەکرد ئینجا ئەمانە دڵیان پاک ئەبێتەوە کە کوردستان و خەڵکەکەشی بە بەشێک لە وڵات و نەتەوەی عەرەب دائەنێن!؟ جگە لەمەش ئەوەندە ناڕاستو بە پێچ و پەناو فێڵبازن وا ئەزانن کوردیش وەهایە، نازانن کە چەند پاک و دڵسۆز و بەوەفانبەرامبەر بەو کەسەی ئەوەندەی تۆزێ تۆزێ دڵسۆزبێت لەگەڵیان، یا کەمێک چاکەیان لەگەڵ بکات، ئەوەندە چاکەی ئەدەنەوە بێتامی ئەکەن، بەڵام چی ئەڵێیت لەگەڵ ناپیاو و دڵپیس..؟ هەرچۆنێک بێت بەخوا من بەش بە حاڵی خۆم زۆر دڵم بەم قسانەیان خۆش نییە"

پاش دەرچونی بەیانەکە بە سێ چوار ڕۆژ وەفدی کورد گەڕایەوە بۆ شاخ و ناو پێشمەرگە. عەلیش ژنەکەی و کوردۆی کوڕی لای دایک و باوکی جێهێشت و خۆشی چوەوە بۆ شاخ.

حەپسەخان و مێردەکەی و خەڵکی ماڵەکە لە خۆشی هاتنی بووک و زاواکەیان ئەوەندەی تر کەوتنە خۆشییەوە.

خەڵک بوژانەوەو دوکان و بازاڕ گەشی کرد.

پاش ئەو ڕوداوانەی باسکان ئێوارەیەکیان جیێبێکی (لان ڕۆڤەر) لەبەر دەرگای حپسەخانا وەستا و یەکێکی لێ دابەزی و لەدەرگای دا نەسرین لە حەوشەبوو چوو دەرگاکەی کردەوە کە دی کێن بە گەرمی و خۆشییەوە بۆی خستنە سەر گازی پشت و بە پەرۆشەوە هاواریکرد "پوری، دایکی کاکە بێستون و ئەوانن"
پوریشی بە ڕوویەکی یەکجار خۆشەوە چو بە پیریانەوەو باوەشی بۆ دایکی بێستون کردەوەو کەوتنە ئەملاو ئەولای یەکتری ماچکردن، ئیتر بەرەو دوا خەڵکی ناو جیێبەکەو ئەهلیماڵەکە لە حەوشەکەدا دەستیان کرد بە خۆشی و چۆنی و هەواڵپرسینێکی گەرم لەگەڵ یەک، خۆ حەپسەخان هەر ئەتگوت لە پاش لێکبڕانێکی دور و درێژ چاوی بە چەند خزمێکی زۆر نزیکی خۆی کەوتووە ئینجا هەموو چوونە ژوری دانیشتن و هەر کەسە لە ئاشی خۆی ئەکرد و دەنگ و باسی خۆش و سەیر و هەواڵی ئەو ماوەی لێکبڕانەیانی بۆ ئەوی تەنیشتی ئەگێڕایەوە بەڵام بێستون هەر زو ئارامی لەبەر بڕاو بە پەرۆشییەکی بێئەندازەوە چاوی بەناو خەڵکەکەو دەرو دەرگای ژورەکەدا ئەگێڕا، لەبەر حاڵی خۆی درانگ هەستی کرد کەوا دایکیشی هەرچەنە جەوابی پرسیار و قسەکانی حەپسەخان و ئەوان ئەداتەوە بەڵام وادیارە ئەویش لەم کەمتر شپرزە و ناڕەحەت نییە (ئەی ئەوە ڕوناک کوا؟ بۆ دیار نییە؟ ئاخۆ لەکوێبێت؟ وەختی چوونە بازاڕیش نییە، خەریکە دنیا تاریک دایەت، ئەوەتە باوکی هاتۆتەوە ماڵێ دیاریشە کە نەچووە بۆ بەغدا کێیان هەیە لە بەغدا، جگە لە ماڵی براکەی، ئەوە براژنەکەشیەتی لەولایەوە دانیشتووە. چی!! قسەی هیچ نا چۆن شتی وا دەبێت؟ قابیلە لەم ماوە کەمەدا دابێتیان بەشوو، وەگوێزرابێتیشەوە؟نا ئەوە خەیاڵە چۆن وا بە پەلە و بێدەنگ کاری وا ئەکرێت؟ لە ماڵی پورویشی نییە، ئەوە ئامەخان بە خاو خێزانەوە لێرەن!! ئەی کوا؟؟؟ ئەوە نزیکەی دو سەعاتە ئەمان هاتون لەهەر کوێیەک بوایە تا ئێستا ئەبوو بگەڕێتەوە.. تۆفەش دیار نییە بە فرتو فێڵێک لێیدەربێنم.
دایکی بێستونیش هەتا ئەهات زیتر دڵی ئەکەوتە مەراقەوە بەتایبەتی کە حەپسەخان بە چاک و خراپ ناوی ڕوناکی نەئەبرد، لەگەڵ ئەوەشا کە ئەوەتەی هاتون ئەو باسی حەڵ و ڕابواردنی خۆیان و باسی خزم و کەس و کاریانی بۆ ئەکا.

بێستون ئەوەندە خەیاڵی پەرش  وبڵاو بووبوەوە کە جار جار باوکی یا حسەین یا یەکێکیتر شتێکیان لێئەپرسی یا ڕووی قسەیان ئەکردە ئەو چونکە زوو نەئەهاتەوە سەر خۆی دەمی تێکەڵ و پێکەڵ ئەبوو پچڕ پچڕ جوابی ئەدانەوە تا وای لێهات کە حسەین و نەورۆز پێی بڵێم کاکە ئەگەر هیلاکی و خەوت دێ بچۆ نەختێ ڕاکشێ و بنو" بێستون گوتی:

"نەبەسری ئێوە هیچ ماندو نیم خۆ بە پێ نەهاتوم".

ئەمان لەم قسانەدا بوون کە ڕوناک و تۆفە گەیشتبونە سەری کۆڵانەکەو هەر کە چاویان بە لاند رۆڤەرەکە کەوت لەبەر دەرگایانا وەستاوە ڕوناک گوتی:

"ئای ئەوە کاکە عەلی گیان هاتۆتەوە"

ئیتر بە ڕاکردن خۆیان کرد بەماڵا کە گەیشتنە هەیوانەکەو گوێیان لە دەنگی دانشتوانی ژورەکە بوو نەختێک ڕاوەستان تا پشوویەک بدەن، ڕوناک گوێی هەڵخستبوو، لەپڕ دەنگێکی زۆر ئاشنای هاتە گوێ شڵەژاو لە دڵی خۆیا گوتی: " تۆ بڵێی بێستونیش لەگەڵ کاکە عەلی هاتبێ؟" بەپەلە چووە ژورەکەی خۆی و عەباکەی داگرت و لەبەر ئاوێنە گەورەکە ڕاوەستاو سەرنجێکی دایە خۆی، وە هەندێ سەروپۆتەلاکی خۆی ڕێک خستەوەو یەک دو جار دەستی هێنا بە سنگ و بەرۆک و کراس و سوخمەکەیاو ئینجا چووە دەرێ نەسرینی براژن و پورزای دی بە سینییە چاوە کە بیبات بۆ پیاوەکان و لەبەر دەرگای ژورەکەوە بیداتە دەست یەکێک لە کوڕەکان. نەسرین کە ئەمی دی گوتی: "ها (نوونە) گیان ئەوە هاتیتەوە؟ بەخوا چاکت کرد، کچی وەرە سەیرکە ئەوەندە میوانمان هەیە نەبێتەوە". پێکەنی و بە ئەسپایی گوتی: "دەدی ئەڵێن (سەگ ساحێبی خۆی ناناسێتەوە)" ئینجا بە پەلە لێیدا بڕوات و بەدەم ڕۆینەوە گوتی: زوکە بڕۆ بەخێرهاتنیان بکە، دایکی کاکە بێستون وماڵیان بە خاو و خێزانەوە هاتون".

ڕوناک ئەوەندەی نەمابوو لە خۆشیانا ببورێتەوە بەڵام زۆرێکی تەواوی لەخۆی کرد کە بتوانێت خۆی ڕابگرێت و بێتەوە سەرخۆ.

دایکی بێستون هەر کە چاوی کەوت بە ڕوناک بەخۆشی و پەرۆشییەکی زۆرەوە پەلاماریداو باوەشی پیاکردو تێر تێر ماچیکرد، ئەویش چەند جار دەستی ماچکرد لەگەڵ کچەکەشیا بەگەرمی چاکی و چۆنی و دەست لە ملانێیان کرد، ئینجا لە تەنیشت دایکییەوە دانیشت، بەڵام وا سور هەڵگەڕابو ئارەق بە

سەرو ملیا ئەهاتە خوارێ ئەتگوت هەرچی خوێنی لەشی هەیە وروژمی هێناوە بۆ دەمو چاوی.
دایکی گوشی بە خۆیەوەو گوتی: بەقوربانەکەت بم ئەوە بۆچی وا دواکەوتن؟ دڵم هەر لە مەراقا بوو، زۆرتان پێچوو؟".
بەخوا دایە گیان لەبەر باجی سەبری دواکەوتین، لەگەڵی چوین بۆ لای دکتۆر سەرمای بووە، لە دوێنێوە تای هەیە، لەبەر تۆ قسەیان نەکردووە"
دایکی بێستون بەر لە حەپسەخان قسەکەی قۆستەوەو دەستی دا لە سنگی و گوتی: "وەی خوا نەکا سەبری خان نەخۆشبێت، هیچ نییە ئینشاڵڵا!!" دایکی هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: هەر ئەمزانی نەخۆش ئەکەوێت دایکم جاحێڵی ئەم زەمانە کەی بە قسەی گەورە ئەکەن؟ ئەو ڕۆژە هاتە دەرێ لە حەمام چەند لێی پاڕامەوە گوتم کچم کەواکەت لەبەرکە، سەرپۆشەکەت بخەرە ملت پرچت هێستا تەڕە، هەر گوێشی نەدایە پێی گوتم: "گەرمامە هەموو لەشم ئارەقە" تا وای لێهات، پەنا بەخوا لەم دەورو زەمانە بەخوایە خۆم سێ منالێشم هەبو کە دایکم پێی ئەگوتم ئەمە بکەو ئەوە مەکە بەقسەم ئەکرد، جاری وا هەبوو ئەمویست بچم بۆ شایی، ئەو بیگوتایە ئەمە لەبەرکە ئەویتر لەبەرکە، چۆنی بویستایە وام ئەکرد. ئێستا کوا ئەوە ماوە! ئینجا دایکی بێستون سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: "خۆزگەمان بەوسا! قوربان ئەو زەمانە ڕۆشت و ناگەڕێتەوە!".
ڕوناک تاکو دایکی و میوانەکەی ئەو چەند قسەیەیان کرد ئەو دو سێ جار، هەر جارە بە بیانوویەک سەری هەیوان و حەوشەی دا دواجار کە هاتە ژورەوە ڕوی کردە خوشکەکەی بێستون کە هەروا دە دوانزە ساڵێک بو پێی گوت: "سەرگوڵ حەز ئەکەی بچینە ژورەکەی من ئەگەر لێرە تاقەتت چووە؟"
دایکی کچی بە خۆشییەوە بە کچەکەی گوت: "ڕاست ئەکات دە هەستن (گوڵەباخ)یش بەرن و لەگەڵ ڕوناک گیان بچنە ژورەکەی".
کچە حەوت ساڵانەکەشی کە ناوی (خازێ)بو هەڵیدایە گوتی: "بەخوا دایە منیش ئەچم" هەستایە سەرپێ(سەرگوڵ) تۆزێ جولایەوە بەڵام لە جیاتی ئەوەی هەڵسێ قاچێکی بە ئەسپایی درێژ کرد و کەواکەی پیادا تاکو دیار نەبێت، وەکو پیرەژنەکان سەرپۆشەکەی توند لە سەروملی خۆی ئاڵاند و گوتی: "نە بەخوا

تـاقەتم نەچـووە، خـوا ئاوایکـات ئێـرەش زۆر خۆشـە، بەڵام ئەگەر حەبێکـی سەریەشـەم بـۆ بێنیـت خێرت ئەگـات، سـەرم تۆزێـک ژان ئەکـات دور لە ئێـوە، وابزانم هی هەڵتەک هەڵتەکی جێبەکەیە؟

ڕونـاک زۆری لەخـۆی کـرد کە پێـی پێنەکەنێت، چـونکە قسـەی کـچەکە لە چـاو عومریـا زۆر زل بـو، و گـوتی: "باشـە بەسـەر چـاو هەر ئێسـتا ئەچـم حەبت بـۆ یەنـم" ڕای کـردە دەرەوەو دەمـی خـۆی گـرت و دایە پـڕمەی پێکەنـین بـۆ ئەوەی گوێیـان لێنەبێـت بە پەلە چـووە چێشـتخانەکە بـۆ لای نەسـرین ونەوبەهـار کە خەریکیـی چێشـتلێنان بـوون نەرسـین گـوتی: "ئەوە چییە نـوونە چـی بـووە وا ئەکوڵێیت؟؟

ڕوناک لەبەر پێکەنین چاوی فرمێسکی لێدەرپەڕی بوو گوتی: "وەڵا بە سـەرگوڵ پێـئەکەنم پەنـا بەخـوا ئەڵێـی خەسـوی دایکێتـی! چـاوت لە کەواو سـەرپۆش و کۆڵوانەیەتی؟ قسـەکانی بـۆ گێڕانەوەو گـوتی: "وا هـاتوم حەبی سـەریەشـیی بـۆ بەرم بۆ (نەنە سەرگوڵ)!" ئەمانیش دەستیان کرد بە پێکەنین و نەسرین گوتی: "کە لە مـاوەت بـوین هەنـدێ جـار توشـی ئەهـاتم وامئەزانـی پیرێـژنەو بچـوک بۆتەوە هەر ئەوەی کەم بوو کە تەزبیحێکی سەد و یەک دانەیی بکاتە مل!!"

نەوبەهـار و حەلاوی دراوسێشیان کە هـاتبوون یارمەتییـان بـدات، دایـانە قاقـای پێکەنـین! حەلاو کە دی ڕونـاک کـوڵی پێکەنینـی دانـامرکێتەوە دەسـتی دایە پەرداخێـک نەختـێ ئـاوی تێکـرد و گـوتی: "کـوا نـوونە گیـان حەبەکەم بەرێ مـن بـۆی بەرم وادیـارە تـۆ بەم زووانە نـایەیتەوە سـەر خـۆت هەر حەزیـش ئەکەم چـاوم بە (نەنە سـەرگوڵ)بکەوێ" ڕونـاک بەدەم کـوڵی پێکەنینەوە گـوتی: وەڵـڵا مەمنونیشت ئەبم باوەڕناکەم لەوێش خۆم پێبگیرێت"

ماوەیەکی باشی پێچوو ئەوجا پێکەنین ڕوناکی بەرداو توانی بچێتەوە بۆ لایان.

ئەو شـەوە ڕونـاک لە گێژاوێکـدا بـوو نەبێـتەوە نائـارامی و تـرس و خۆشـی خەویـان لـێ زڕانـدبوو، بەتـایبەتی چـونکە دایکیشـی ژورەکەی خۆیـانی دابـو بە میوانەکـان لێـی بنـون هـاتبووە ژورەکەی ئەو و لە تەنیشـتیەوە نوسـتبوو، بـۆیە هەرچەندە بەشی هەرە زۆری شەو ڕوناک خەو نەچوبووە چاوی و هەر بیری ئەکـردەوە بەڵام نقەی لە خـۆی بڕیبـوو و زۆر بترسـەوە ئەمـدی و ئەودیویشـی ئەکرد نەوەک و دایکی خەبەر بکاتەوە و لێی بکەوێتە پرس و پرسیار! بەتایبەتی

که بەر لەوەی بچێتە ناو جێگەوە گوێی لە هەندێ لە قسەکانی دایکی و بێستون بـو گومـانی لەوادە نەمـابوو کە لە بـارەی ئەوەوە قسـە ئەکەن بەڵام ئـاخ ڕوی نەئەهـات بە باشـی گوێیـان لێبگرێت ئەترسـا یەکێک بێت بەسـەریاو لەو حاڵەدا ببینێت هەر ئـابڕووی ئەچـوو، بەداخەوە هەر ئەوەی گـوێ لێبـوو کە دایکـی لە جوابی دایکی بێستونا گوتی: "جارێ مناڵە باوەڕنـاکەم بـاوکی ڕازیبێت هەرچەنە زۆریش ئێوەی خۆشـەوێت" ئیتر نەیزانـی قسـەکەیان چۆن دوایـی هـات، بەڵام ئەوەی کە دوایـی لە قسـەبونەوەیان دایکـی لەگەڵ میوانەکەیـان دەسـتەملانێی گەرمی کردو بە دەنگێک کە ئەمیش لە ژورەکەی خۆیەوە گوێی لێبێ پێی گوت: " بەو خـوایە وەک ئـامەی خوشـکم و بگـرە زیـتریش سـەیری تـۆ ئەکەم" ئەم دوا قسەیەی دایکی دڵی گەشانەوە، بەڵام دیسـانەوە ئەوەنـدە بێخەوییەکەی درێژەی کێشـا کە دایکـی هەڵیسـاند و پێیگـوت: ئەوە چیـیە نـوونە گیـان هێشـتا هەر نەنوسـتویت؟؟" هەرچەنـدی کـرد بیـری نەکەوتەوە کەی نوسـتووەو چەنـد نوسـتووە؟ بەڵام بەوەدا کە تێـرخەو نەبـو بـوو دیـاربوو کە زۆر درانـگ خەو هـاتووە بە دەنگیـیەوە! دایکـی بە ئەسـپایی لـێفەکەی لاداو خـۆی شـۆڕکردەوە بەسـەریداو مـاچێکی کـردو بەشـێنەیی تـۆزێ ختوکەیـداو گـوتی: "کچـێ هەسـتە عەیبە مەنوو! تۆ لای خۆت خوازبێنیکەرت هاتون!" ڕونـاک لـێفەکەی ڕاکێشـایەوە بەسـەر دەموچاویاو گوتی: "ئۆ دایکە ئەمە چییە؟ بۆ وا ئەڵـێ؟ بەڵام لە خۆشـی ئەو قسەیەی دایکی خەو و مەوی هەر لە بیریش نەما، دایکی جارێکیتر لـێفەکەی لەسـەر لابـردو گـوتی: "کچـێ هەسـتە پێـت ئەڵـێم هەسـتە ڕونـاک ئەویـش بە نازێکەوە هەستاو لەناو جێگەکەیا دانیشت و دەمو چاوی هەڵگلۆفت و دەستی بە پـرچە جوانەکەیـا هێنـاو بەزەردەخەنەوە گـوتی: "دایـکە ئەو قسـەیە چیبـوو کـردت؟ باسـی کێت ئەکـرد؟ مـن؟ بەخـوا هەر ئەوەمـان کەمە!؟ بە تورەبـونێکی دەستکردەوە گوتی: "شوی چی دایە بەخـوا ئەوەی وابڵـێ هەر خـۆم ئەزانـم چـی پێئەکەم!!"

دایکی بە دەنگێکی نـزم گوتی: "ئەیەڕۆ قسـەی وا نەکەی ڕۆڵە هەمـوو کچێک کە گەیشتە عومرێک خەڵک دێن بۆ خوازبێنی، ئەویش نە عەیبەو نە بێشـەرعی، خـوا کچی بۆ شوکردن و کوڕی بۆ ژنهێنان دروستکردووە، لە پاشـا هەمـوو ئیشـەکە بە خـوازبێنی کـردن نـابڕێتەوە، کـێ ئەڵێـت باوکـت هەر ڕازی ئەبێـت؟" دایکـی

ئەمەی گوت و بە ئەسپایی مستێکی لێداو پەلی ڕاکێشا کە هەڵیسێنێت و گوتی: "تۆ هێشتا تۆزێ منالّی ئەگینا زۆرم پێخۆشە، بێستون زۆر کوڕی چاکە هەمو شتێکی لایقە، بەڕاستی ئەو ماڵەشم زۆر خۆشئەوێ" حەپسەخان ئەم قسانەی ئەکردو ڕوناکیش هەر خەریکی پرتەوبۆڵەو ناڕەزایی دەربڕین بو، لە دڵیشا خەریکبوو لە خۆشیانا باڵبگرێت!.

بو بە ڕۆژی سێیەم هێشتا ماڵی بێستون هەر لوێ بوون، دیاربوو کە لە دوای گفتوگۆیەکی زۆر حەپسەخان توانیبووی حاجی مێردی ڕازیکات بەڵام بەو شەرتەی کە جارێ ڕاوەستن بزانن وەزع چی لێدێت هیچ نەبێ جارێ تاکو ساڵێکیتر باسی گواستنەوەو شتیوا نەکەن.

دایکی بێستون هەر زوو پریاسکەکەی دەرهێناو چەند پارچە خشڵێکی قورسی قەدیمی بەڕوناکەوە کرد، بەناوی نیشانەکردنەوە، وادیاربوو کە ماڵی بێستون پێش هاتنیان بە براکانیان گوتبو کە بۆ ئەو کارە خێرە ئەچن بۆیە وەک چاوەڕوان چاوەڕوانی ئەنجامی هاتنەکەیانیان ئەکرد، کە بیستیان دایک و باوکیان ڕازی بوون زۆریان پێخۆشبوو چونکە کوڕەکەیان زۆر خۆشەویست و شارەزای هەموو شتێکیبوون بە دۆستی دڵسۆزی خۆیانیان دانابوو، هەرچی وەک ئامەخان و سەبریش بوونئیشەکەیان بەدڵ نەبوو گلەییان لە حەپسەخان ئەکرد کە چۆن وا بە پەلە لەگەڵ دایکی کوڕە کەوتنە چرپە چرپ و ئیشەکەیان لولداو ئاسان کچیان دانێ؟ مامی ڕوناکیش نەختێ بۆڵەبۆڵی ئەکرد ئەیگوت: ئەبوو زیتر بیر لە ئیشەکە بکەنەوە بۆ ئەوەندە پەلەیان کرد، خۆ هەر ئەم کچەیان مابوو، چۆن ئەبوو گوێ نەدەنە ئەوەی کە کوڕە کە ئەیبات ئەڕوا؟ کێ ئەڵێ ئەو کچە منالّە بەسەزمانە لەو کەژو کێوەدا لەگەڵیان هەڵئەکا؟ خۆ ئەوە سەفەری مناگ و دو مانگ نییە، هەموو عومری لەوێ بەسەر ئەبات" کە ئەم بۆڵە بۆڵەی لای ژنەکەی کرد، ئەو بەسەریا هات و پێی گوت: "خۆت پیاو خراپ مەکە، بەخوا حەپسەی خوشکم هەر ئەیدایە لە ماوەتیش بووین هەر بە شان و باڵیاندا هەڵی ئەدا کە زەراعەتیان وایە و ماڵیان وایە و زەوی و زاریان وایە و باخیان وایە ئێستەش بەقسەی من و تۆ لەقسەی خۆی پەشیمان نابێتەوە ئیتر بەقسەی من ئەکەی لێی بێدەنگ بەو (گەوهەری خۆت مەدۆڕێنە).

سەبریش یەک دو جار لەگەڵ دایکیشی کردی بە قڕە بەڵام هیچی پێنەکرا.

دوای ڕۆیشتنی ماڵی بێستون بەرە بەرە ئەم جۆرە بۆڵە بۆڵ و گلەییانەی براو کچ و هەندێ لە خزمان دڵی باوکی ڕوناکیشیان کرمێ کرد بەرامبەر بە ڕازیبوونەکەی خۆی بە شوکردنی ڕوناک کە ئەمەشی لە چاوی ژنەکەی ئەناسی و ڕۆژ نەبوو لەگەڵی نەکا بە قرە قرِ و پرتە و بۆڵەباتەیبەتی کە بیری ئەکەوتەوە ئەو کچە نازدارەی بەجۆرێک لێدورئەکەوێتەوە، کە ڕەنگە ئیتر ساڵی جاریکیش چاوی پێی نەکەوێتەوە، وا ڕقی هەڵئەسێ خەریک ئەبێت (دۆ و دۆشاو تێکەڵکات) بەزۆری حەپسەخان بە هێمنی و دان بەخۆداگرتن خۆی لەم هێرشانەی مێردەکەی لائەدا بەڵام هەندێ جاریش خۆی پێنەئەگیراو لێی ئەهاتە جواب وەکو ئەوەی جارێکیان حاجی کەوتەوە گلەیی و پرتەو ئەویش گوتی:

" پیاوەکە ئەم بۆڵە بۆڵەت لە چییە؟ کچ هەر ئەبێت شوبکات، بێستونیش تا بڵێی کوڕێکی باشەو لە بنەماڵەیەکی ناودار و بەحورمەتیشە وئەوە چەند ساڵیشە ڕەفیقی کوڕەکانە لە چاکەو پیاوەتیان زیاترت لێ نەدیوە؟ ئیتر چیتە پیرەمێرد بۆچی وا ڕقت خستۆتە ژێری؟؟ لەپاشا بەدڵت نەبوو بۆ ڕازی بوویت؟ ئەوسا ئەتگوت نایدەم و ئەبڕایەوە!؟.

"بۆچی تۆ هیشتت من بیر لە مەسەلەکە بکەمەوە؟ گەنم گردی داتگرتم چونکە خۆت ئەتویست ئیشەکە جێبەجێبێت، وازت لێنەهێنام بیرێکی لێبکەمەوە پرسێک بە یەکێک بکەم؟ هەر ئەم کچەمان مابوو ئەو هەموو پەلە پەلەی بۆچیبوو، هەر بەشومان بدایە ئەماندا بە یەکێ لە شارەکەدابێ و لێمان دورنەکەوێتەوە، ئیتر ئەم چوونە لادێیە بۆچیبوو، بەوخوایە هەر باوەڕناکەم لەو لادێیە بەتەنیا هەڵبکا، ئەو کچەمان هەر فەوتان، ئەمەش هەمووی گوناهی تۆ بوو!!"

- بۆچی لادێ چییەتی وا لە تۆ بووە بە جەهەنەم؟؟ هەمووی دوێنێ بو لە لادێ بووین! هیچ هیچ بە دوری مەزانە کە دیسانەوە وەزع تێکچێتەوەو ئینجا هەموو ناچار ببن پەنا ببەنەوە بەر لادێ" مێردەکەی بە توڕەبونەوە گوتی:

- "وەزعی چی تێکچێت؟؟ هەموو شتێک بڕاوەتەوەو لە خەویشا شتیوامان بە خۆمانەوە نەدیوە، تۆ لە گوێی گادا نوستوی ئاگات لە چییە؟ برۆ سەیری بازاڕ و دوکان بکە (دنیا هەر بووە بە شامی شەریف سەیری ڕێگای بەغداکە لەبەر هاتوچۆکەری پێشمەرگەو

کـوردنه ئوتومبێـل نەشـەمەندەفەر بەرنـاکەون هەر گـوێ لە بەشـی کوردی ڕادیۆی بەغدا بگرە تێئەگەی کە چەند بە سەهوو چووی، ڕۆژ نییە دو سێ جار گۆرانی شیرین بەهارە لێنەدا!!" حەپسەخانیش لچێکی هەڵقورتاند و گوتی: " خوا بکا وابێ کێ حەزناکات؟ بەڵام بەخوا ئەم قسانە بەلای منەوە هەموو خۆ تەفرەدانو دڵی خۆ خۆشکردنە چونکە هموی دوێنێ گوتیان کە پێشمەرگەیەک چۆتە کەرکوک سەری ماڵ و منداڵی بدات کەچی لەناو بازاڕ تەقەیان لێکردووەو کوشتوویانە!! ئەی بەخێرێ ئەمە چییە؟؟"

مێـردەکەی گوتی:"ئەمـانە هەر ئەبـن، لەپـاش دوریـش نیـیە کە کوشـتنەکەی مەسەلەی دوژمنایەتی شەخسی بوبێ؟!.

حەپسەخان بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە گوتی:

"پیاوەکە تۆ ئەڵێی چی بەخوا هەمووی فیتی حکومەتە! ئەو لە ژێرەوە سەگ و گورگ و جاشـەکانی هـان ئەدا کە ئەم چەشـنە کـارانە بـکەن، وەکـو ئەڵـێن ئەو پێشـمەرگەیەی کوژراویشــە هەتـا بڵێـی کـوڕێکی مەردو ئـازاو بەجەرگیشـە، ئەمنەکان زۆر ڕقیان لێی بووە چونکە وەختی خۆی یەک دوانێکی لێفراندوون بە یارمەتی پێشمەرگەی شـار" حـاجی ئەگەرچـی ئەم خەبەرە مەترسـی خسـتبووە دڵیەوەو بە نیشانەیەکی خراپی دائەنا، بەڵام هەر نەئەهـات کە دانی پیا بنێت و وەک حەپسەخان بە فیتی حکومەتی دانێت و ئەییست وای پیشان بدا کە وەزع باشــە و بەرەو باشــتریش ئەڕوا، ئەم جــۆرە ئــاژاوە نــانەوەیە دوژمنــانی ڕێکەوتـنەکە ئەینێـنەوە بـۆ تێکـدانی و هەڵگیرسـاندنەوەی ئـاگری شـەڕ، کە بە قازانجی خۆیان ئەزانن!.

٣٤

چەنـد مـانگێ بەسـەر دەرچـونی بەیـانەکەدا تێـپەڕی و هەنـدێ لە مادەکـانی جێبەجێکـران، بەڵام ئەوانەیـان نەبـوون کە بەلای کـوردەوە جێبەجێکردنیـان بە نیشانەی سەرکەوتنی خەبات و شۆڕشەکەی دائەنرا، هەر بەڕاستی حکومەت لە جێبەجێکردنـی ئەو مـادانەدا نەک هەر سسـتی ئەنواند، بگرە قۆرتـو تەگەرەشـی ئەهێنـایە ڕێـگەی. پـارتیش هەرچەنـدە لە سـەرەتاوە زۆر سـەری کـردە سـەر کاربەدەستنای حکومەت بۆ بەجێهێنـانی گشت مادەکانی ڕێکەوتنەکە بەڵام کە

دی لەوە ناجێت هیچ لەسەر بڕیاری خۆیان مابن و هەر دەستی دەستی و ئەمڕۆ و سبەینێیان پێدەکەن، نەختێ خاوی کردەوەو زۆربەی چالاکی خۆی ئاڕاستەی خۆ ڕێکخستنەوەو زەخیرە کۆکردنەوەو کەلێن و کەمی پڕکردنەوەی هێزەکانی کرد. جگە لەمانەش لەم ماوەیەدا پێشمەرگە پشوویەکی باشیداو بەپێچەوانەی هیواداری دامو دەزگای حکومەت نەک هەر کەمیان نەکرد پەرەشیان سەند و ورەشیان بەرزترە بوەوە.

سەرباری ئەو ئەرکە گرنگانەی کەوتبوە سەر شانی پارتی و بەشی هەرە زۆریشیان ئەوەبوو بەدزییەوە بکرێت ئەو کارو بارە ڕەواو ناڕەوایانە بوو کە وا خەڵکەکە داوای جێبەجێکردنیان لێئەکرد، بارەگاکانیان لە سەرای حکومەت هاتوچۆکەریان زۆرەت بوو: یەکێک ئەهات ئەیگوت: "خانوەکە ڕووخاوە بۆم چاکەنەوە"، ئەویتر ئەهات ئەیگوت: "کوڕەکەم لە صنفی شەش ماوەتەوە بۆم دامەزرێنن" لەپڕ زەلامێک ئەیکرد بەژوراو بەدەم (ئەلحەمدولیلا یاڕەبی صەد شکور)ەوە ئارەقەی ئەسڕی و بۆی دائەنیشت و لنگی ئەنایە سەر لنگ و ئەیگوت: "ئۆخەی ئیتر شکور ڕۆژی خۆامانەدەی بەقوربانتانبم، کوڕەکەم لە پارەوە (سانەوی) تەواوکردووە زۆریش حەز لە دکتۆری ئەکا، وا بکەن لە مەکتەبی دکتۆری قبوڵی بکەن" هی وا هەبوو ئەیگوت دەمێکە داوای کچی فڵان ئەکەم نامدەنێ ئەبێ پێیان بڵێن کە بمدەنێ، یا ژنێک ئەهات ئەیگوت من برام پێشمەرگە بوەو شەهید کراوە، مێردەکەم زۆر لەگەڵم خراپەو هەرچەندە ئەکەم لەگەڵی هەڵناکەم بکەنە سەری هەڕەشەی لێبکەن با (تەڵاقم بدا) ڕۆژ نەبو بە صەدان ئەم چەشنە داخوازییانە لە بارەگای پارتی نەکرێت. ئەمە جگە لە هەزاران داوای زەرەر و زیان بژارن نەک هەر لە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە بەڕاستی لە شۆڕشدا زەرەریان لێکەوتبوو بگرە لەلایەن ئەوانەشەوە کە لە شۆڕشدا نەبوون یان هەر دژیشی بوون، بەگشتی لە سەقاڵییە ناخۆش و داخوازییانەی کە جێبەجێکردنیان بە گشتی لەوەدا نەبوو، ڕۆژ نەبوو هەریەکە لە بارەگای پارتی بە دەیان دەنگ و باسی ڕاپۆرتی جۆراو جۆتی بۆ نەیەت، کە لە کوێ چی قەوماوە و کێ چی کردووەو کێ خەریکی چییەو چۆن هەندێ کەسی هەڵمەتە کاسە، تەنانەت هەندێ کەسی ئەندام و یا سەر بە حیزبیش کەوتونەتە ڕاو ڕووت، بەڕاست و چەپا لێی ئەدەن و خەریکی پارە کۆکردنەوەو

ئاڵتون کڕین و خانوپێکەوە نان و فەرش و قاڵی کەڵەکە کردنن! حیزبیش وەک ڕێکخراوێکــی نیشــتیمانی لە دەروونــی خەڵــکەوە هەڵقــوڵاو زۆر دڵســۆزانەو بەوپەڕی توانەیەوە تێئەکۆشا بۆ جێبەجێکردنی داخواییە ڕەواکانی خەڵک، زۆر بە توندیش ئەچوو بەگژ ئەو کەسانەدا کە هەلی ڕێکەوتنەکەیان بەکار ئەهێنا بۆ دەستکەوتنی شەخسـی خۆیـان کە هەردولای ئەم سیاسـەتەی زۆر جـار ئەبـوو بەهـۆی تەڕەکردنـی کاربەدەسـتانی حکومەتبەســەرزاری دەستخسـتنە فرمـانی خۆیان و لە دڵیشا بە تەقەلای بەرگری پێهاتنی ئامانجە پیسـەکانی خۆیانیـان دا ئەنا. لەگەڵ ئەو هەموو تەقەلا دڵسۆزانەیەی پارتیشـا چونکە گەلیَ لە داخـوازییە شەخسییەکانی خەڵکەکەی ئەوەندە بیَ ڕاو جیَ بوون نەیتوانی هەموویـان ڕازی بکات، لەبەر ئەوە زۆرکەس کەوتنە بۆڵە بۆڵ و تیر و توانج و قسەی ناشـرین و پەیاتا پەیتاش ڕاپۆرت لە لقەکانی پارتییەوە ئەهات، بۆ کۆمیتەی ناوەندی کەوا زۆری ئەم پەنگ و باوو قسانە بەفیتی حکومەت ئەکرێن و جاسوسـەکانی ئەوی بڵاویـــئەکەنەوەو ئەم جـــۆرە کـــارانەش وەک جێخۆشـــکردن وایە بـــۆ هەڵگیرسـاندنەوەی شـەڕ بلە هەلـو مەرجێکا بە باشـی ئەزانـیَ بـۆ خـۆی پـارتی لەسەر ناڕاستی حکومەت گولیَ بەڵگەی لەمە زلتری هەبوو بەڵام گوێی خۆی لێخەفاندبوو هەر خەریکی خۆ کۆکردنەوەو تفاق و ئازوقە کۆمەڵکردن چەکی باش زۆر پەیداکردن بوو. ئەندام و دۆستە دڵسۆزەکانیشـی لە دامـو دەزگاکـانی حکومەتیدا هەر چاوێکیان کردبوو بە چوار هەر گوێیەک بە دە بۆ ئەوەی پـارتی لە پـیلانە نهێنییەکـانی میـری ئاگـادار بـکەن، نەک هەر ئەمە هەنـدیَ جـار کە ڕوداوێکی بچـوک ئەقەومـا ئەگەرچـی دەسـتی حکومەتیشـی تێدا بە خوێنـاوی دەربکەوتـایە پـارتی بەر لەو بـڵاوی ئەکـردەوە کە ئەم چەشـنە کـردارە خراپـانە خەڵکـی نـاحەز ئەیـکەن، نیازیشــی لەمە ئەوەبـوو کە حکـومەتبە گێـل و گەوج بێخەبەریـان بزانێت تـا بتـوانن ئەوپەڕی کەڵک لەو وەختە وەربگرن و تۆمەتی شـەڕ هەڵگیرسـاندنەوە لە خـۆی دوربـخەنەوە بـۆ بڕینـی قسـەی حیـزبە عەرەبە دیموکراتییەکان. بەم جۆرە ساڵێک و چەند مانگێک بەسەر ڕێکەوتنەکەدا تێپەڕی و وەزع هەتا ئەهات بەرەو خراپتر ئەچوخەڵکەکە بە تەواوی ناهومێد بوبون لە ڕێکەوتنەکە چونکە هێشتا بەشی زۆری مادە بە ئەهمییەتەکانی هەر وەکو خۆی مـابوەوە وەکـو ئەڵـێن (هەر نوسـین بـوو لەسـەر کـاغەز) بەڵام وادیـار بـوو

حکـومەت هێشـتا هەر درۆ و دەلەسـەی بەدەسـتەوە مـابوو، بـۆیە داوای کـرد هەمدیسـان وەفـدێ کـورد بچێـتەوە بـۆ بەغـدا گـوایە بـۆ چارەسـەرکردنی ئەو کێشەو بەرەیە کە بووە هۆی نارەزایی هەردولاو ئامادەیی خۆی پیشـان دابـوو بۆ جێبەجێکردنی گشت بەندەکانی ڕێکەوتنامەکە، پارتیش ئەگەرچی ئەشـیزانی درۆ ئەکا بەلام زۆربەیان بۆ زۆرتـر ڕیسـواکردن، بڕیاریـان لەسـەر ئەوەدا کەوا ئەمجارەش وەفد بنێرن. ئەوانیکەیان ئەنگوت: "بەخوا حەق نییە ئەوەنـدە خۆمـان گێـل و گـوێڕایەڵ پیشـان بـدەین، بەسـە، پێویسـتە ئەم هـاتوچۆیە دوایـی بێـت، وەفدییان بۆچییە، داخوازییەکانی کورد ئەوەندە گوتراوە نەتەوە ئەگەر خۆیـان کەڕ نەکەن ئەبـوو لەبەرکەن، خـۆ ئەگەر واش نەبـێ ئەوا کـورتەی داخوازییەکانمانیـان لەبەر دەسـتایە، یـان هەر بەنـدەکانی ڕێکەوتـنەکە کە هەر خۆیـان لە ئێسـتگەکەیانەوە بلاویـان کـردەوە، ئێسـتەش بەڵێنـی جێبەجێکردنیمـان ئەدەنێ با ئەوە بکەن ئیتر ئەم ماڵە باج باجێنەییەی بۆ چییە؟ ئەوەنـدە هـاتین و چووین ئابڕوومان چوو لای خەڵکی"

هەفتەیەک بەسەر ڕۆیینی وەفدەکە نەڕۆیشتبوو پارتی هەندێ دەنگ و باسی پڕ تـرس و ناخۆشـی بـۆ هـات لالەیەکەوە گوترا کەوا چەنـد کەسـێک لە ئەنـدامانی وەفـدەکە گیـراون و هەندێکیشـیان کەس نازانێـت چییـان بەسـەر هـاتووە، یەکـێ ئەڵێ خۆیان شاردۆتەوە، یەکێکی تر ئەڵێت حکومەت سـەرەونگومی کـردوون، لە لایەکی ترەوە خەبەرێ دێ کەوا حکومەت لە سلێمانی و هەولێر ئیجازەی زابت و عەسکەرەکانی ڕاگرتووەو داوای لە ئیجازەدارەکـان کـردووە کەوا بە زوتـرین کـات بگەڕێـنەوە شـوێنەکانی خۆیـان و بەمەدا وادیـارە هێرشـێکی ناکـاوی بەدەستەوەیە، ئەم دەنگ و باسانە بە ڕاست و درۆیـانەوە سـەرکردایەتی پـارتی وریاتر کردەوە بەتایبەت کە سێکەس لە ئەندامانی وەفداکە خۆیـان گەیاندبوەوە کوردستان و لە نیازی پیسـی حکومەت و پیلانە دوژمنانەکانی بەرامبەر کورد هەرچییەکیان زانیبوو پێیان گوتبوون تەنیا خەبەرێکی خۆش کە پێیان بـوو ئەوە بوو کەوا ئەندامانی وەفداکە کەسیان نەگیراون و هەمـوو بە سـەلامەتی لا داوی حکومەت ڕزگاریان بووە.

حکەمەت لە پێشا پیلانەکەی خۆی زۆڵانە دەسـتپێکرد، چـوو جاشـە کوردەکانی ناردە نزیک ئەو شوێنانەی کە بەدەست پێشمەرگەوە بوون و ئەمە بوو بە هـۆی

هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕ لە نێوان پێشمەرگەو جاشەکاندا کە حکومەتیش ئەمەی زۆر پێخۆشبوو، وە هەر بەو ئامانجەش جاشەکانی ناردبوو بۆ ئەو ناوچانە، چونکە لەو شەڕانەدا ئەو هیچی لەکیس نەئەچوو، لە هەر لایەک بکوژرایە لە کورد کەم ئەبوەوە.
کە سەرکردایەتی حیزب ئەم کردەوە دوژمنانانەیەی حکومەتی دی، هەر بە شکاندن و ڕامالین و ڕاونانی جاشەکانەوە نەوەستا، کەوتە پەلامارادانی (ڕەبیە)کانی میریش و دەوروبەری خۆی بەتەواوی پاک کردنەوە، ئامادەو چەک بەدەست دلێرانە وەستا بۆ پاراستنی ئەرزو کەژ و کێوە خۆشەویستەکەی کوردستان.
دیسناەوە ماڵی حەپسەخان و خوشکی جموجۆڵیان پێکەوتەوە، کوڕەکانیان هەر زوو ڕۆیشتبوون، سەبری و نەوبەهاریش داوی ڕۆینی کوڕەکانیان بە هەفتەیەک چوونە لایان.
ئامە خان و خوشکی کەوتنە دڵە کوتێ دڵە خورپێ چونکە جگە لە ناخۆشبون و شێوانی ماڵ و حەڵەکانیان سەبارەت بە دورکەوتنەوەی خۆشەویستەکانیان هەر ڕۆژەش لە شارەکەدا شتێکی تازە ئەقەوما و حکومەت بە جۆرێکی نائاسایی کەوتبووە ماڵان پشکنین و خەڵک گرتن بە بەهانەو بیانوی ناڕەواو درۆ، نەک هەر مەئموراتی کورد بگرە پۆلیسە کوردەکانی شارەکەش، پرش و بڵاو کرانەوە بە شارەکانی جەنووبی عێراقدا وە یان بێسەر و شوێن کران، وەکو ئەیانبیست حکومەت نەک هەر لە سلێمانی لە هەموو شارەکانی کەی کوردستانا ئەم سیاسەتە دوژمنانەیەی پەیڕەوی ئەکرد، وەک و گورگی هار پیاوەکانی بەرببونە گیانی خەڵکی بێتاوانی کوردستان.

لەو ڕۆژانەدا ئێوارەیەک حاجی مەجید بە شپرزەیی و ڕەنگ هەڵبزڕکاوی گەڕایەوە ماڵێ، ژنەکەی کە بام حاڵە چاوی پێکەوت کێشای بە خۆیاو گوتی: "ئەیەڕۆ باوکی عەلی ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟ ئای قوڕ بەسەرم، دوور لە سەری مناڵەکان، بەخوا ئەبێ خەبەرێکی خراپت بیستبێ!. تخوا پێم بڵێ چی قەوماوە؟"

حاجی کە دی ژنەکەی چەند شڵەژاوەو تێکچووە ویستی تۆزێک دان بە خۆیا بگرێ تا ئەو تۆزێک دێتەوە سەر خۆی، بۆیە بە زەردەخەنەیەکی وەک هی مردوو گوتی: "جارێ ڕاوەستە خۆت شێت مەکە، هیچ نەقەوماوە، ماوەم بەرێ جارێ با هەناسەیەک بدەم. بەوخوایەکەمە مناڵەکان هەموو سەلامەتن لە کەیفان! ئینجا خۆی بەردفایەوە سەر یەکەم کوردی کە توشی هات و لەسەر خۆ دەسڕەکەی دەرهێناو دەمو چاوی خۆی سڕی و حەپسەخانیش چاوی زەق بوو بوو، بە پەرۆشەوە لێی نزیک بووەوە و گوتی:

- "کەواتە دە پێم بڵێ چیبووە؟" مێردەکەی هەناسەیەکی قوڵی وەرگرت و دەستێکی بە دەمو چاویدا هێناو گوتی: "ئێستاتا کە لە مزگەت هاتمە دەرێ لە ڕێگا بەدەم ڕۆییینەوە لەگەڵ عەلی ئەفەنی قسەمان ئەکرد، باسی ئەوەی بۆ ئەکردم کە کاغەزی لە کوڕەکەیەوە بۆ هاتوەو شکور چاکەو نوسیویە، کەوا ڕۆژی جومعە چووە بۆ لای حسین و کوڕەکان، هەموویانی دیوەو شکور زۆر چاکن. ئێمە لەم قسانەدا بووین لەپڕ لەبەر کۆڵانەکەی ماڵی حاجی برام (جیبێکی عەسکەری)و عەسکەرێکی زۆرمان چاوپێکەوت سەر جامانەیەکیشم لەناو جیبەکەدا چاوپێکەوت و زۆر لەو ئەچوو، هەر خۆشی بوو! تۆفە نەیهێشت بچم بزانم چییە، عەلییە فەنیش قۆڵی ڕاکێشام، خۆشی زۆر ترسابوو چونکە ئیمڕۆ لەبازاڕ دەنگ بڵاو ببوەوە کە کەسوکاری پێشمەرگە ئەگرن، بە تایبەتی باوکیان" حاجی جارێکیکە ئارەقەکەی سەروچاوی سڕی و گوتی: "وا تۆفە چووە دەرەوە دوور سەیرکات بزانێ چیبووە".

حەپسەخان لە پەنا کورسی مێردەکەیا خۆی گرمۆڵەکرد، ڕەنگی سپی هەڵگەڕاو، دەمو لێوی وشک، کێشای بە خۆیاو گوتی:

- "ئەی هاوار! بەخوا ئێستە کاک حاجی هەر ئەکوژن! دایە پرمەی گریان و بەدەم هەنسکەوە گوتی: "خوشکە قورپبەسەرەکەشم هەر تەواو بووە، شــــیو لە دەرەوە کە چــــاوی بە عەســــکەر ئەکەوێ کە بەرێــــگەدا ئەرۆنرۆحـی ئەچـێ و ئەڵـێ ئـاخۆ ئێسـتا ئەمـانە ئەچـن کـێ بگـرن و قورپبەسەر کێدا بکەن!؟ ئینجا وەرە چوبنە ماڵی خۆی و مێردەکەشیان بەبەرچاوی خۆیەوە گرتبێت!!"

ئەوەنـدەی پێنەچـو ڕونـاک بە جلـی جـوانەوە کـردی بە مـاڵا، سـوورە سـووری ڕومەتی بوو، پشتێنەکەی نیشانەی بەستبوو هەر لە خۆی ئەهات، ئەو ئێسکە سووک و سەر و پرچ و قەد و باڵایەی خەڵک هەر حەزی ئەکرد سەیری کات.
ڕوناک کە دایک و باوکی چاوپێکەوت وا ڕەنگ پەڕیون، کش و مات دانیشتوون، دڵی داخورپاو چووە لایانەوەو گوتی:

- "تخـوا بـابە گیـان ئەوە چیتـانە بـۆ وا مـاتن؟؟" دایکیشـی بە چـاوی فرمێسکاوییەوە بە مەلوولی باسەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش حەپەساو سست بوو لەپاشا بە ماتییەکەوە گوتی:
- "وەڵا دایکە لە ماڵە شاییەکەش ژنان باسیان ئەکرد، کەوا دوێنـێ شـەو چــوونەتە ســەر مــاڵێ، کە گــوایە کــوڕی پێشــمەرگەیە، باوکەکەیــان گرتـووەو بردویـانەو هەتـا ئێسـتەش نـازانن چیبەسـەر هـاتووە" حـاجی هەستایە سەرپێ و هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: ئەوەتە! قسـە بە درۆ ناگوترێت!" سـەری بـاداو گـوتی: "بێـدینن بێناموسـن، هەمـوو شـتێکیان لەسەدت دێت، یەکێ کە لە خوا نەترسا لە کەس ناترسێ"

ڕونـاک بەپەلە چـوو جلەکـانی داکەنـد و دوعایەکیشـی لە خـۆی کـرد کە بـۆچی چـوو بـۆ ئەو شـاییە، دایـک و بـاوک و مـام و پوریشـی لەو حـاڵەدابن، لە داخانـا جلەکـانی هەروا تـوڕدا بە ژورەکەدا و بەشـپرزەیی شـتێکی لەبەر کـردو هـات لە تەنیشت دایکییەوە دانیشت، بەڵام هەر گورج ڕاست بوەوەو چوو بۆ لای بـاوکی و کەوتە بەدەورا هـاتنی و لێـی ئەپرسـی کەوا چـی ئەخـۆن و چییـان بـۆ بکـات؟ چیان بۆ لێنێت؟ باوکیشی لەبەر دڵی ئەو گوتی: "باشە گیانە چایەکمان بۆ لێنێ" ڕونـاک خەریکـی چـا لێنـان بـوو کە دەنگـی دەرگـا و گـرمەی تـۆفە هەموویـانی ڕاپەڕاند، ڕووناک و دایکی بە پەلە چوون بە دەنگیەوە، سـەیریان کرد وا تۆفە

کاکە حاجی و ئامە خانی پێشخۆی داوەو هەژدە هەژدە قسەی زل ئەکات، ڕوناک پەلاماری مامی داو ئامەخان دەستی کردە ملی خوشکی و گوتی:

- "وای ڕۆحم دەرچێت ئاخۆ چەند ترسابیت!!"

هاتنە ژورەوەو حاجی مەجید بە دڵێکی خۆشەوە سەیری براکەی کرد و گوتی: "بەخوا هەر بەتەمات نەمابووم، گوتم تازە جارێکیتر هەر ناتبینمەوە؟ ئەرێ بەڕاست ئەوە چی بوو؟"

- "ئەزانی کاکە ئەو کەسە کێ بوو کە تۆ بە منت زانیبوو؟ ئەوە کاکە مەلای دراوسێمان بوو، قوڕبەسەرە هاتنە سەری و کەلەپچەیان کردو بردیانچونکە گوایە بەکری کوڕی موعەلیمەو چوار ڕۆژە نەچووە دەرس بڵێتەوە، ئێستە ئەیانەوێ بزانن بۆ کوێ چووە" حاجی مەجید دەستی دا بەیەکاو گوتی:

- "لا حەولە وەلا قوەتە ئەلـلا بـیللا! دە تخـوا ئەمە ویـژدان و دیـنە؟" سەرێکی هەڵبڕی و گوتی:"خوایە ئەم زوڵمە قبوڵ نەکەیت و ئەمانیش سەرەو ژێر کەو هەقی ئەم خەڵکە بێگوناهەیان لێ بسەنیت!!"

- تۆفە جگەرەیەکی خستە نێو لێوانی *دەستی بەرد بۆ گیرفانەکانی بۆ شخارتە ئەگەڕا)، دیاربوو نەیدۆزییەوە لەبەر خۆیەوە گوتی: ڕەنگە لە شـپرزەییدا لـێم کەوتبێـت، جـگەرەکەی لە دەمـی دەرهێنـاو گرتـی بە دەستییەوەو ڕووی کردە حاجی مەجید و ئەوان و گوتی: ئێوە هەر بە قسەی من مەکەن هەفتە زیترە من ئەڵێم بکەونە خۆتان، بێناموسی حکومەت بگاتە ئەوەی پیرێژنێکی قوڕبەسەی بەسەزمانی وەک باجی پیرۆزی نانکەر بگرێت، ئیتر بەتەمای چی دانیشتوون؟ ڕەنگە بتانەوێت ژیانی ناو زیندانەکان تاقیبکەنەوە؟؟!! بە فیزێکەوە تەماشای هەموویانی کردو جارێکی تریش دەستی برد بۆ گیرفانەکانی و ئینجا هەستایە سەرپێ و کەوتە پشکنینی گیرفانە قوڵەکانی شەڕواڵەکەی جگەرەکەشی خستەوە بەینی لێوانی و بە دەمی نیوە نوقاوەوە باسەکەی باجی پیرۆزی تەواوکرد، بەم چەشنە ئەڵێن گوایە باجی پیرۆز ئەو ڕۆژە لە تەعزێی پیاوێکی خزمیانا دڵی گەرم بوەو زۆر دوعای لە زاڵم و زۆرداران کردووەو جنێوی بە حکومەت داوە..

ئامەخان گوتی: ئۆهـ ئاگریان تێبەربێت، ئینجا ئەوان کوا لەوێبوون تاکو گوێیان لە دوعاو جنێوی باجی پیرۆز بوبێ؟

تۆفە هەڵیداو گوتی: تۆ ئەڵێیت چی ئامە خان بەخوا خانمی وا هەیە جاسوسییان بۆ ئەکاتئەوەنە بە دیمەس سالار و بە حورمەت خۆیان ئەنوێننخەڵک شەرمیان لێئەکەن! ئەرێ بەخوا بە هی وا دەنگ و باسیان ئەگەیەنرێتێ کە بە قسە هەمووتان ئەخاتە کونەوە (سەرێکی ڕاوەشان و نەختێک دەنگی نزم کردەوەو گوتی: کوڕە بەخوا نەک تەنیا هەر جاسوس بگرە هەموو شتێکیانن! ئینجا ئێوە باوەڕ ئەکەن یان نایکەن ئارەزووی خۆتانە.

دوای ئەو ڕوداوەوەش پەیتا پەیتام هەر خەڵک ئەگیران و ڕوداوی ناخۆش ناخۆش ئەقەومان، لەم ماوەیەدا ماڵی حەپسەخان و خوشکی هەر خەریکی خۆکۆکردنەوە بوون، ئەوی ئەمجارە لە هەموان زیتر پەلەی بوو حاجی مەجید بووم هەر بۆڵە بۆڵی بەسەر حەپسەخان ئەکردو ئەیگوت: ماڵت بەقوڕ نەگیرێ ئەوە تۆ چی ئەکەی دە زووکە، ڕزگارمانکە ئیشەڵا ئەمانکەی بە قوربانی فەرش و نوێن و مەنجەڵ و قاپ و قاچاخ!! چی بوو ئەمە ماڵ کۆکردنەوەی تۆ هەر دوایی نەهات؟ کەس لە شارا نەما!"

حەپسەخانیش ئەوەندە مانوو بوو بەدەس ماڵ پێچانەوەو کەل و پەل شاردنەوەو شتومەک بەسەر خزم و قەوم و قیلەدا دابەشکردندا بۆیان هەڵگرتن و مشوری بە دزییەوە ناردنی ئەو شتانەو ترسی ئەوەشی کە ئەمنو عەسکەر لە ناکاو بدەن بەسەریانا کە گوێی لە بۆڵە بۆڵی مێردەکەی ئەبوو ئەوەندە ڕقی هەڵئەساو توڕە ئەبوو، لەوانەبوو دەست بنێتە بینی، ئەوەی حاجی مەجیدی زیاتر تەنگەتاو کردبو براکەی بوو، کەوا ئامە خانی ژنی هەر زو ماڵی پێچابوەوە و دانیشتبوون هەتا حەپسەخان ماڵی خۆی کۆئەکاتەوەو جاروبار لای مێردەکەی گلەیی لە خوشکی ئەکرد کەوا: "بێقەزابێ بزۆر بەتەنگ شتەکانییەوەیە بە پێچانەوەی چینییەکەوە نیو سەعات خەریک ئەبێت، ئینجا ئەیکاتەوە ئەڵێت بەخوا ئەترسم بشکێت و جارێکیتر بە جۆرێکیتر ئەیپێچێتەوە خۆ ناشیەڵێت کەس یارمەتی بدات چونکە پێچانەوەو شت کۆکردنەوەکانی ئەو ئەبێ کلکی وابێت و شاخی وابێت و کەسیش تاقەتی ئەوەی نییە.

هەندێ جار کاکە حاجی ئەگەیشتە تینی هەندێ لەم گلەییە هەقانەی ژنەکەی بە نەختێک دەستکارییەوە بە حاجی مەجید ئەگوت، ئەویش گڕی تێبەر ئەبوو و ئەچو بەگژ ژنەکەیا، لەسەر ئەو سستی و دەستە پاچەییەی نیاشانی ئەدا.
کە کاکە حاجی تێگەیشت گلەیی کردن لەلای براکەی ئەبێ بە شەڕ و هەرا کە بەمەش خۆ کۆکردنەوەو ڕۆیشتنیان زیاتر دوا ئەکەوێت، کەوتە ئەوەی بەرپەرچی قسەکانی ژنەکەی خۆی بداتەوەو دەمکوتی کات بەوەی کە بکەوێتە سەرزەنشتی، وەکو ئەوەی پێی ئەگوت، خوشکت ژنێکی کارامەو ڕێک و پێکە نرخی شت ئەزانێت، خۆ وەکو تۆ نییە بە ڕۆژێک هەموو شتەکانی ماڵەکەت دا بەسەر یەکاو گوتت ئیترتەواو لێبوومەوە! تۆش ئەوەندەی ئەو کەلو پەل و ناوماڵت هەیە، کەچی سەیری ماڵی خۆتکەو سەیری ماڵی ئەویشکە، ئینجا ئەم کارەی کاکە حاجی هەرچەند شەڕیێ لە ماڵی حاجی مەجیدی برای لا ئەدا، بەڵام ئەیهێنایە ماڵەکەی خۆیەوە، بەڵام چونکە ژنەکەی ئەم زۆر ساویلکەو دڵپاک بوو، هەر زو دەمەقاڵێ و شەڕەکەی لەبیر ئەچووەوەو هەر ئەوەی لەبیر ئەمایەوە کە تا زووە خۆیان دەربازکەن و لەم ئاگرە بۆی دەرچن.
ماڵی حەپسەخان و خوشکی لە جاری پێشوەوە فێر بوبون ئەیانزانی کە چی بۆ شاخ دەست ئەداو چ شتێکیان بە کەڵک دێت بۆیە بە جۆرێکی وا شارەزایانەو خۆیان ئامادە کرد کە لەوێ لەسەر هیچ کەل و پەلێ پەکیان نەکەوێت، ئەوەندەی بۆشیان کرا ئەو ئازوقانەیان لەگەڵ خۆیان برد کە ئەیانزانی لە شاخ بە ئاسانی دەست ناکەون.
بێستوون هەر زوو ماڵی بۆ ئامادەکردبوون، لە خۆشیانا جێی بە خۆی نەئەگرت کەوا ڕوناک دێتەوەو ئەمجارە دەسگیرانییەتی ترس ولەرز و شەرمی ناوێت هەرچییەکیان بۆ بکا هەقی خۆیەتی.
لەگەڵ باوکی و چەند خزمێکیشی چوون بە پیریانەوە تا گەیاندیانە ماڵەکەیان، کوڕ و کچەکان یەکجار دڵیان خۆشبوو دایک و باوکیان ئالان لێیان و کۆبونەوەو لە دەوریان کۆمەڵبوون، دوای حەسانەوەو پشودان حاجیمەجید هەستایە سەرپێ، جامانەکەی داگرت و قۆڵی هەڵماڵی کە بچێ دەستنوێژ بشوا، هاتە دەرێ لە ژورەکە و لە هەیوانەکە ڕاوەستاو سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کردو چاوێکی بڕییە ئەو دیمەنە جوانەی کە لێوەی دیار بوو تەماشایەکی پڕ

ئـارەزوی ئەو کێـوە بەرزە دڵگیـرەی کـرد کە بەرامـبەر بە هەیـوانەکە بـوو، بە عاسـتەم تیشـکی ڕۆژ بەسـەر لـوتکەکەیەوە مـابوو، هەسـتی بە سـەربەرزی و سەربەستی و دڵنیاییەکی تەواوکرد، و بەچاوێکی پڕ فرمێسکەوە سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان و گوتی: "خوا لێت بەزیا بێت... خۆیە تۆ گەورەیت خۆت ئەو ئەرز و شاخانەمان لێ نەسێنی و هێز و توانـای ئەوەمـان بـدەرێ کە بە گیـان و سـەر و ماڵی خۆمـان بپـارێزینلە داگیرکەر و لە زۆردار" خـۆی دانەوانـدەوەو ئەرزەکەی ماچکرد و گوتی: "یاخوا هەر ئەوەدان بی کوردسـتان بـۆ خـۆت و شـاخ و داخ و ئەشکەوت و چەم و کانیاوت!"

حەپسەخانیش کە لە دورەوە چاوی لە مێردەکەی بوو زەردەخەنەیەکی گرت و لەبەر خۆیەوە گوتی:

- ئەمە دێهـاتەکەیە کە حەو شـەو و حەوت ڕۆژ شـەڕت لەگەڵ کـردم، کە بۆچی کچەکەمانم پێدایت بە بێستونی لادێی و ئەو منـاڵە چۆن لەم کەژ و کێوە هەڵئەکات؟ بزانە ئـاخری قسـەکەی مـن چـۆن هـاتە دی و چۆن کە لێتان قەوما پەناتان هێنا بۆ لادێ و بۆ ئەم شـاخە بەرزانە!" حەپسـە بەدەم ئەم بیـر و قسـانەوە، دڵخـۆش و سـەرکەوتو هـاتە لای حـاجی مێردییەوەو گوتی:
- " ها ئەبینی ئێرە چەند خۆش و دڵگیرە، ئینسـان تیایا لە خـوا نەبێت لە کەس ناترسێت، دەک بە قوربانی دار و بەردی بم!"

**گەلاوێژ**

**لەندەن ١٩٨٦/٢/٢**